## ناوەرۆك

## پێشەکی بۆ چاپی سێیەم

خەریکبوونەوەیەکی نوێ لەتەك بەرهەمەکەی ڕوسۆ و ئەو توێژینەوە نوێیانەدا، کە دەربارەی جیهانی هزری ئەو نووسراون، هۆیەك بوون بۆ کارکردنەوە لە نووسینەکەی چاپی دووەمدا و پەرەپێدانی. گەرچی نووسینەکە هەتا ڕادەیەکی زۆر جیهانی هزری ئەوی دیاری کردبوو، بەڵام سەرباری ئەمەش هێشتا هەندێك پرسیار هەبوون، کە ئاوەڵاکردنیان لەنێو نووسینەکەدا پتر دەرفەتی بۆ خوێنەر دەڕەخساند، کە باشتر شارەزای "ڕوسۆی هونەرمەند و هزرڤان و مرۆڤ" ببێ.

ئەم لێکۆڵینەوەیە دەربارەی "ڕوسۆ" بە سێ تێمی سەرەکی پەرە پێدراوە: "ئایینی هاووڵاتی"، کە وەك لکێکی بەشی دووەمی نووسینەکە بە ناونیشانی "کۆماری ڕوسۆ" داڕێژراوە؛ پاشان لە دوو بەشی سەربەخۆدا بە ناونیشانی "پەروەردەی سروشتی" و "ڕوسۆ و شۆڕشی فەڕەنسی"، تیۆرییە پەروەردەییەکەی ڕوسۆ و کاریگەرییە مێژوویی-جیهانییەکەی ئەو داڕێژراون یان خراونەتە ژێر دانوستاندنەوە.

بەڵام هاوکات لە ڕەوتی پێداچوونەوەی نووسینەکەی چاپی دووەمدا هەندێك دەستکاریی زمانەوانی  پێویست بوو، هەروەها هەڵەچنکردنەوەی بابەتە چاپکراوەکە. سەربارەی ئەمەیش دەمەوێ پەیوەست بە خوێنەرەوە ئەو تێڕوانینە دەربڕم، کە پێداچوونەوەی زمانەوانی بۆ خاتری ئەو نییە، بەڵکو خواستێکی سەبژێکتیڤییە، کە لە ڕەوتی ئەزموونی نووسینەوە هاتۆتە ئاراوە و ئەمەیش پرۆسەیەکی ئاوەڵابوونی هۆشەکییە، کە من نوێنەرایەتیی دەکەم. لە



لایەك شێواویی توخمیی زمانی کوردی پاڵهێزێکە بۆ ئەم خەریکبوونە، شێواوییەك کە چارەسەرێکی کاتی هێشتا نەشیاوە و ئەمەیش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە: یەکەم بۆ ئەلفوبێی ئەرەبی، کە بە کەڵکی زمانی کوردی نایەت، دووەم لاوازیی زمانەکە، کە لەبەر ئەوەی زۆر کەم هزرڤان پێی هزراوە، ئەوا لەم گۆڕانەی ئەمڕۆیدا دەرەقەتی زانستەکان نایەت (ئەمە بەتایبەتی ئەو جەنابانە دەگرێتەوە، کە بە ئەرەبی دەهزرێن و هەوڵ دەدەن بە کوردی کارێکی هۆشەکی ئەنجام بدەن)؛ بەڵام لە لایەکی پرسیاری کارکردن لە زمانی خۆییدا، واتا سەبژێکتیڤیدا، بۆ سروشتی پرۆسەی هزراندن بەو زمانە دەگەڕێتەوە و ئەمەش، بە هزری من، گونجاوترین ڕێگەیە، کە هەتا ڕادەی شیان بەرهەمی لەبارتری لێ دەکەوێتەوە.

کەواتە ئەم نووسینە ئاڕاستەی خوێنەری نەشارەزا و هۆشمامناوەندی نابێتەوە، بەڵکو ئەو خوێنەرە دەکات بە ئامانج، کە یان وەك شارەزا و هزرڤان لە خۆیەوە بە کێشە هزرییەکانەوە خەریکە، یان فێرخوازی زانکۆیە و پەیوەست بە بەشە سەرەکییەکەی خۆیەوە، کە دەشێ زانستە سیاسییەکان بێ، یان لە بەشێکی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا فێرخواز بێ و ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەی پێویستە.

پێداچوونەوەی واژە بییانییەکان، کە خۆیان دەربڕدراوی توخمیی نێو نووسینەکەن، سەرلەنوێ ئەو ڕاستییەی سەلماندەوە، کە بڕێکی فرەیان نەشیاوی وەرگێڕانن و خوێنەریش گەرەکە لەمە تێبگات. بۆ نموونە نووسەرێك لە خەریکبوونێکی کوردیدا دەتوانێ واژەی "ژیاری" بەکار بهێنێ، بەڵام ناتوانێ لە خەیکبوونێکی زانستیدا، کە لەتەك هزری ڕوسۆدا ئەنجامی دەدات، بۆ سیڤیلیزایسیۆن دایبنێ. خوێنەر دەبێ خۆی لەتەك ئەم جۆرە خەریکبوونانەدا ڕابهێنێ.

کاوە جەلال

## پێشگوتن بۆ چاپی دووەم

سـەرهەڵدانی ئـەم نووسـینە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕۆژانـی "کـۆڕەو". نووسـینەکە هاوینی ١٩٩١ بـە دوا فـۆرمی دەگـات. کاتێـك مـانگی مـارتی ١٩٩٤ لـە ئـەڵمانیاوە بـۆ سەردانی کەسانم لە سلێمانی گەڕامەوە، هەوڵم دا لـەوێ بەچـاپی بگەیـەنم. بـاری دژواری ئەو کاتە، گرفتی چاپخانەکان، هەروەها کـەمکاتیی خـۆم، وایـان کـرد، کـە تەنها ٣٠ دانە (گەر بەڕاستی لەیادم مابێ) ڕابکێشم – چاپێکی زۆر خـراپ -، کـە پێـشکەشی بیبلیۆتێکـەکانی سـلێمانی، هەنـدێك نووسـەر، هـەروەها دۆسـتان و خزمـانی کتێبخوێنـەرەوەم کـردن. بـەڵام ئـەو دەمـە زۆر زوو ڕەخنەیـەك لـە نێوەندی نووسەرانەوە سەبارەت بە "زمانی داڕێژراو"ی نووسینەکە هات. ئـەمڕۆ دەبێ ئەو جۆرە ڕەخنانـە وەك ڕەوا وەربگـرم. هـۆی ئـەو داڕشـتنەی یەکـەم نـەك تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە من ئەو دەمە فێرخوازی زانکۆ بووم و نزیکەی بە ئەڵمانی دەهـزرام، بـەڵکو هـەروەها بـۆ ئـەوەیش دەگەڕێتـەوە، کـە مـن ئـەو دەمـە بەڕەهایی لە نێوەندی ئەڵمانیدا دەژیام و هیچ پەیوەندییەکم بە کوردەکانی ئـەو وولاتە و هەندەرانەوە بەگشتی نەبوو.

ئەم چاپەی دووەمی نووسینەکە تەنها پێداچوونەوەی زمانەوانیانـە ناگرێتـە خۆ. لە هەندێك جێدا نووسینەکەم پەرە پێداوە، گلۆسارەکەم چ بە لابردنی زاراو و چ بە هێنانی زاراوی نوێ بۆ ڕوونکردنەوە گۆڕیوە.

ئـەم نووسـینە هـەتا زۆرتـرین ڕادە، لـە پـاڵ ئـەو زانیاریانـەی لـە ڕەوتـی سەمینارەکانی تایبەت بـە ڕوسۆدا پێرسـەپتم کـردوون، لـەو کەرەسـانەوە سـەری هەڵداوە، کە لە ڕەوتی ساڵانی فێربوونی زانکۆییدا بـۆ نووسـینی "کـاری دیپلـۆم" کۆم کردبوونەوە. کاری دیپلۆمەکە گەرەك بوو ناونیشانی "تێگەیـشتی ئـازادی لـە لای ژۆن-ژاك ڕوسـۆ" وەر بگـرێ. بـەڵام لەبـەر هەنـدێك هـۆی تایبـەتی وازم لـەم بابەتە هێنا، کەرەسەکانم کرد بە کوردی، کەرەسەی نوێم خستە سەریان و پاشـان لێوەیان بە خەریکگەرییەکی خۆیی ئەم کتێبە سەریهەڵدا.

لەم نووسینەدا کێشەیەکی "سیتات" خـۆی دەبینێتـەوە. لـەو جێیانـەدا، کـە نەدەشـیا سـیتاتەکان (کـە داڕشـتنی "ئەڵمانیانـە"ن بـۆ خوێنـەری ئـەڵمان) ڕاستەوخۆ بە وەرگێڕان وەربگیرێـن، لـە ڕووی زمانەوانییـەوە دامرشـتوونەتەوە و نەم خستوونەتە نێو هێمای سیتاتەوە، بەڵکو تەنها ژمارەم بۆ دانـاون. بـەڵام ئـەو ڕوونکردنەوە و داڕشتنانەی کە لە ڕەوتی خوێندنەوەدا، لە ڕەوتی بەکوردیکردنی کەرەسـەکان و کـارکردنی زمانـەوانی تێیانـدا پێرسـەپتم کـردوون، لـەنێو داڕشـتنەکاندان و بـە پێویـستم نـەزانیوە ژمـارەی تایبەتمەنـدیان بـۆ دابنـێم. سـەرباری ئەمـەیش، نووسـینەکانی ڕوسـۆ خـۆی، واتـا سەرچـاوە سـەرەکییەکان، بناغەی ئەم نووسینەن. لـە کۆتاییـدا ئـەو سەرچاوانە سـەراپا دیـاری کـراون، کـە "بەڕاستی" سوودیان لێ وەرگیراوە. بەڵام هاوکات پێویست بوو هەندێك سەرچاوە لـە بیبلیۆگرافییەکـە دەربکێـشرێن. هـۆی مانـەوەی ئـەو سەرچـاوانە لـە چـاپی یەکەمـدا بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کـە نووسـینەکە "سـەرەتا"یـەکی نزیکـەی بیـستلاپەڕەیی هـەبوو. ئـەو سـەرەتایە ڕووی دەکـردە شـێوازی هزرینـی چـەرخی نـێڤین، نوێکـاتی ئـەوروپی و ڕێنیـسانس، ڕۆشـناییەکان لـە ئینگلانـد و فەڕەنـسا. بـەڵام پـێش لەچـاپدانی کتێبەکـە بڕیـارم دا ئـەو سـەرەتایە لـە نووسـینەکە دەربکێـشم. بـەم چەشـنە ئـەو سەرچـاوانەی بـۆ ئـەو سـەرەتایە سـوودم لـێ وەرگرتبوون، لەنێو کتێبەکەدا مانەوە.

کاوە جەلال

## سەرەتا

کاریگەریی ڕوسۆ لەسەر سەردەمەکەی و قۆناغەکانی پاش خۆی لەبڕ نایەت. ئەم کاریگەرییە کانت و هێگل دەگرێتەوە، لە ئەمانیشەوە هەتا نووسەرە ڕۆمانسییەکان، پاشان پەروەردەزان و پسیکۆزان و زانایانی سیاسەت لە سەدەی بیستەمدا بڕ دەکات. بەڵام ئەم کاریگەرییە خۆی هاوکات لەسەر مارکسیزمیش دەنوێنێ: ئەنترۆپۆلۆژیی مارکسیزم لە بنەڕەتدا برێتییە لە ئەنترۆپۆلۆژییەکەی ڕوسۆ. بێگومان بەرانبەر روسۆ هاوکات چەندین هەڵوێستی جیاوازی ڕەخنەیی خۆیان دەبیننەوە: ڕوسۆ بۆ هەندێك ڕەخنەگر هەڵگیرسێنەری شۆڕشی خوێناوییە، برێتییە لە ڕێخۆشکەری بۆلشەڤیزم و فاشیزم؛ ڕوسۆ بۆ هەندێك ڕەخنەگری دی برێتیە لە ڕابەرێکی تاکگەرایی، یان بۆ هەندێکی دی ڕابەرێکی سۆسیالیزمی دەوڵەتییە. سەرباری ئەم هەڵوێستە جیاوازانە سەبارەت بە روسۆ دەبێ جەختی لەو هەقیقەتە بکەین، کە ئێمە ناتوانین ئەو وەك ،،مرۆڤ،، و ،،زانا،، بە مەبەستی گەیشتن بە بڕیارێکی دیاریکەر بخەینە ژێر توێژینەوەوە، چونکە ڕوسۆ بە واتای هونەرمەند، فەیلەسوف، پەروەردەزان، پسیکۆزان، زانای سیاسەت، ڕەخنەگری کۆمەڵایەتی، لێتوێژەری ڕووەك، ئاوازدانەر و نووسەری موزیك.

ئێرنست کاسیرەر ئەو ڕوانگەیەی سەبارەت بە ڕوسۆ هەیە، کە کەسایەتی و جیهانی هزری ئەو تەنها لەنێو هەقیقەتە ئاسانەکەیاندا شیاوی ڕوونکردنەوەن؛ زانیننوماکەی ڕوسۆ هێشتا هەر نەبووە بە بنەمایەکی چەسپاو، کە بەئاسانی



تۆمار بکرێ؛ گەر کەسێك لەنێو بەرهەمەکەی ڕوسۆدا قووڵ ببێتەوە و پاشان لەنێو هۆشیدا تێڕوانینێك لەسەر ڕوسۆی مرۆڤ و هزرڤان و هونەرمەند بهێنێتە ئاراوە، ئەوا یەکسەر دەبینێ، کە ئەوەی بە ،،زانیننوماکەی ڕوسۆ،، دادەنرێ، هەتا چەند لەتەك ئەو گەنجەدا دەگونجێ، کە ئەو لەکاتی قووڵبوونەوەدا هەستی پێکردووە. ([1])

ڕوسۆ بە بڕوای ئێرنست کلێزەر نزیکەی پەیامبەرێك بوو: بوومەلەرزەیەك لەژێر دەستی مرۆڤێکی لاواز و نەخۆشدا ڕووی دا. ڕوسۆ ئەو هێز و سۆزە نوێیانەی پرژاند، کە لەنێو ڕیزێك نەوەدا بەچەپاوی مابوونەوە. نووسینی "کۆنترا سۆسیال" (پەیمانی کۆمەڵایەتی) هەیکەلی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ڕماند. ڕۆمانە پەروەردەییەکەی بە ناونیشانی "ئێمیل" کایە خۆمەندەکانی ژیانی لە بناغەوە گۆڕی. ڕۆمانی "ئێلویزی نوێ" ژیانی هەستیی زۆر نەوەی نوێ کردەوە، کە هەموو لەنێو خو و نەرێت و درۆی ژیاندا نقوم بوو بوون. ڕوسۆ بگۆڕ بوو لە هەست و توخمی جیهاندا، نوێنەری ژمارەیەکی زۆر ڕێباز و سۆز بوو، کە هەتا ئەمڕۆ بڕ دەکەن. ([2])

ڕوسۆ بە بڕوای ڕۆبێرت شپێمان "لێرەبوونێکی نموونەیی" بوو: ئەو ئاوها لە خۆی تێدەگەیشت و ژیانی ڕێك دەخست، بەڵام ژیانێك کە پڕ بوو لە دژبێژی. ڕوسۆ کتێبێك دەربارەی پەروەردەی منداڵ دەنووسێ، کەچی پێنج منداڵەکەی خۆی دەنێرێتە بێکەسخانە و چینی دەسەڵاتدار بەوە خەتابار دەکات، کە گوایە نانی منداڵەکانی دەدزێ. "نانی منداڵەکانی" بە واتای نانی ڕوسۆ خۆی، واتا هەقی دامەزراندنی ناوچەیەکی پەروەردەیی. پرۆگرامی پەروەردەیەکی ئازاد لەسەری گران دەکەوت. گەر ڕوسۆ نەتوانێ هەڵوێستێکی نموونەیی وەربگرێ، ئەوا خۆی لە هەموو بەرپرسیارییەك دەکێشێتەوە و خۆی وەك قوربانییەکی نموونەیی سەیر دەکات. ڕوسۆ "نابێژیی باڵا"ی دەربڕی و هەتا ئێستا هیچ

کەسێکی پێش و پاش خۆی لەو ڕادەیەدا پێی هەڵنەستاوەتەوە، بەڵام هاوکات بڕواهێنەرترین بەڵگەیە بۆ تێزەکانی نیتچە و شێلەر سەبارەت بە داهێنەربوونی ئەو کینەی کە مرۆڤ بەهۆی ژانی نێو ناخییەوە لە جیهانی هەڵدەگرێ. گەڕانەوە و لادان و هەڵاتن مۆرکی ڕوسۆ بوون: دەکەوێتە پەروەردگای کاتۆلیکییەوە، چونکە وەك شاگردێکی شازدەساڵان، دوای پیاسەکردن، لە تاریکیدا بۆ شار دەگەڕێتەوە و دەروازەی بەداخراوی دەبینێ، ئەویش چیدی ناوێری بۆ ژنێڤ بگەڕێتەوە. کاتێك ملوانکەیەك دەدزێ، تاوانەکە دەخاتە ملی ئەو کیژە کارەکەرەی، کە ڕوسۆ بەنهێنی ئەڤینداری بووە و کیژە بەدەرکردن دەدات. کاتێك لەتەك بەڕێوەبەری فێرگەی ئاوازبێژانی ئانسیدا بە سەفەرێك بۆ لیۆن دەچێ و بەڕێوەبەر لە ڕێگە تووشی کارەساتێك دەبێ، ئەوا ڕوسۆ یارمەتیی نادات، بە پێچەوانەوە، لەبریی ئەوە خۆی بەنێو قەرەباڵغیەکەدا دەکات و لەو ناوە دیار نامێنێ. (٣)

بەڵام ڕوسۆ لە سەردەمی خۆی یان درەنگتردا تەنها ئافەرین نەکراوە یان کەسایەتی و بەرهەمەکەی خرابنە ژێر ڕەخنە و توێژینەوەوە. نەخێر. ئەدەبی دژ بە ڕوسۆ لە سەردەمی ژیانیدا سەر هەڵدەدات و هاوکات لە لای زۆر کەس مایەی کین و نەفرەت بوو. گەورەترین دژکاری ڤۆلتێر بوو، کە - وەك ئەمڕۆ ڕوون بۆتەوە — لە لای قەشەکانی ژنێڤ بوختانی ئەوەی بۆ هەڵدەبەست، کە گوایە لە ئایینی دیانی داگەڕاوە. ڤۆلتێر دەیویست بەم شێوەیە بەلەناوبردنی بدات. دژکارێکی دیکەی ڕوسۆ برێتی بوو لە نووسەری ئینگلیزیی هاوچەرخی سێمول جۆنسن، کە ڕوسۆی ناو نابوو "بیچمێکی سەخیف" و گوایە شایانی ئەوەیە کە "وەك گەنجێکی سەرسەخت" لەتەك کۆمەڵەیەکی سزادراواندا ڕەوانە (نەفی) بکرێ". (٤)



بەڵام گەر بمانەوێ لە روسۆ چاکتر تێبگەین و ژیانی ئەو ڕوون بکەینەوە، ئەوا باشتر دەبێ کە ڕاستەوخۆ لە بەرهەمەکەی بپرسین، لێرەشدا بێگومان دەبێ یاسا نێوخۆییەکانی ئەو بەرهەمە ڕەچاو بکەین. بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیەش بەبێ سەرەتایەك لەسەر ژیان و کەسایەتیی ڕوسۆ ناشێ. ئەم دوو ساتە، هەر وەك کاسیرەر دەنووسێ، بەچڕی بەنێو یەکتریدا چڕژاون و هەموو هەوڵێکی جیاکردنەوەیان زەبرێکە لە "مرۆڤ" و "بەرهەم"ەکەی و دەماری ژیانی هەردووکیان دەپچڕێنێ. جیهانی هزری ڕوسۆ، جوودا لە فۆرمی لێرەبوونە کەسییەکەی ئەو، هیچ واتایەکی سەربەخۆی نابێ. (٥)

# بەشی یەکەم: ژیان و بەرهەم

١

ڕوسۆ سویسرییە، بەڵام نووسەرێکی فەڕەنسییە. ئەو دەمە کۆماری "ئازادی ژنێڤ" (بە زمانی شانازی ڕوسۆ خۆی) زۆر جیاواز بوو لە شارە-دەوڵەتێکی ئازاد و یەکسان. دانیشتوانەکەی بەسەر چینی جیاوازدا بەشکرا بوو و هەر یەکەی ئەم چینانە مافی تایبەتیی هەبوو. لە بەشی سەرەوەی ئەم پەیژە کۆمەڵایەتییەدا "سیتۆیا" و "بۆرژواکان" خۆیان دەبینییەوە و تەنها ئەندامانی ئەم خێزانانە مافی وەرگرتنی جنسیەی دەوڵەتی ژنێڤیان هەبوو. پایەگا بەرزەکانی دەوڵەت بە دەستی ئەمانەوە بوو و وەکو یاسایی، پزیشك، مامۆستا و قەشە کاریان دەکرد، یان لە بواری پیشە ڕێزدارەکانی بازرگانی و دەستیدا خەریك بوون. بەشەکەی دیکەی دانیشتوان لە بواری کەمڕێزی پیشەگەریدا کاری دەکرد. بەڵام زۆرینەی دانیشتوانی دەوڵەتی ژنێڤ لە جووتیار پێکهاتبوو و لە دەرەوەی شار دەژیا. لە



ساڵەکانی منداڵیی ڕوسۆدا زۆر لەم توێژە جیاوازانە لەتەك یەکتریدا دەکەونە ناکۆکییەوە: توێژە بێبەشەکان دژی دەسەلاتی خۆجیاکەرەوەی خێزانە ڕابەرەکان دەوەستنەوە. بەڵام لە سەدەی هەژدەیەمدا "لیبەرتینەکان" (ئازادیخوازەکان)، کە بەئاشکرا دژی پەروەردەی کالڤینیستی وەستابوونەوە، توانییان بەڕێی خەباتیانەوە زۆر ئازادیی کۆمەڵایەتی بەدەست بهێنن. پشتەکانی ڕوسۆ سەر بەم ئازادیخوازانە بوون. ئەمان، بە پێچەوانەی هەیەپارێزان، حەزیان لە موزیك و سەما، لە یاری و چوونەمەیخانە دەکرد، بە کورتی حەزیان لە ڕابواردنی جیهانی بوو. ([6])

ڕوسۆ ساڵی ١٧١٢ لە ژنێڤ دێتە جیهانەوە. باوکی، ئیزاك ڕوسۆ، سەئاتچییەکی ناسراو بوو. دایکی، سوزان بێرنارد، ماوەیەکی کورت دوای زایینی ڕوسۆ دەمرێ. ژان-ژاکی نوێزاییێنراو لاواز و نەخۆش دێتە ژیانەوە و ئەم هاتنەشی بە یەکەم ئازاری خۆی دادەنێ: "من بووم بەهۆی مردنی دایکم، زایینەکەشم یەکەم نەگبەتیم بوو (...). پورێکم منی بەخێو کرد و لە ژیاندا هێشتمییەوە. لە منداڵیدا هەموو نازێکم پێ دەدرا. تەنها برایەکم هەبوو، کە حەوت ساڵ لە من بەتەمەنتر بوو و پیشەکەی باوکم فێر دەبوو. براکەم بەهۆی ئەو نازە زۆرەوە، کە بە من دەدرا، کەمێك وەلاوە نرا بوو، ئەم شێوەیەی پەروەردەکردنیشی کاری کردە سەر بەرەڵاییەکەی. زۆر زوو کەوتە سەر کەلکەڵەی ژیانێکی بەرەڵا (...)، هەتا لە کۆتاییدا گرتییە بەر. ئیتر لە وڵات هەڵات و وون بوو (...). بەم شێوەیە من وەك تاکانەیەك مامەوە". ([7])

ئیزاك ڕوسۆ لایەنگرێکی بەبڕوای دەسەڵاتی کۆماری بوو و دەیویست کوڕەکەی لە منداڵییەوە بە هۆشی ئەو شێوە دەسەڵاتدارییە ئاشنا بکات. سیمایەکی زووی منداڵیی ژان-ژاك برێتیە لە "خوێندنەوەی شەوانە" لەتەك باوکیدا. ڕوسۆ لە تەمەنی پێنج یان شەش ساڵییەوە کتێبی دەخوێندەوە و

خۆشەویستترین نووسەری هەتا کۆتایی ژیانی پلوتارك بوو. لە دوا بەرهەمیدا بە ناونیشانی "خەوەکانی پیاسەکەرێکی تەنیا" باسی ئەم سۆزەی خۆی دەکات: "ئێستا زۆر کەم کتێب دەخوێنمەوە، لەنێو ئەم کتێبانەشدا پلوتارك بەتایبەتی دەم بزوێنێ (...). ئەمە یەکەم کتێب بوو، کە لە منداڵیدا خوێندمەوە، لە تەمەنی پیرێتیشدا دوایەم کتێبم دەبێ". [٨]

بەڵام خوێندنەوەی شەوانە لە تەمەنی دەساڵیی ژان-ژاکدا کۆتایی دێ. باوکی ژۆن ژاك ئەفسەرێك بریندار دەکات، بۆیە لە ترسی گرتن هەڵدێ و چیدی بۆ ژنێڤ ناگەڕێتەوە. بەم شێوەیە ژان-ژاك بە تەواوی هەتیو دەکەوێ، بەڵام ئەمە لە سەرێکی دیکەوە بۆ ژیانی ئەو بێسوود نابێ: لە تەمەنێکی زوودا بۆ خۆی جێ دەهێڵرێ. لەماڵەوە کتێبخانەیەکی گەورەیان هەبوو، کە پڕ بوو لە ڕۆمان و دیوان و کتێبی مێژوویی.

ژان-ژاك بەزەیی خزمەکانی دەبزوێنێ و زۆر بە تەنگییەوە دێن. ڕوسۆ لە نووسینی "کۆنفەسیۆنەکان"دا (الاعترافات) بە نەرمی و پەرۆشەوە لەم منداڵییەی دەدوێ: لە دووریی پەنجا ساڵەوە ئەم تەمەنە زووەی منداڵیی خۆی وەك بەختیارترین کاتی ژیانی دەبینێ. [٩] بەڵام ڕوسۆ وەکو باقی تەمەنی منداڵییەکی بێئارامی بەسەر دەبات. دوای ئەوەی خزمەکانی دەیخەنە بەر فێربوونی پیشەی سەئاتچێتی، گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر ژیانیدا دێ. ئێستا لێرە کەس گرنگی بەوە نادات، کە ئەم کوڕە هەتیوە و پێویستیی بە چاوپۆشی هەیە: "من حەزم لە کارەکەم بوو و بەبێ گومان تەواوم دەکرد، گەر وەستام پیاوێکی بەزەبر نەبووایە. ئەم بەزەبرییەی وەستام فێری درۆ و فێڵ و دزیی کردم. بۆ یەکەم جار لەم پەیوەندییەدا دەسەڵات و کۆیلەتیم بینی. فێر بووم حەزی نهێنیم هەبێ، خواستەکانم بشارمەوە و مەرایی بکەم. خواست و نەتوانین دەبن بەهۆی سەرهەڵدانی درۆزنی و ساختەچێتی. ئەم خراپییە بەردەوامەی وەستام



وای لێکردم لێی بهزرێم، کە پاشان بە سزای دزییەکانی خۆمم دانا و بەمەش مافێکی دامێ بەردەوامی بە دزی بدەم. لەجیاتی ئاوڕ بۆ دواوە بدەمەوە و لە سزاکە بڕوانم، بەرەو پێش دەم ڕوانی و تەنها دەربارەی تۆڵە دەهزرام". [١٠]

ڕوسۆ زوو دەکەوێتە نێو فێرگەی ژیانەوە. ساڵی ١٧٢٨، کاتێك تەمەنی شازدەساڵان دەبێ، دەر دەکەوێ، کە ئەو هەتا چەند توانای بۆ بڕیاری سپۆنتان هەیە. لە ئێوارەیەکی درەنگی یەکشەممەدا، دوای پیاسە و گەڕانە خەواڵووەکانی، بە دەروازەی داخراوی شار دەگاتەوە، ئەویش بێ لێهزرینی زۆر بڕیار دەدات ژنێڤ جێ بهێڵێ. لە ئێستا بەدواوە ژیانی بەرەڵایی سەرچاوە دەگرێ، واتا "ساڵەکانی گەڕۆکی". ڕوسۆ لە کونجی ژووره تاریکەکانەوە ئاشنای ژیان نابێ، بە پێچەوانەوە، دەگەڕێ، بە ناوچە و وڵاتی جیاوازدا تێدەپەڕێ، لێرەشەوە ژیان لە نزیکەوە دەبینێ: نایەکسانیی ستاندەکان، هەژاریی جوتیارەکان، نالەباریی ژیانی گەل.

مەدام دو ڤارۆ لە ئانسی ڕوسۆ دەگرێتە لای خۆی. دو ڤارۆ بۆ ڕوسۆ دەبێ بە دایك و پەروەردکار و دەزگیران. بەڵام ژیان لەنێو شیمانەدا تاسەی ئەو بۆ خۆشەویستی دانامرکێنێتەوە. ڕوسۆ ئەو خۆشەویستییەی لە ساڵانی پێشوویدا لە زۆر ژن چاوەڕوان کرد بوو، بەڵام هەر یەکەیان لایەنێکی کەم بوو. "تەنها شازێتی، نموونەییبوون، ئارامی بە ڕوسۆ دەدات". دو ڤارۆ لەپاڵ ئەزموونداری و بەتەمەنیدا (شازدە ساڵ لە ڕوسۆ بەتەمەنتر بوو) ژنێکی ئازاد بوو لە نەرێتی کۆمەڵایەتی و خاوەنی ناسکێتییەکی سروشتی بوو، هەر ئەم سیمایانەی ئەو بوون، کە لەسەر ڕوسۆ کاریگەرییەکی ڕاکێشەریان هەبوو. سەرەتا لەپاڵ ئەم ژنەدا هەموو سەرنجەکانی بۆ سروشت لەیاد دەچنەوە. [١١]

دو ڤارۆ (ڕوسۆ ناوی دەنا "ماما") هەوڵی دەدا ڕوسۆ بۆ ژیان پێبگەیەنێ، ئەمەیش هیچ واتایەکی دیکەی نەدەگەیاند جگە لەوەی پیشەیەك فێر ببێ.

هەوڵی پێگەیاندن سەرلەنوێ دەدرێتەوە، روسۆش کاری جیاواز تاقی دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی هیچیان شیاوی بەدیهێنان بن. بەڵام ڕوسۆ لێهاتوییەکی سەرنجراکێش بۆ موزیك نیشان دەدات، هەتا ئیتر هێندە ناخایەنێ کە ڕوسۆی هەڤدەساڵ دەبێ بە موزیکیی گەڕۆك.

لە پەیوەندییەکی پڕسۆزی نهێنی و گوزەرانێکی هێمندا خۆشترین ماوەی ژیانی ڕوسۆ ڕادەبووری. دو ڤارۆ بۆی دەبێ بە دایك و خۆشەویست و دەزگیران: "خۆشم دەویست (...)، بەڵام پتر لەبەر خۆی خۆشم دەویست نەك بۆ خاتری خۆم. من لەپاڵ ئەودا پتر لە ساتارکردنی حەزەکانم بۆ بەختیاریم دەگەڕام. ئەو بۆ من زۆرتر بوو لە خوشك، لە دایك، لە کیژێکی هەڤاڵ، تەنانەت زۆرتر بوو لە دەزگیران، هەر بۆیە نەدەشیا ببێ بە دەزگیرانم. بە کورتی، هێندەم خۆش دەویست، کە ئیتر ئەزرەتمەندی بووم، ئەمەش ڕوونترین شت بوو لەنێو هۆشمدا". ([12])

ئارامییەکی بەم چەشنە بۆ کارەکتەرێکی وەك ڕوسۆ هەمیشەیی نابێ. ژۆن-ژاکی گەڕۆك تەنها بە لەش سنووری ناوچە و وڵاتانی نەدەبڕی. بێگومان "وەرگیران" بۆ ئەوی بێدایك خۆزگەیەکی گەورە بوو، بەڵام هەرگیز نەدەشیا بۆی ببێ بە مایەی ئارامییەکی سەرچاوەیی. هەر بۆیە چێژی سروشت و ئەندێشەی بێسنوور، پتر لە خۆزگەی وەرگیرانی جیهانی، ناخی ئەویان دەتەنی. ئێستا جیهانی ئەندێشە لەنێو ئەم هێمنییەی ژیانەوە بۆ نێو خۆشەویستییەکی مەزنتر ڕای دەکێشێ: نیگاری ڕوخسارێکی دی دەکێشێ و لە جێی ،،ماما،، دای دەنێ، ئینجا بە چاوی هۆش لێی دەڕوانێ. ئەمەش خۆشەویستییەکی بێ بابەتە و هیچی دی نیە جگە لە تاسە.

هێندە ناخایەنێ ئاواتێکی ڕوسۆ بەدی دێ: گەڕانەوە بۆ دوورەپەرێزی. هەردووکیان پێکەوە بۆ ناوچەیەکی هێمن دەگوێزنەوە و خانوویەك لە



گۆشەیەکی شاراوەی نێو چیاکاندا بەکرێ دەگرن. ڕوسۆ لە ،،کۆنفەسیۆنەکان،،دا ئاوڕ لەم ماوە کورتخایەنەی ژیانی دەداتەوە و ئاوهای دەبینێ، کە گوایە مافێکی پێ داوە ببێژێ "من بە ڕاستی ژیاوم":

"گەر ئەو ساتانە تەنها ڕووداو و کردار بوونایە، گەر لە وشە پێکبهاتنایە، ئەوسا دەم توانی هەموو شتێك بگێڕمەوە یان بە هەر شێوازێك بێ ڕوون بکەمەوە. بەڵام من چۆن بتوانم ئەوە دەرببڕم، کە نەشیاوی دەربڕین و کردن و هزرینە، بەڵکو تەنها شتێکی چێژراو و هەستگیراوە، شتێکە، کە جگە لە بەختیاری و ئەو هەستگیریە خۆی هیچ هۆیەکی دیکەی نییە؟ لەتەك هەڵاتنی خۆردا لە خەو هەڵدەستام و بەختیار بووم؛ دەڕۆیشتم بۆ پیاسە، بەختیار بووم؛ مامام دەبینی، بەختیار بووم؛ جێیم دەهێشت، بەختیار بووم. بەنێو دارستانەکاندا دەسووڕامەوە، بەسەر فەرشی چیمەن و بەنێو دۆڵەکاندا دەگەڕام، دەم خوێندەوە، هیچم نەدەکرد، لە باخچە کارم دەکرد، میوەم دەڕنی، لە کاری نێوماڵدا یارمەتیم دەدا، بەڵام لە هەموو لایەك بەختیاری دوام دەکەوت: بەختیاری جگە بەقوولیی لەنێو ناخی مندا لەنێو هیچ شتێکی دیکەدا نەبوو، کە ئیتر تەنانەت نەم دەتوانی خۆم بۆ ساتێك جێ بهێڵم". ([13])

بەڵام ئەم جیهانە دابڕاو نیە. تەمەنی ڕوسۆ گەیشتووە بە بیستوپێنجساڵان و هیچی وا نازانێ. ئێستاش لەنێو ئارامیدا دەیەوێ شتێك فێر ببێ، کە خۆی حەزی لێیەتی و هاوکات سوودبەش بێ بۆی. ئەمە تێڕوانینی ئەو بوو بە درێژایی ژیانی. لە نووسینی "ڕوسۆی دادگەری ژان-ژاك"دا بەڕوونی باسی ئەم کارەکتەرەی خۆی دەکات: ژان-ژاك حەزی لە کارکردنە، بەڵام ڤێزی لە هەموو کارێکی تەرخانکراو دەبێتەوە. گەر بییەوێ بە گەشتێك هەستێ یان بە میوانی بڕوات، ئەوا یەکسەر ئەنجامیان دەدات، بە مەرجێك زۆری لێنەکرێ. شادمانترین ڕۆژی ژان-ژاك ئەوە بوو، کە بڕیاری دا تەنها لەنێو ڕۆژگاردا بژی، بۆیە

سەئاتەکەی فڕێ دا و شادمانییەکەی بە دەنگی بڵند ڕەواندەوە: "سوپاس بۆ یەزدان، چیدی پێویست ناکات بزانم کات گەیشتۆتە کوێ".

ڕوسۆ ماوەیەك خەریکی توێژینەوەی توانستەکانی خۆی دەبێ، هەتا بزانێ چۆن سەرەتای فێربوون بدات. سەرەتا فەلسەفە هەڵ دەبژێرێ، ئەو فەیلەسوفانەش برێتین لە جۆن لۆك، مالێبرانژ، دێکارت، لایبنیتس، ڤۆلتێر. بەڵام ڕوسۆ لێرەدا تەنها وەك خۆفێرکەرێك بەبێ یاریدەی دەرەکی دەست دەداتە خەریك بوون لەتەك ئەو فەیلەسوفاندا، لێرەشدا بەنێو نەسازیی بەرهەمە جیاوازەکاندا قووڵ دەبێتەوە و بە پلانێکی ئەندێشەیی دەگات: دەیەوێ لەگەڵ یەکتریدا بییان گونجێنێ! سەرەنجامی ئەم شێوازە برێتی دەبێ لە گەیشتن بە مێتۆدێك، کە لە هەر نووسەرێك لەسەر بناغەی ئیدێ تایبەتیەکەی بکۆڵێتەوە، بەبێ ئەوەی دانوستاندن لەگەڵیدا چێ بکات. ڕوسۆ چەند ساڵێك لەسەر ئەم مێتۆدە بەردەوام دەبێ.

ژیانی ئەم ساڵانەی ڕوسۆ پڕە لە گەڕان بەنێو ئیتالیا و فەڕەنسا و سویسرادا. هەروەها ئەم ژیانە لەتەك دو ڤارۆدا، دوای ئەوەی دەکەوێتە تەنگژەوە، بە جیابوونەوە کۆتایی دێ. ڕوسۆ هەستی بە پەیوەندییەکی نهێنی لە نێوان دو ڤارۆ و سویسرییەکی گەنجدا بە ناوی ڕودۆلۆف ڤیتسنڕید کردبوو، بەڵام دو ڤارۆ خۆی بوونی پەیوەندییەکەی لە لا دەدرکێنێ. ڕوسۆ لەم گۆڕانە سەرەنجام وەردەگرێ: سەرەتا دەڕوات بۆ لیۆن و لەوێ کارێك وەك پەروەردکاری دوو کوڕی فەرمانبەرێکی پۆلیس و دادگا دەدۆزێتەوە. بێگومان هێشتا هەر تاسەی گەڕانەوە بۆ لای دو ڤارۆ دەکات، بەڵام دەزانێ چیدی لەو ماڵەدا جێگەی نابێتەوە. ڕوسۆ بڕیار دەدات بۆ پاریس بڕوات. بەپێی گێڕانەوەی خۆی گوایە پاییزی ١٧٤١ دەگاتە پاریس، بەڵام دەشێ ئەم داتە ڕاست نەبێ و ڕوسۆ ئۆگوستی ١٧٤٢ بە پاریس گەیشتبێ.



٢

گەیشتنی ڕوسۆ بۆ دووەم جار بە پاریس برێتییە لە سەرەتای گۆڕانێکی نوێ، کە دوازدە ساڵ دەخایەنێ. ئێستا تەمەنی ئەو نزیکەی سیساڵانە و بەرهەمێکی ئەوتۆی نییە، سەرباری ئەمەیش بە دەستی خاڵی بۆ پاریس نایەت، بە پێچەوانەوە، لەپاڵ خەون و بۆچوون و مەبەستەکانیدا، کە لێرە هێزێکی بزاوت وەردەگرن، ئۆپێرای ،،نارسیس،،ی نووسیوە و گۆڕانی بە سیستەمێکی تایبەتیی نۆتەنووسین بە ژمارە داوە. ڕوسۆ تەنانەت دەوێرێ ئەم سیستەمەی بخاتە بەردەم ئەکادیمیستەکانی پاریس، ئەمانیش بە ڕاستی گرنگیی پێ دەدەن بەبێ ئەوەی وەری بگرن. بەڵام ڕوسۆ لە سەروو ئەمانەوە لە ڕەوتی "ساڵانی گەڕۆکی"دا ئەزموونێکی زۆری لە لای خۆی کۆکردۆتەوە و، پتر لە دەسکەوتە هۆشییەکانی، شوێنی جێبوونەوەی لەنێو پاریسدا بۆ مسۆگەر دەکەن.

ڕوسۆ لە پاریس سەردانی ساڵۆنی ئەدەبی و ئاهەنگی ئەڕسیتۆکراتەکان دەکات، لە هەموو نێوەندێکدا بە کەسێکی خۆجۆر دادەنرێ و لەبەر ئەم هۆیە لە زۆر کەموکورتیی دەبوورن. بەڵام ژمارەیەکی فرە لەو کەسانە، کە ئێستا ئەو لە پاریسی ڕۆکۆکۆدا پێیان دەگات، ئەوانەن، کە ناخیان بەهۆی داهاتووی نادیارەوە شێواوە و زیرەکانە ئەم شێواوییەی خۆیان لە پشتی گفتوگۆوە دەشارنەوە. ئەمانە هەست دەکەن، ئەم بێگانەیە شتێك دەزانێ، کە ئەمان هیچ دەربارەی نازانن. ئەمان هێندە لەنێو ژیانی ڕۆژانە و چەقەی ساڵۆنەکاندا نقوم بوو بوون، کە نەیان دەتوانی دەنگی سەردەم ببیستن. ([١٤])

روسۆ بەهۆی خانمێکەوە بەناوی مەدام دو بێزێڤال کاریکی لە کۆنسولاتی فەڕەنسی لە ڤینیسیا پێ دەدرێ: ڕوسۆی سیوپێنجساڵان دەبێ بە سکرتێری کۆنسولات! بەڵام ئایا کارێکی بەم چەشنە لەتەك جەوهەر و ئەزموونەکانی ئەودا

دەگونجێ؟ پایەگایەکی ڕەسمی بۆ ڕوسۆیەك، کە حەزی لە شوێنگۆڕین و گەڕانە؟ بێگومان گەرچی شارەزایی لەم کارەدا نابێ، بەلام بەزوویی فێری دەبێ: "بە ئەوپەڕی ڕێکوپێکی و لە کاتی خۆیدا هەموو فرمانێکم ئەنجام دەدا" (کۆنفەسیۆنەکان). بەلام هێندە ناخایەنێ لە نێوان ڕوسۆ و کۆنسولدا بە ناوی دو مۆنتاین ناکۆکی چێ دەبێ. بە تایبەتی ئەو ڕێزە، کە لە ڤینیسیا بە ڕوسۆ دەدرێ، بەدڵی کۆنسول نابێ. ڕوسۆش لە لایەنی خۆیەوە، هەر لە منداڵییەوە کەسێکی لاسار، بە هیچ شێوەیەك تاقەتی نابێ بە پیر خۆزگە و داواکاریی کۆنسولەوە بچێ. دوای دەمەقاڵێیەکی توند لە نێوان هەردووکیاندا، ڕوسۆ کۆنسولات جێ دەهێڵێ و بۆ پاریس دەگەڕێتەوە. لێرە ڕاستەوخۆ هەوڵ دەدات بە ڕاپۆرتێکی درێژ ڕەوتی ڕاستەقینەی ناکۆکییەکانی لەتەك کۆنسولدا ڕوون بکاتەوە و سەبارەت بە کێشەکە بە بڕیارێکی دادپەروەرانە بگات. بێگومان هێشتا هەر بە ڕێزەوە پێشوازیی لێ دەکرێ، بەلام وشە پێشوازیکەرەکان تەنها وشەن و هیچی دی. پاشان سکالاکەی بەو بیانووە ڕەفز دەکرێ، کە گوایە ئەو فەرەنسی نییە و بۆیە وەکو بێگانە بۆی نییە چاوەڕوانی پارێزگاری لە لایەن دەوڵەتی فەرەنسییەوە بکات. ئەم ڕووداوە بۆ ڕوسۆ شکستییەکی زۆر گەورە دەبێ، چونکە ئەو ئاوها باوەڕ دەکات، کە دادپەروەری و ماف و یاسا لایەنی ئەو دەگرن. بەلام ئێستا بەڕاستی گومان لە دەستوورەکانی ماف و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی پەیدا دەکات. هەروەها مەدام دو بێزێڤاڵ لەو ناکۆکییەدا پشتی کۆنسول دەگرێ، بۆیە ڕوسۆ بە تەوسەوە نامەیەکی بۆ دەنێرێ: "مەدام، من بەهەڵەدا چوو بووم (...)، دەبوو لەو لایەنە بهزرێم و هەستی پێ بکەم، کە بۆ منێکی بێگانە و پلێبییە نەلواوە دژی بەگزادەیەك بووەستێتەوە". ([١٥])

ڕوسۆ لە پاریس لەتەك هەندێك نووسەری گەنجدا پەیوەندیی دۆستایەتی دەبەستێ، کە هەموویان لە ڕووی ئیدیۆلۆژییەوە لە یەکتری نزیکن. ئەمانە



کەسانێکن، کە بە ڕێکخراوی فۆیدالیزم ڕازی نابن. نزیکترین دۆستی ڕوسۆ بریتی بوو لە دێنیس دیدەرۆ، پاشان کۆندیلاك، فۆن گریم، ژۆن دالۆمبێرت. ئەم هاوڕێیانە لەسەر پێشنیاری دیدەرۆ و دالۆمبێرت هەوڵ بۆ دەرکردنی فەرهەنگێکی زانستی دەدەن، بەلام دوای هزرین سەبارەت بە کارەکان بە شتێکی تەواو نوێ دەگەن: "ئەنسیکلۆپێدی".

ڕوسۆ ئەو کاتە تەنها وەك موزیکیی و تیۆریستی موزیك ناسرا بوو، بۆیە لە ئەنسیکلۆپێدیدا ئەو ئەرکە وەردەگرێ، کە چەند گوتارێك دەربارەی موزیك بنووسێ. بەلام گرنگتر لەم پەیوەندییە بۆ گۆڕانی داهاتووی ڕوسۆ ئەوەیە، کە دەکەوێتە نێوەندێکی زۆر پێشکەوتنخوازەوە و هەموو دژی جیهانی فۆیدالی وەستاونەتەوە .

ساڵی ١٧٤٩ گرنگترین وەرچەرخان لە ژیانی ڕوسۆدا ڕوو دەدات: ڕۆژێك لە پاریسەوە بۆ سەردانی دیدەرۆ دەڕوات، کە بە هۆی بڵاوکردنەوەی نووسینی ،،نامەیەك دەربارەی کوێرەکان،، گومانی ئاتێئیزم ی لێ دەکرا و لەبەر ئەم هۆیە لە بەندیخانەی ڤیکۆن گیرا بوو. ڕوسۆ ڕوداوەکەی ئەو ڕۆژە هێندە بە گرنگ دادەنێ، کە چەندین ساڵ درەنگتر لە نامەی جیاوازدا لێی دەدوێتەوە. ڕوسۆ دەنووسێ، کە گوایە لەسەر ڕێگەی ڤیکۆن ڕۆژنامەی "مێرکور دو فرانس"ی دەخوێندەوە:

"کتوپڕ پرسیارەکەی ئەکادیمیی دیژۆ کەوتە بەرچاوم، کە بوو بە هۆی یەکەم نووسینم. گەر شتێکی شیاوی بەراوردکاری لەتەك سروشێکی (ئیلهام - ن) لەناکاودا هەبێ، ئەوا ئەو بەراوردە بزووتنەکەی نێو ناخیشم دەگرێتەوە. هزرۆکەیەکی لەژمارەنەهاتوو و ژیندار بۆ لام دەهاژێن، بەلام بە هێز و پەرۆشێکی ئەوتۆ، کە بەتەواوی ساکانیانم. هۆشم مەست بوو بوو، دڵەخورپە هەڕەشەی تاساندنی لێ دەکردم. چیتر هەناسەم بۆ نادرێ، بۆ ژێر درەختێکی سەر

کەناری ڕێگاکە ڕادەکەم و لەو ژێرەدا بە پەشۆکاوی کات بەسەر دەبەم، هەتا دوای هەستانم دەبینم ئێلەکەکەمم بە فرمێسك تەڕ کردووە (...). گەر تەنیا سێ بەشی ئەو هزرۆکانەم بنووسیایەتەوە، (...)، ئەوا بە چ ڕوونییەك نەسازییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیم نیشان دەدا، بە چ هێڵێکی ڕاست دەم سەلماند، کە مرۆڤ لە سروشتەوە چاکە و تەنها بەهۆی دامەزراوەکانمانەوە خراپ دەبێ. کەمێك لەو برە زۆرەی ڕاستییە مەزنەکان، کە منیان ،،دەرەوشاندەوە،، و لەیادم مابوون، ئێستا لە فۆرمێکی لاوازدا بەنێو نووسینەکانمدا پەرش بوونەتەوە. من بەم شێوەیە و بە پێچەوانەی ویستی خۆم بووم بە نووسەر". ([١٦])

ژیاننامەنووسە فەرەنسییەکانی ڕوسۆ ئەم ڕووداوەی سەر ڕێگەی ڤیکۆن ناو دەنێن "ئیلومیناسیۆن": ساتی دەرەوشانەوە یان ڕۆشنبوونەوە. ڕوسۆ لەم ڕۆژەی ئۆکتۆبەری ١٧٤٩ بە دوواوە گرنگییەك بۆ مێژووی هۆشیاریی مرۆڤایەتی پەیدا دەکات. ([١٧])

پرسیارەکەی ئەکادیمیی دیژۆ ئەمە بوو: "ئایا پێشکەوتنی زانست و هونەرەکان ڕۆڵێکی بۆ پێگەیاندنی ڕەوشت گێڕاوە"؟ ئەکادیمیستە فەرەنسییەکان لە سەدەی هەژدەیەمدا چاوەڕوانی وەڵامی زانستییان بۆ ئەم جۆرە پرسیارانە نەدەکرد، بەڵکو شرۆڤەی بڕواهێنەر، بۆیە وەڵامەکان ناو نەدەنران توێژینەوە یان خەریکبوون، بەڵکو ناو دەنران دیسکورز (گوتار).

ڕسۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لەم سەردەمەی ڕۆشنایییەکاندا، کە مرۆڤ شانازییەکی زۆر بە دەستکەوتەکانی سەردەمەوە دەکات، بە "نەخێر" دەداتەوە و بە سەرجەم خوێنەران دەڵێ، کە زانست و هونەر پتر زیانیان هەبووە وەك لە سوود:



مرۆڤ لە هیچەوە بە کۆششی خۆی پێدەگات و بە تیشکی ئەقڵ تاریکی دەرەوێنێتەوە، ئەو تاریکییەی کە سروشت بەسەر مرۆڤایەتییدا کێشاوە. بەڵام ئێستا مرۆڤ بەسەر خۆیدا ڕادەپەڕێ و بەهۆی کۆششیەوە بۆ ئاستی بەرزتر هەڵدەزنێ. هۆش، بە هەمان شێوەی لەش، پێداویستی خۆی هەیە. پێداویستییەکانی لەش بریتین لە بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەوانەی هۆش خشڵی ئەو ژیانەن. لە کاتێکدا دەوڵەت و یاسا مشوری ئاسایش و بەختیاریی مرۆڤ دەخۆن، ئەوا زانست و هونەرەکان، بێگومان کەمتر چەوسێنەرانە لە ئەوان، کەلەپچە و کلیلە دەهۆننەوە و دوای کۆتکردنی خۆیان لە نێویاندا هەستە سەرەتاییەکانی ئازادی دەخنکێنن. پێداویستییەکانی ژیان تاجی دەسەڵاتیان زیت کردەوە، بەڵام زانست و هونەر دەسەڵاتیان چەسپاند.

ژیان چەند خۆش دەبوو، گەر هەڵوێستی دەرەکی هەمیشە پەرچاندنی بڕوای نێو ناخ بووایە، گەر ڕێزگرتن ڕەوشت بووایە و نەك بۆ بەرژەوەندی، گەر بنەماکانی ڕەفتارمان بەڕاستی لە خزمەتی دەستووری ژیانماندا بوونایە، گەر فەلسەفە لە ناوی فەیلەسوف جیانەکراوە بووایە. ئەو کاتەی هونەر فێری نەکردبووین بە زمانێکی دەستکرد بدوێین، ئاکارمان سروشتی بوو. بەڵام ئەمڕۆ بێموبالاتییەکی هەڵخەڵەتێنەر خۆی لەنێو خو و نەریتەکاندا دەنوێنێ، ئەمڕۆ مرۆڤ دوای نەریت دەکەوێ نەك سروشتی خۆی.

زانست و هونەر بەهۆی گرفتەکانمانەوە سەریان هەڵدا: ئەستێرەناسی لە خەرافیاتەوە دروست بوو، هونەری ڕەوانبێژی لە تەماح و کین و درۆوە، پێوانەی زەوی لە موڵکخوازییەوە، زانستی سروشتی لە نوێخوازییەوە (فزولییەتەوە)، هەموویان، تەنانەت مۆڕالیش لە فیزی مرۆڤەوە دروست بوو. خوای مەزن، ڕزگارمان بکە لە زانست و هونەری باب و باپیرانمان، سەرلەنوێ نەزانی و بێگوناهی و هەژاریمان پێ ببەخشەرەوە! ("دیسکورزی زانست و هونەر")

"دیسکورزی زانست و هونەر" پتر ڕەوانبێژییە وەك لەوەی فەلسەفە بێ. بێگومان نووسینەکە دارشتنێکی فەلسەفەی مێژوو دەگرێتە خۆ، ئەویش بەوە، کە ڕوسۆ پێشکەوتنی ڕواڵەتییانەی زانست و هونەر وەك پاڵنەری ژەنگهێنانی مۆرالی دەبینێ، بەڵام ئەم فەلسەفەی مێژووە جارێ ئاوڵا نەبووە. ڕوسۆ خۆی سەبارەت بەم کێشەیە دەبێژێ، کە یەکەم نووسینی لە ڕووی لۆگیك و ڕێکخستنەوە کورتهێنە، هەروەها پڕە لە هێز و هەڵچوون. مۆرکێکی دیکەی "دیسکورزی زانست و هونەر" بریتییە لە کەمڕەسەنی. ڕوسۆ زۆر هزری نێو نووسینەکەی لە نووسەران و فەیلەسوفانی دی وەرگرتووە، لەوانە مۆنتێسکیو، سێنێکا، پلاتۆن، بەڵام بە تایبەتی پلوتارك. ڕوسۆ بە تەسەلی نووسینەکانی پلوتارکی خوێندبۆوە و تێزەکانی ئەوی سەبارەت بە سەروەریی سروشت بەسەر بەرهەمی هونەریدا دەناسی. کەچی نوێنەرانی ئەکادیمی خەڵاتەکە، سەرەڕای ئەم کورتهێنییەی نووسینەکە، بە ڕوسۆ دەبەخشن. ڕوسۆ دوای ئەم نووسینە لە لایەن ڕەخنەگران و ڕای گشتییەوە بە یەکێك لە "فەیلەسوفەکان" دادەنرێ، بێگومان بە یەکێك لە خۆجۆرترین و سەرسوڕمێنەرترین کەس لەنێو ئەم گرووپەدا.

"دیکسورزی زانست و هونەر" خەریکبوونە لەتەك کێشەی بوون و ڕووکەشدا. دوای ئەوەی ڕوسۆ لەسەر ڕێگەی ڤیکۆن بە "تیشکی ڕاستی" دەدرەوشێتەوە و پاشان لە شەوی درێژخایەندا گوتارەکەی دەنووسێ، ئیتر دەربڕینەکەی لەم ڕەوتەدا ژیانێکی نوێ وەردەگرێ: ڕوسۆ دادەگیرسێ. دژبەریی (نەسازیی) نێوان بوون و ڕووکەش بە سۆز پڕ دەبێتەوە و جۆشێکی هۆنەرییانە بە گوتارەکەی دەدات. بەڵام سەرەڕای هەموو هەڵچوونێك هەستێکی ڕاستەقینە بەسەر ئەو دابەشبوونەی بوون و ڕووکەشدا دەدرێتەوە. ([18])



لەژێر ڕووکەشدا چۆڵاییەك هەڵنیشتووە و هەموو کێشەکانمان لێرەوە دێنە ئاراوە، چونکە بەرێی ئەم کەلێنەی چۆڵاییەوە، کە ڕێ لە "هەڵوێستی دەرەکی"ـمان دەگرێ و نایەڵێ "لەتەك دڵماندا" بگونجێ، نەگبەتی دێتە نێو جیهانەوە. بەم شێوەیە ڕوسۆ دەستکەوتە مەزنەکانی ڕۆشناییەکان دەسڕێتەوە و پرسیارێکی نوێ هەڵدەکەنێ: ئێمە گرفتێکی زۆرمان هەیە و هەموویان لە ڕووکەشەوە سەر هەڵدەدەن. ئینجا ڕوسۆ بە هەڵمەتێکی دی ڕادەی "بۆگەنبوونی نەرێتمان" نیشان دەدات: ڕاستە کە هۆشی مرۆڤ سەرفرازە، بەڵام مرۆڤ خۆی بۆگەنی کردووە. ئەمەیش مسیبەتێکە، کە مرۆڤ تێی کەوتووە، ئەم مسیبەتەش بریتییە لە دووبەشبوونی ئەو بەسەر بێگوناهیی حاشالێکراو و بۆگەنبوونی ناچاریدا. ڕووکەش و خراپە لە لای ڕوسۆ هەمان واتایان هەیە. ([19])

پچڕانی نێوان بوون و ڕووکەش پچڕانی دی دروست دەکات: پچڕانی نێوان چاکە و خراپە، "نێوان چاکەکان و خراپەکان"، نێوان سروشت و کۆمەڵگا، نێوان مرۆڤ و خواکانی، تەنانەت پچڕان لە ناخی مرۆڤ خۆیدا. پاشان سەرجەم مێژوو بەسەر "پێشین" و "پاشین" دا دابەش دەبێ. ([20])

جیابوونەوەی بوون و ڕووکەش ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە "پەچە"یەك هەستە ڕاستەقینەکانی مرۆڤی شاردۆتەوە. ئەم زانینە یەکەم ئەتکی کۆمەڵگایە لە لایەن ڕوسۆوە، ئەمە ڕاستییەکە و نایەوێ قبووڵی بکات، بەڵکو بەدووی هۆ و ڕوونکردنەوەیدا دەگەڕێ؛ ئەمە بریتییە لە نەگبەتی و ڕزگاربوون لێی دەبێ بە خۆزگەی ئەو. ئەم بابەتە وەرگێراوەش لە خۆیدا بەبەرهەمە و شیمانەی گۆڕانێکی لە ڕادە بەدەر دەگرێتە خۆ. ([21])

ڕوسۆ فەیلەسوفەکان بە بەشێکی ئەو جیهانە دادەنێ، کە ڕەخنەی لێ دەگرن. بۆیە هەموویان خەتابار دەکات. فەیلەسوفەکان گرنگی بە هێشتنەوەی دامەزراوەکانی چەوساندنەوە دەدەن و کاریان بۆ دەکەن. لە نێوەندە

ئەدەبییەکاندا، کە تەنها بۆچوون و ڕووکەش سەروەرن، دەشێ هەموو شتێك بگووترێ و کەسیش باوەڕ بەوە ناکات کە خۆی دەری دەبڕێ. داواکاریی فەیلەسوفەکان بەشێکە لە چەقەبازیی کۆمەڵایەتی، دەربڕینی ناڕاستەقینەیە دەربارەی جیهانێکی ناڕاستەقینە. ([22])

بڕیارەکەی ڕوسۆ ئەوەیە، کە کۆمەڵگا دژی سروشتە. ئەم بڕیارە یەکسەر دەرەنجامێك لەتەك خۆیدا دەهێنێ: من دژی کۆمەڵگام. من ئەرکی تووڕدانی کۆمەڵگایەك وەردەگرێ، کە هیچاندنی سروشتە. بەم شێوەیە هیچاندنی هیچاندن دەبێ بە شتێکی بنەمایی، دەبێ بە هەڵوێستێکی زیندوو. ژان-ژاك بەتاك و تەنیا دەبێ بە هیچاندنی کۆمەڵگا. ([23])

ئێمە دەتوانین بەکورتی سێ تێزی سەرەکی لەنێو "دیسکورزی زانست و هونەر"دا دیاری بکەین: یەکەم تێز ئەو بڕیارەیە، کە " مرۆڤایەتی لە دۆخە بێگوناه و سەرەتاییەکەی ژێرپەڕیوە"؛ دووەم بڕیاری ڕوسۆ ئەوەیە، کە "ئەو نەتەوانەی لە ڕووی هونەری و زانستییەوە دواکەوتوون"، لەو نەتەوانە سەروەرترن کە پێشکەوتوون (سیڤیلیزەکراون)؛ سێیەم بڕیاری ڕوسۆ ئەوەیە، کە "سیڤیلیزاسیۆنە مەزنەکان لەژێر کێشی گۆڕانە کولتووریەکەی خۆیاندا دێکادێنت بوون". ([24]) کەواتە ئاشکرایە، بۆچی خوێنەرانی ڕوسۆ سەریان لەم تێزانە دەرنەدەچوو. لە سەردەمی ڕۆشناییەکاندا شانازییەکی زۆر بە پێشکەوتنی بەرهەمەکانی ئەقڵ، یان بە شکۆفەی زانست و هونەرەکانەوە دەکرا، کەچی ئێستا هاووڵاتییەکەی ژنێڤ پێیان دەڵێ، ئەوان بەرەو خوار ژێرپەڕیون نەك پێشکەوتبن، هەروەها وەحشییەکان ژیانێکی ساغتریان لە ئەوان هەیە. لێرەوە ئاشکرا دەبێ، کە بۆچی ئەم دیسکورزە شەڕێکی ڕۆشنبیری و دانوستاندنێکی هەمەلایەنیی هێنایە گۆڕێ. ڕوسۆ بەهۆی ئەم دانوستاندنانەوە پتر ناوبانگی پەیدا کرد.



ژیانی ڕوسۆ دوای بلاوبوونەوەی "دیکسورزی زانست و هونەر" بەتەواوی دەگۆڕرێ، ئێستا کەسانێکی زۆر دێن بۆ سەردانی و ئەمەش کاریگەرییەکی نالەبار لەسەر تەندروستیی ئەو دەنوێنێ. هەروەها ئێستا بێخەوی و خۆسستی (دێپرەسیۆن) لە لای سەر هەڵدەدەن و ئازاری میزەڵدانی پەرە دەسێنێ، سەرەڕای گەرماو و وەرگرتنی ئاوی تەندروست هەمیشە ڕەنگزەرد و لاوازتر دەبێ. بەڵام فرەسوا مۆسارد، کە وەك ڕوسۆ سویسری بوو و لە پاسی دادەنیشت، بانگی ڕوسۆ دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژی. ئێستا لێرە لە دوورەپەرێزیدا ئازارە جەستەییەکانی خاو دەبنەوە، هەروەها لێرە ئۆپێرای "فالچیی گوند" دەنووسێ، کە لەسەر شانۆ لە بەردەم پاشا و بەگزادەکاندا نمایش دەکرێ. کاریگەریی ئەم ئۆپێرایە بە چەشنێك دەبێ، کە لودڤیشی پازدەیەم دەیەوێ لە کۆشکی پاشایەتی پێشوازیی ڕوسۆ بکات. پەیوەست بەم بانگکردنەی پاشاوە دوو ڕووداوی گرنگ هەن، کە کارەکتەری ڕوسۆمان بۆ ڕوون دەکەنەوە:

ڕوسۆ ڕۆژی خەڵاتدانی بەرهەمەکەی لە شانۆ دەبێ لەنێو ئەو لۆژەدا، کە بۆی تەرخان کرا بوو، "بەڵام شلوشێواو، بە ڕیشی نەتاشراو و پێڕوکەیەکی دانەهێنراوەوە". ڕوسۆ لەسەر شێوازی تایبەتیی خۆی دەنووسێ: "ئەم بێشەرمییەم بەلگەی ئازایەتیمە. بەخۆمم گوت: من لە جێگەی خۆمدام، چونکە بەرهەمەکەم دەبینم و بۆ ئەم مەبەستەش بانگ کراوم. من خۆمم بە هەمان شێوەی ڕۆژانی دیکەی ژیانم پۆشیوە، نە چاکتر و نە خراپتر. گەر هەنگاو بۆ خۆگونجاندن لەتەك ڕای گشتیدا بنێم، ئەوا هێندە ناخایەنێ بە کۆیلەی دەبم، پاشان بە سووك و ڕسوا دادەنرێم". ([25])

هەروەها ڕوسۆ بۆ ڕۆژی داهاتوو ناچێ بەپیر پێشوازییەکەی پاشاوە. بێگومان بۆ ئەم هەڵوێستەی چەند هۆیەکی هەبوو، بۆ نموونە "شەرمنییە بەنەفرەتەکەی"، بەڵام گرنگترین هۆی ئەمە بوو: ڕوسۆ دەزانێ پاشا خەڵاتی

دەكات و مووچەیەكی بۆ دەبڕێتەوە. گەر نەچێ، ئەوا ئەو مووچەیەی لەكیس دەچێ. جا چییە؟ "من خۆمم لە دەستبەسەریی ئەو مووچەیە پاراست. بژی ڕاستی و ئازایەتی و ئازادی! بە چ ڕوویەكەوە ئیتر لە ئازادی بدوامایە (...)؟ گەر ئەو مووچەیەم وەربگرتایە، ئەوسا دەبوو مەرایی بكەم یان بێدەنگ ببم ". ([26])

ئەكادیمیی دیژۆ ساڵی ١٧٥٣ سەرلەنوێ پرسیارێكی دی بڵاو دەكاتەوە: "هۆی نایەكسانی لە نێوان مرۆڤاندا چییە، ئایا ئەو پەیوەندییە بەپێی یاسای سروشت ڕەوایە؟". ڕوسۆ بە دیسكورزێكی دووسەد لاپەڕەیی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بەڵام تێزە هەمەلایەنییەكەی بەدڵی خەڵاتدەران نابێ. (بڕوانە بەشی دووەم: ئەنترۆپۆلۆژی). ڕوسۆ لەم دیسكورزەدا هێرش دەكاتە سەر خاوەنداریی تایبەتی، ئەمەش ڤۆلتێر، كە ماوەیەك لەمەوبەر لە ژنێڤ بوو بوو بە موڵكدار، زۆر تووڕە دەكات. ڤۆلتێر ئەم نووسینە ناو دەنێ "فەلسەفەی سواڵكەرێك، كە حەز دەكات هەژارەكان لە دەوڵەمەندەكان بدزن". بەتایبەتی ڕازاندنەوەی ژیانی وەحشییەكانی ئەمریكا و ئەفریكا لە لایەن ڕوسۆوە حەوسەڵەی ڤۆلتێر ناهێڵێ، بۆیە بە زمانە تیژە تایبەتمەندەكەی توانجێك دەگرێتە ئەم نووسینەی ئەو، كە گوایە برێتییە لە "كتێبێك دژی ڕەگەزی مرۆڤ، كە مرۆ لەكاتی خوێندنەوەیدا زەوق دەیگرێ، لەسەر چوارپەل سەما بكات". ([27])

ڤۆلتێر تاكە زانایەكی فەڕەنسی نییە كە هەڵوێستێكی بەم چەشنەی بەرانبەر "دیسكورزی نایەكسانی" هەیە. بەگشتی لە فەڕەنسادا ژمارەی ئەو ڕەخنەگرانە زۆر كەمن، كە ستایشی ئەم نووسینەی ئەو دەكەن. بەڵام سەرباری ئەمەیش "دیسكورزی نایەكسانی" بەزوویی سنوورەكانی فەڕەنسا دەبڕێ و كاریگەریی گەورە دەنوێنێ. ئادام سمیس لە سكۆتلاند "تیۆریی هەستە مۆرالییەكان" هەتا ڕادەیەك وەك وەڵامدانەوەیەكی ئەم دیسكورزەی ڕوسۆ دەنووسێ، لە ئەڵمانیا كانت و هێردەر لە لایەن ئەم دیسكورزەوە كاریان تێدەكرێ: كانت لە



نووسینەكەیدا بە ناونیشانی "ئیدێی مێژوویەكی گشتی لە ڕوانگەی هاووڵاتێتیی جیهانییەوە"، هەروەها هێردەر لە نووسینەكەیدا بە ناونیشانی "چەند ئیدێیەك سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووی مرۆڤایەتی".

ڕوسۆ لە گوتارێكدا بەناونیشانی "نامەیەك دەربارەی موزیكی فەڕەنسی"، كە لە "ئەنسیكلۆپێدی"دا بڵاو دەبێتەوە، فەرتەنەیەكی گەورە دەنێتەوە. ئەو گوتارە بە بڕوای فۆن گریم "شاری پاریسی لە هەر چوار لاوە گڕتێبەردا". نزیكەی پەنجا ڕەخنەگر دەكەونە خەریكبوون لەتەك ئەم ئەتككردنەی موزیكی فەڕەنسیدا لە لایەن ڕوسۆوە. هەندێك ڕەخنەگر وا هەست دەكەن، كە لە شەرەفی نەتەوەییاندا بریندار كراون. ([28])

ڕوسۆ لەم گوتارەدا موزیكی ئیتالی، بەهۆی دەوڵەمەندییەوە لە میلۆدی و هونەری دەنگدا، لە سەرووی موزیكی فەڕەنسییەوە دادەنێ. بە بڕوای ئەو ئاوازدانەرە فەڕەنسییەكان كەمییان لە میلۆدێك و هارمۆنی و ئەندێشەدا هەیە، جگە لەمە ئۆپێرای فەڕەنسی "هەتا بڵێیت دیاردەیەكی هەژارە" و زمانی فەڕەنسی زۆر كەمتر لە زمانی ئیتالی بۆ ئاواز دەگونجێ! "لەو بڕوایەدام ڕوونم كردبێتەوە، كە لە موزیكی فەڕەنسیدا نە كێش و نە میلۆدی هەیە، چونكە زمانی فەڕەنسی بۆ ئەوە دروست نەبووە، جگە لەمەش ئاوازی فەڕەنسی لاواندنەوەیەكی درێژخایەنە (...). لێرەوە دەگەم بە سەرەنجامێك، كە فەڕەنسییەكان موزیكیان نییە و نایانبێ"!! ([29])

هەندێك ئەندامی ئۆركێسترای پاریس هەڕەشەی تێهەڵدانی لێ دەكەن، هەندێكی دی دەیانەوێ بۆ دووێل (بەرانبەرێن) بانگی بكەن. ڕوسۆ دوای ئەم گوتارە سەردانی نومایشكردنەكانی موزیكی لێ یاساغ دەكرێ. هاوكات سەرجەم هاوڕێیانی، جگە لە دیدەرۆ و فۆن گریم، لایەنی ڕەخنەگران دەگرن و لێی دەتەكنەوە. بەڵام لەبەرئەوەی ڕوسۆ لە ساڵۆن و قاوەخانەكانیش هەر هەمان

بڕوا لەسەر موزیك دەردەبڕێ، ئەوا هێندە ناخایەنێ دوژمنی زۆرتر دەبێ وەك لە دۆست. [٣٠]

لە ساڵی ١٧٥٤ بەدواوە دابڕانی کۆمەڵایەتیی ڕوسۆ سەرەتا دەگرێ.

بەڵام ڕوسۆ خۆیشی هەمیشە پتر بێزی لە کۆمەڵی پاریس و شێوازی ژیانی دەبێتەوە. لە ئاوڕدانەوەیدا لەو کاتە دەنووسێ، کە خەریکبوونە هۆشییەکانی نووسەران و کەمی ڕاستگۆیی لە نووسینەکانیاندا فێزیان دەهێنایەوە، هەروەها لە پەیوەندییەکانیدا زۆر کەم ڕاستگۆیی و کراوەیی و خۆشەویستیی بەدی کردووە، بۆیە تاکە کۆمەڵگایەك، کە ئەو خۆزگەی ژیانی تێدا هەبێ، کۆمەڵگای دۆستانە. [٣١]

ڕوسۆ ماوەیەك دوای ئەم ناکۆکییانە بۆ ژنێڤ دەگەڕێتەوە، دوای بیستوشەش ساڵ "بەجۆشەوە بۆ کۆمار" دەڕواتەوە. ڕوسۆ بە فیزێکی لە ڕادەبەدەر دەربارەی خۆی دەنووسێ، کە چۆن لە هەموو ستاندەکاندا پێیدا هەڵدەدرا، بەڵام ئەم تەریق دەبۆوە، چونکە پەڕینەوەی لە مەزەبی کالڤینیستیی باوانییەوە بۆ مەزەبی کاتۆلیکی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نواندووە، کە لە وڵاتەکەی خۆی دابڕێ و لیرەشەوە نەتوانێ بە ئەرکەکانی سەرشانی هەستێ!

ڕوسۆ لەگەڵ ئەوەشدا تەنها چوار مانگ لە "کۆمار" دەمێنێتەوە. ئەم ماوە کورتخایەنە کامەرانترین ماوەی ژیانی پێگەییوی ئەو پێك دەهێنێ. کاتێك لە پاریس لە خەڵك بێزار بوو، ئەوا ئێستا لە ژنێڤ لەتەك هەڤاڵەکانی منداڵییدا پەیوەندی دادەمەزرێنێتەوە.

هۆکانی ساردبوونەوەی ڕوسۆ لە ژنێڤ زۆرن. ناوەندە باڵادەستەکانی ژنێڤ بە ساردییەوە پێشوازییان لە "دیسکورزی نایەکسانی" کرد بوو؛ ڕوسۆ دەبێژێ، گوایە بەتایبەتی سەرەتاکەی بوو بوو بەهۆی دروستکردنی "چەند دوژمنێك لە شارەوانی و چەند بەخیلێکیش لەنێو هاووڵاتیاندا"! جگە لەمە ئێستا ڤۆلتێری



دوژمنی لە ژنێڤ نیشتەجێ بوو بوو و ڤیلایەکی پێ بەخشرابوو. هەروەها دوای ئەوەی ڕوسۆ بۆ پاریس دەگەڕێتەوە، دەیەوێ ماڵەکەی هەڵبووەشێنێتەوە و ماڵئاوایی لە دۆستانی بکات، بەڵام لێرە مەدام دێ پینێ گلی دەداتەوە و لە نزیکی خۆیەوە لە مۆمۆرێنسی خانوویەکی بۆ گوزەران پێ دەبەخشێ.

بەڵام ژیانی هێمن لەنێو سروشتدا کورتخایەن دەبێ. زستانی ١٧٥٧ ئازاری میزەڵدانی پەرە دەسێنێ و لەم کاتە بەدوواوە ناچار دەبێ سۆندە بەکاربهێنێ. ڕوسۆ هەست دەکات لە مردنەوە نزیکە و زۆر جار سەبارەت بە خۆکوشتن لێدەهزرێ. پسیکۆزانەکان ڕووداوێکی زۆر گرنگ بۆ ئەم ساڵەی ١٧٥٧ دەگەڕێننەوە: ڕوسۆ وای دادەنا، کە لە لایەن "دوژمنان"ـەوە ئابلۆقەی درابێ. واتا نەخۆشییە کوشندەکەی، پارانۆیا، لەم ساڵەدا سەری هەڵداوە. ڕوسۆ لەم کاتە بەدوواوە هەست دەکات، "لە لایەن پیلانگێڕی نهێنی و هەلبازانەوە" ئابلۆقە دراوە؛ تەنانەت لەنێو دەردوێناکانیدا وا پێشبینی دەکات، کە تێڕێزی هاوسەری، مەدام دێ پینێ، دیدەرۆ، فۆن گریم، ئینجا ڤۆلتێر لەو ژنێڤە دوورەوە، "دوژمنی" ئەون، بە "مرۆڤێکی دۆڕاو و بێچارەی" دادەنێن، تەنانەت "خۆشی لەوە" دەبینن، کە "بەیەکجاری لەناوی بەرن"! ئەمەش زەوقێکی ژانبەخشە بۆ ڕوسۆیەکی پڕئەندێشە. [٣٢]

ئەم نەخۆشییە لە کۆتایی ژیانیدا بە شێوەیەك تین دەسێنێ، کە وای لێدەکات لە ترسی ڕاونان خۆی لەسەر کورسییەکەی بە کلیلی تایبەتی قفڵ بدات.

پێش ئەوەی ڕوسۆ بە پاریس بگات، نزیکەی سیی ساڵ ژیانی ئازاد و بەرەڵایی بەسەر بردبوو. بەڵام ئێستا لە پاریس ئەم رابووردووەی، کە تەوەنێکی چنراوە و لە منداڵی و ساڵەکانی گەنجێتیی ئەو پێکهاتووە، دەخزێتە نێو ئاسۆیەکی لێڵەوە. ئەم کاتانەی ڕابووردوو دەبن بە یادوەری و تاسە، بەڵام تاسەیەکی ئەوتۆ، کە

هەتا تەمەنی پیرێتی ناخی جێناهێڵێ. ئەوەی ڕوسۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ سویسرای وڵاتی، تاکە هەستێکە سەبارەت بەوە، کە ئەو لەوێ، تەنیا لەوێ، خاوەنی ژیانێک بوو وەك "یەکێتی"یەکی ڕاستەقینە، وەك "سەرجەمێکی نەشکاو". ئەو دەمە هێشتا پچڕانێك لە نێوان داواکارییەکانی جیهان و داواکارییەکانی مندا نەهاتبووە ئاراوە، هێشتا هێزی هەست و ئەندێشە سنووره سەخت و دژوارەکانی لەنێو ڕوودانگەی شتەکاندا نەبینی بوو. بەڵام پەیوەست بەمەوە هوشیاری ڕوسۆ خۆیشی ئەو دوو جیهانەی من و شتەکانی بەتەواوی لە یەك جیا نەکردبۆوە. جیهانی منداڵی و گەنجێتی برێتی بوو لە تەوەنێکی چنراو لە خەو و ڕوودانگە، لە ئەزموون و وێنا. "ڕیالترین" و پڕناوەرۆکترین ساتە بەدیهاتووەکانی ئەو ساتانەن، کە کاتێك ئەو بۆ نێو ژیانی خەو و خەیاڵ و خۆزگە ڕۆدەچێ، ژیانێك، کە هەرچی ڕوودانگە لە نێویدا هەیە بیرچۆتەوە. بە چەندین هەفتە و بەبێ ئامانج دەگەڕێ و هەمیشە لە نوێوە ئەم شادمانییە هەستییەی لەنێو گەڕانی ئازاددا ئەزموون دەکاتەوە. بەڵام لەو ساتە بەدواوە، کە پێ دەنێتە پاریسەوە، ئەم جیهانە نامێنێ. لێرە لە پاریس شتەکان و جیهان بە شێوەیەکی دی ڕێکخراون؛ لێرە بە ڕێکخراوێك دەگات، کە ڕێ بە هەڵەشەیی خۆیی نادات: ڕۆژگار بەنێو ژمارەیەك کاردا بەسەر دەبرێ و بەهۆی ئەو کارانەشەوە ڕێکخستنێکی تایبەتیی پێدراوە. (٣٣)

پاریسی ئەو سەردەمە لوتکەی "کولتووری کۆشك" بوو، ڕەوشتی ڕاستەقینەی ئەم جۆرە کولتوورەش برێتییە لە ڕێزگرتنی ڕۆتینی، کە بە هەموو غەریبێك دەدرێ. بەڵام هەر ئەم ڕێزگرتنە ڕۆتینیەیە کە ڕوسۆ بریندار دەکات و دەسڵەمێنێتەوە. چونکە هەمیشە پتر بناغەی ئەم ڕێزگرتنەی بۆ دەردەکەوێ. هەمیشە ڕوونتر دەبینێ، کە ئەم شێوازەی پەیوەندی هیچ "لکاندنێك"ی کەسی ناناسێ. ڕوسۆ ئەم کێشەیە لە "ئێلویزی نوێ"دا ڕوونتر دەر دەبڕێ: چۆن دەشێ



کەسێك لە یەکەم ساتەوە ببێ بە دۆستی مرۆڤێك، کە پێشتر هەرگیز نەی بینیوە؟ گرنگیپێدانێکی ڕاستەقینەی مرۆڤپەروەری، بەخشینی دەروونێکی ڕەسەن و ئازاد، ئەمانەن کە دەبن بەهۆی دروستبوونی زمانێکی جیا لە هەموو ئەو ڕێزنیشاندانە سەرزارەکیانەی نەرێتی جیهانی مەزن داوایان دەکات.

ڕوسۆ هاتە نێو ئەم کۆمەڵگایەوە و پاشان کینی لێ هەڵدەگرێ، چونکە نایەوێ نیوەی سەر بە خۆی و نیوەکەی دیکەی سەر بە کۆمەڵگا بێ. بۆیە دەیەوێ بگەڕێتەوە. بەڵام بۆ کوێ؟ لە هەڵوێستی دوژمنانەیەوە بەرانبەر کۆمەڵگا، لە شێوازێکی خۆجۆری هزرین و هەستکردنەوە، لە تینوێتییەکەوە بۆ هەڤاڵێتی، کە نەی دەتوانی بیشکێنێ، چونکە کەسی نەدەدۆزییەوە هەمان تێگەیشتنی ئەوی لەسەر هەڤاڵێتی هەبێ، لە ئەمانەوە ڕوسۆ بە زانینێك دەگات سەبارەت بەوەی، کە "غەریبێکە" لەنێو هەموو مرۆڤایەتیدا. هەموو گرفتەکانیساڵانی داهاتووی ژیانی دەبن بە پاڵهێزێك بۆ پەرەدان بەم هەستەی، هەتا لە کۆتاییدا تووشی ترسێکی ڕاستەقینە لە هەموو مرۆڤ دەبێ، هەروەها هەستێکیش لە لای سەر هەڵدەدات، کە گوایە لەسەر ئەم زەمینە تەنها بە خۆیەوە بەندە. ڕوسۆ لە خۆی دەپرسێ: بۆچی ناتوانێ لەنێو مرۆڤاندا بژی؟ ئایا هەوڵ دەدات ئەو جێگەیەی لەنێو کۆمەڵگادا پێ بدرێ، کە بەڕاستی هینی ئەوە؟ ڕوسۆ دەبێژێ: نەخێر. بەڵام خۆ لە لایەکی دیکەوە هەموو خۆشیان دەوێ و لێی نزیك دەکەونەوە، کەچی ئەمیش خۆیەتی کە دەیان گەڕێنێتەوە. کەواتە هۆکەی چییە؟ ڕوسۆ دەبێژێ:

لە ناخمدا تاسەیەکی نەشیاوی ساتارکردن بۆ ئازادی هەست پێ دەکەم، لەپاڵ ئەم هەستەشدا هەوڵی بەڕێزبوون و بەختیاری جێگەی نابێتەوە. من ئەو کاتە لەنێو مرۆڤاندا بەختیارم، گەر لە ناخەوە ئازاد بم و پێویستیم پێیان نەبێ. مرۆڤ نابێ لە ناخی خۆی دوور بکەوێتەوە، بەڵکو دەبێ هەمیشە ڕوو بکاتە

خۆی. هەموو شتێك لە کۆتاییدا پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە. دەروون دەبێ خۆی لە شتەکان ئازاد بکات. ئەو کەسەی باوەڕ دەکات، کە ئەوانی دی خاوەنی دەروونێکی تەنگ و داخراون، دەبێ پشتیان تێ بکات و لەنێو تەنیایدا بۆ لای خۆی بگەڕێتەوە. پاشان هیچ شتێکی دەرەوەی دەروون ڕەزامەندی ناکات. دەروون چیدی لەسەر زەمین خۆراکی نادۆزێتەوە و تەنها بە توخمی خۆی دەژی. بەختیاریمان بەندە بە باری ئارامی دەروونەوە و بەسەر تاکە هەستی سەربەخۆدا شیتەڵ ناکرێتەوە. ئەو بەختیارییەی خۆی لەنێو دەروونەدا بۆ جۆشێك دەتوێنێتەوە، کە لە دەرەوە دەروون دەبزوێنێ و تەنها بۆ ساتێك لێکەوتی دەکات، بەختیارییەکی ڕووکەشە نەك بەختیاریی دەروون. بەڵام گەر دەروون بەتەنیا لەگەڵ خۆیدا بوو، ئەوسا لەنێو خۆیدا، لەنێو گەردووندا، بەختیاری دەدۆزێتەوە، لەنێو سەرجەم لێرەبوون و دەبوونەکاندا، لەنێو سەرجەم جوانیدا، کە لە جیهاندا لێی دەڕوانێ و پاشان لەنێو جیهانی ئەندێشەیدا خەونی پێوە دەبینێ. ئێستا دەروون ئەو شتانە دروست دەکات، کە تاسەی دەکردن. خۆزگەکانی دەبن بە پێوانەی شادییەکانی. دەروون ئێستا خۆی دەداتە دەست تواندنەوە لەنێو گەردووندا، خۆی دەداتە دەستی بەخشین بە خەونەکانی. ([٣٤])

ڕوسۆ بە نەخۆشی بۆ نێو شارۆچکەی مۆمۆرێنسی دەگوێزێتەوە. لێرە ساڵی ١٧٥٨ ڕۆمانی "ئێلویزی نوێ" بەنێو نەخۆشیی درێژخایەندا تەواو دەکات، کە ساڵی ١٧٦١ بڵاو دەبێتەوە و ڕوسۆ بەهۆیەوە دەستکەوتێکی چاکی دەبێ. "ئێلویزی نوێ" هەتا ساڵی ١٨٠٠ سەد جار بەپێی مۆڵەتی یاسایی لەچاپ دەدرێتەوە، ئەمە جگە لە چاپی قاچاغ.



"ئێلویزی نوێ" ڕۆمانی هەستە، ئەمەش لە ئەدەبدا دیاردەیەکی نوێ بوو. هەتا کاتی ئەم ڕۆمانە ڕووی نەدا بوو، کەسێك بەو ئاشکراییە ناخی خۆی نیشانی خوێنەر بدات. بۆ ئەو سەردەمە هیچ شتێك هێندە سەرنجڕاکێش نەبوو وەك ئاشکرابوونی دەروونی مرۆڤ لە بەردەم کەسانی دیکەدا. لەکاتی ئەم ڕۆمانەی ڕوسۆوە سەروەریی ئەدەبی سەبژێکتیڤی سەرچاوە دەگرێ، کەسانێکی زۆر "خۆ" ئاشکرا دەکەن، "دەروونی ناسك" نیشان دەدەن، کە چۆن بە ئاشکرا لەنێو تراژیدیدا مەلە دەکات. ئەم دیاردەیە هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە. بەسۆزی دەبێ بە مۆدە، ئەمەش نەك تەنها لە فەڕەنسا، بەڵکو هەروەها لە ئینگلاند و ئەڵمانیاش. بەم شێوەیە مۆدەی کلاسیکییانەی ڕێکخستن و ئەقڵ و فۆرم بەرەو نەمان دەچن و دەسەڵاتی "فەیلەسوفەکان" لە کۆتایی نزیك دەکەوێتەوە.

"ئێلویزی نوێ" ڕۆمانێکە لە شێوەی نامەگۆڕینەوە لە نێوان فیگورەکاندا، بەڵام ڕۆمانێکی سەرتاسەری نییە. ڕوسۆ ناوبەناو بە دارشتنی کێشەی زانستی لەسەر بابەتی جیاواز هەڵدەستێ، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ناوەرۆکی چیرۆکەکەوە نییە، بۆ نموونە لەسەر موزیکی ئیتاڵی و فەڕەنسی، کیژانی پاریس، کشتیاری و باخچەسازی، پەروەردەی منداڵ، دووێل (بەرانبەرێن) و خۆکوشتن. بەڵام لە ناوەرۆکی ڕۆمانەکەدا بەتایبەتی کێشەی وەرگرتن و هەڵاتن، کە بابەتێکی گشتییە لە ناخی سەرجەم بەرهەمی ڕوسۆدا، خۆی دەنوێنێ. "ئێلویز" پڕە لە جیابوونەوە و گەڕانەوە، ئاشتکردنەوە و ڕۆشناییدان بە گومانی نارەوا و تێگەیشتنی هەڵە لە یەکتری. بەڵام ئەوەی بۆ خوێنەری سەدەی هەژدەیەم زۆر سەرنجڕاکێش بوو، هێنانی سروشتە بۆ نێو ژیانی خۆشەویستیی پاڵەوانەکان. لە بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەدا، نامەی بیستوسێ، "سان پڕو" وەسفی ناوچەی ڤالیز بۆ "ژولیێ" دەکات: ناوچەیەکی ئازاد لە "پەچە". بەڵام ئەوە لە ڕاستیدا جیهانێکی "دیکە"یە لە فۆرمێکی جادوییدا، کە چاوی ڕوسۆ لێی دەڕوانێ:

"(...) نامەوێ باسی گەشت و سەرنجەکانمت بۆ بگێڕمەوە (...)، بۆ من هێندە بەسە، لەگەڵ تۆدا دەربارەی دڵم بدوێم (...). کاتێك بۆ گەشتەکەم کەوتمە ڕێ، خەمبار بووم بە هۆی خەمەکانمەوە، بەڵام شادمانیی تۆ دڵخۆشیی دەدامەوە (...). لەسەرخۆ بەسەر تولەڕێیەکی باریکدا سەردەکەوتم (...) و دەم ویست لەتەك لێشاوی هزرمدا کات بەسەر بەرم، کەچی بەردەوام سەرنجێکی چاوەڕواننەکراو بۆ نێو جیهان بێداری دەکردمەوە. جارێك کەڤری مەزن بەسەر سەرمەوە هەڵچوو بوون، جارێك تاڤگەی ئاو بە تەمی هاژەی لێم دەپرژا، جارێك لە پاڵمەوە گۆمێکی بێبناغە ڕاشکا بوو و چاو نەی دەوێرا قووڵاییەکەی بپشکنێ (...). تێکەڵێکی سەیر لە سروشتی خۆڕسك و ڕێکخراو (...). ئەم ناوچە سەیرانە تەنها بە کاری مرۆڤ ئاوها دژ بە یەك هۆشسام نەکراون. ئاوهای دەنواند، سروشت خۆیشی خۆزگەی کرداری نەسازی لەگەڵ خۆیدا هەبوو (...): دەمەو بەیانیانی بەهار گوڵ دەبینیت، دەمەو نیوەڕوانی پاییز میوە، دەمەو باکوری زستان بەفر. سروشت کەژەکانی ساڵی لە یەك سات و هەموو جۆری ناوچەکانی لە یەك شوێندا یەکخستبوو (...). یەکەم ڕۆژ ئەم ناسکییەی گۆڕینەکانم بۆ ئارامیی ناخم گەڕاندەوە و وام هەست دەکرد کە لە نوێوە دەپشکوێ. هۆشسام بووم بە دەسەڵاتی شتی بێهەست بەسەر بەهێزترین سۆزی مرۆڤدا، بۆیە ئیتر کینم لە فەلسەفە هەڵگرت. فەلسەفە هێندەی شتە بێدەروونەکان توانای بەسەر هەستی ئێمەدا ناشکێتەوە. بە درێژایی شەو ئارامی ناخی تەنیبووم، بەڵام کاتێك ئارامییەکەم بۆ ڕۆژی داهاتوو پەرەی سەند، گەیشتم بە بڕیارێك، کە دەبێ هۆیەکی دیکەی هەبێ و من هێشتا پێم نەزانیبێ. لەم ڕۆژەدا بەسەر هەندێك چیای نزمدا سەرکەوتم، لوتکەکانیانم بڕی و گەیشتم بە بڵندترین چیاکانی نزیکم. دوای بزربوونم لەنێو پەڵەهەورەکاندا بە ناوچەیەکی سەیر گەیشتم، کە مرۆڤ بەهاوین هەورەگرمە و بۆران لەژێر خۆیدا



بەدی دەکات: وێنەیەکی مەزنی دەروونی دانا، کە سەروێنەی تەنها لە شوێنی وەرگرتنی ئەو وێنە هەستییە خۆیدا دەبینرێ. ئێستا لەنێو خاوێنیی هەوادا دەبزوام و لە ئەمدا هۆی گۆڕینی باری دەروونم و هاتنەوەی ئاشتیی بزربووم ئاشکرا کرد (...). گەر سەرجەم تۆماری ناخیمت لەسەر شتەکان بۆ بگێڕمەوە، گەر پێشبینیی بکەیت، ئەوسا بە تێگەیشتێك دەربارەی ناخی شادمانی من دەگەیت. بهزرێ سەبارەت بە گۆڕین و مەزنی و جوانیی هەزار بەزمی شایانی هۆشسامی، بهزرێ سەبارەت بەو شادمانییە، کە لە دەرەوەی خۆتدا هیچی دی جگە لە بابەتی نوێ، لە مەلی غەریب، ڕووەکی سەیرو نەدیو، نەبینیت، ئینجا هەتا ڕادەیەك هەست بە سروشتێکی دی بکەیت و خۆت لەنێو جیهانێکی دیکەدا ببینیتەوە. هەموو ئەمانە تێکەڵێکی سەیر بە چاو دەبەخشن، تێکەڵێك، کە بە تەنکیی هەوا جوانتر دەبێ. هەوا ڕەنگەکان ژیندارتر و سیماکان دیارتر دەخات، هەموو پنتێکی لێڕوانین نزیکتر دەخاتەوە؛ دوورییەکان نزیکتر دەنوێنن وەك لەسەر تەختایی، کاتیك ئەستووریی هەوا بە پەچەیەك ڕووی زەمینی پۆشیوە؛ ئاسۆ بابەتی زۆرتر لە شیاوی پێکان بە چاوی مرۆڤ دەبەخشێ. بە کورتی، ئەم بەزمە شتێکی جادوویی، سەرسروشتی، دەگرێتە خۆ و گەشکە بە هۆش و زێنزی مرۆڤ دەدات، کە ئیتر هەموو شتێکی لەبیر دەچێتەوە، تەنانەت خۆی لەبیر دەچێتەوە و نازانێ لە کوێیە ...". ([٣٥])

ڕوسۆ لە "ئێلویزی نوێ"دا، بەڕێی ڕاڤەی دیمەنی دەریاچە و چیاکانی سویسراوە، ڕاکێشەریی سروشت نیشانی خوێنەر دەدات. لە بنەڕەتدا هەتا ئەو دەمە هێندە گرنگی بە سروشت نەدرا بوو. بەڵام ڕوسۆی پیاسەکەر ئێستا بۆ یەکەم جار هەستی مرۆڤی سەردەم بۆ جوانی و خۆجۆریی وڵاتەکەی بێدار دەکاتەوە، بێگومان سەرەتا لەنێو ڕۆشنبیرە ئەدەبییەکاندا. ڕوسۆ دەبێ بە ڕابەری گەڕیدەیی. ڤۆلڤگانگ فۆن ڤارتبورگ لە کتێبی "مێژووی سویسرا"دا دەنووسێ:

"هیچ کەسێك ئەو ڕۆڵەی ڕوسۆی نەبینیوە بۆ ئەوەی چیاکانی سویسرا بکات بە بابەتی هۆشسامبوونی ئەوروپییەکان بۆ سروشت. ئەو دەمە لە جانتای گەڕیدەکاندا، کە بۆ سویسرا دەهاتن، نەخشەی گەشت نەبوو، بەڵکو ڕۆمانی "ئێلویزی نوێ"ی ڕوسۆ. ئەوە ڕوسۆ بوو، کە بانگەوازێکی بۆ ،،گەڕانەوە بۆ سروشت،، دا و نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەی گرتەوە". ([٣٦])

پێنج ساڵی مۆمۆڕێنسی بەبەرهەمترین قۆناغی ژیانی ڕوسۆ دەبێ. ڕوسۆ ناوبەناو دەربارەی بابەتی جیاواز دەنووسێ: ڕۆمانە پەروەردەییەکەی بە ناونیشانی "ئێمیل"، یان تیۆرییە سیاسییەکەی بە ناونیشانی "کۆنترا سۆسیال" (پەیمانی کۆمەڵایەتی). ڕوسۆ "ئێمیل" بە گرنگترین بەرهەمی خۆی دادەنێ. "ئێمیل" تێکەڵێکە لە ڕۆمان و داڕشتنی فەلسەفییانەی جیهانبینیی نووسەر، سیمای یوتۆپیایەکی پەروەردەیی دەگرێتە خۆ؛ بەگشتی برێتییە لە داواکاری بۆ پەروەردەی ئازادی منداڵ لە دۆگمی ئایین، هەر بۆیە کاریگەرییەکی زۆر نێگەتیڤی دەبێ. ڕوسۆ لە هەمان ساڵانی ئەم نووسینەدا لە "کۆنترا سۆسیال"دا کار دەکات و ساڵی ١٧٦٠/٦١ بە دوا فۆرمی دەگات. "کۆنترا سۆسیال" برێتییە لە خەریکبوونێکی تیۆرییانە لەتەك کێشەی دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسیدا بەپێی پەیمان. ڕوسۆ ئەم بەرهەمەی وەك پاشکۆیەك بۆ ڕۆمانە پەروەردەییەکەی دادەنێ، یان لە نامەیەکدا دەنووسێ، کە "هەردووکیان پێکەوە سەرجەمێك پێکدەهێنن". ([٣٧]) لە ڕاستیدا خوێندنەوەی هەردووکیان بۆ تێگەیشتن لە جیهانبینیی ڕوسۆ پێویستە.

کاریگەریی نێگەتیڤی "ئێمیل" دەبێ بە هۆیەك، کە "کۆنترا سۆسیال" بەساردی لێبڕوانرێ و هاوکات تەنها لە نێوەندێکی تایبەتیدا بناسرێ. ساڵی ١٧٦٢ پەرلەمانی پاریس بڕیاری یاساغکردنی "ئێمیل" دەردەکات و هەرچی ژمارەیەکی



بەردەست بکەوێ دەسوتێنرێ. هاوکات دەسەڵاتدارانی ژنێڤ لاسایی فەڕەنسییەکان دەکەنەوە و بڕیار بۆ سووتاندنی هەردوو نووسینەکە دەردەکەن. بەڵام کێشەکە بەم سوتاندنانەی کتێبەکانی کۆتایی نایەت، بەڵکو ئێستا لە پەرلەمانی پاریس داوای گرتنی ڕوسۆ دەکرێ، ئەمیش سەرەتا دەیەوێ بچێتە بەردەم دادگا و بەرگری لە تێڕوانینەکانی خۆی سەبارەت بە ئایین بکات، بەڵام دۆستەکانی لەم مەبەستەی پەشیمانی دەکەنەوە. ڕوسۆ ١٧٦٢/٦/٩ مۆمۆڕێنسی جێ دەهێڵێ. بەڵام ئێستا پارانۆیاکەی پتر تین دەسێنێ. ڕوسۆ ئاوها بۆ کێشەکە دەچێ، کە گوایە "پیلانێکی هێزی نهێنی" و "سیخوڕە بەکرێگیراوەکانی" لە دژی ئەو دوو کتێبەی جووڵاونەتەوە. بێگومان گەر لە ڕاونانی بەردەوامی ڕوسۆ و ئاوارەیی ساڵانی ئاییندەی بڕوانین، ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە پارانۆیاکەی بناغەیەکی ڕیالی هەبووە.

ڕوسۆ هانا بۆ ناوچەی نوشێتێل دەبات، کە لە ساڵی ١٧٠٧ بە دوواوە سەر بە پرۆیسن بوو. پارێزگاری نوشێتێل لۆردێکی سکۆتلەندی بوو بە ناوی جۆرج کایت، کە لە وڵاتەکەی خۆی دەرکرا بوو و ئێستاش هاتبووە خزمەتی پاشای پرۆیسنەوە. جۆرج کایت بە خۆشییەوە نووسینەکانی ڕوسۆی دەخوێندەوە و یەکێك بوو لە نەرمترین هاوڕێیانی فریدریشی پاشای پرۆیسن، کە تەنانەت بە هێرشە ڕاستەوخۆکانی ڕوسۆ بۆ سەر دەسەڵاتی پاشایەتی سەغڵەت نەدەبوو. دوای ئەوەی ڕوسۆ لە پاریس و ژنێڤ ڕاو دەنرێ و بەم هۆیەشەوە دەبێ بە کەسێکی بێووڵات، کایت لای لێ دەکاتەوە و مافی هاووڵاتێتی نوشێتێلی پێدەدات. ڕوسۆش یەکسەر هەڵوێست وەردەگرێ و نامەیەك بۆ ژنێڤ، "بۆ یەکەم سیندیکوسی کۆماری ژنێڤ" بەناوی جاکۆپ فاڤرە دەنێرێ:

"بەرێز، تکاتان لێدەکەم بە ئەنجومەنی باڵا ڕابگەیەنن، کە من بۆ هەمیشە واز لە مافی هاووڵاتێتیی شار و کۆماری ژنێڤ دەهێنم. من تەنها ویستم

خزمەتێکی ناوی ژنێڤ بکەم، من هاووڵاتیەکانم لە کانگای دڵمەوە خۆش دەویست و هەرگیز ئەوەم لەیاد نەکردبوو، کە ئەوانیش خۆشەویستییانم پێ ببەخشن. بەڵام لەمە خراپتر بەدی نەدەهات. بێگومان بەرێز، کاتێك ئێستا نیشتیمانەکەم بۆ من بەووڵاتێکی بیانی دەبێ، ئەوا واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێ، کە گوایە من بە چاوێکی بێموبالات لێی دەڕوانم. من بەڕێی یادوەرییەکی ناخییەوە پێوەی بەند دەبم و هاوکات بە هیچ شێوەیەك ئەو لۆمانە لەیاد ناکەم، کە ئەو بۆ منی ناردوون. هیوادارم ژمارەی هاووڵاتیانی لە پەرەسەندندا بێ و هاوکات چاك و باشتر بن لە من". ([٣٨])

بەڵام لە نوشێتێل تەنها هۆشسامبووان بە نووسینەکانی بۆ لای نایەن، بەڵکو کەسانی دیکەش بەهۆی تێڕوانینەکانییەوە لە "ئێمیل"دا بۆ لای دێن و دەیانەوێ بیخەنەوە سەر ڕێی ڕاست، واتا ئیمانی بە ئایینی دیانی پێ بهێننەوە. بەتایبەتی قەشەکان پرۆپاگەندەیەکی زۆر لە دژی بڵاو دەکەنەوە و هەوڵ دەدەن بێئیمانییەکەی بۆ دانیشتوان بسەلمێنن، ئەمەیش بەتایبەتی بە ئەقڵی جوتیارەکاندا دەچێ. چونکە جوتیارەکانیش لە لایەنی خۆیانەوە بەهۆی دیاردەیەکی تایبەتییەوە گومانی گاورێتیی لێدەکەن: لەبەر ئەوەی زۆر جار مێزەچڕکە زۆری بۆ دەهێنێ، ئەوا ڕوسۆ ناچار دەبێ بەردەوام سۆندە هەڵ بگرێ. لەبەر ئەم هۆیە دەستێك پۆشاکی ئەرمەنی لەبەر دەکات، کە لە پاریس پۆشاکدروویەکی ئەرمەنی بۆی دووری بوو. ئەو پۆشاکەش برێتی بوو لە کەوایەکی درێژ و داخراو بە پشتێنێکی پان لەگەڵ کلێتەیەکی فەروودا. ڕوسۆ بەو شێوەیە غەریبەیەوە دەبێ بە مایەی پێکەنین و گاڵتەجاری. لە نامەیەکدا دەنووسێ: "لە گوند وەکو گورگ ڕاو دەنرێم". زۆر جار خەڵکان لەسەر شەقامەکان پێی ڕادەبوێرن، بە جنێو بانگ و بەردبارانی دەکەن. بەڵام دوای ئەوەی شەوێك بە بەرد پەنجەرەی ماڵەکەیان دەشکێنرێ، ئیتر لەتەك تێرێزدا



بڕیار دەدەن نوشێتێل جێ بهێڵن. ئیزگەی داهاتوویان برێتی دەبێ لە دورگەی سان پێتەری نێو دەریاچەی بیل. بەڵام پارێزگای بێرن پاش هەفتەیەك فەرمانێکی بۆ دەردەکات، کە دەبێ لە ماوەی بیستوچوار سەئاتدا ئەم ناوچەیەی کانتۆنەکەی جێ بهێڵێ.

ڕوسۆ ناچار دەبێ بەدەم نەخۆشی و تایەکی گەرمەوە بۆ شتراسبورگی پایتەختی ئێلزاسی فەڕەنسی بڕوات، تاکو لێرەوە پەیوەندی بە دۆستەکانییەوە بکات. ئەم دۆستانەش هەموو میر و ئەریستۆکراتن، واتا ئەو دەوڵەمەندە دەسەڵاتدارانەن، کە ڕوسۆ بەردەوام هێرش دەکاتە سەریان. دۆستەکانی پاسپۆرتێکی بۆ پەیدا دەکەن و ئەمیش بۆ پاریس دەڕوات، هەتا لێرەوە بۆ ئێنگلاند هەڵبێ. فەیلەسوفی ئینگلیزی دەیڤد یوم پاڵهێزی ئەم پێشنیارە بوو، کە لەو ماوەیەدا بە سەردان بۆ پاریس هاتبوو. سەرەتای ١٧٦٦ هەردووکیان پێکەوە دەگەنە ئێنگلاند.

بەڵام کلیمای سارد و شێداری ئێنگلاند لە ڕووی تەندروستییەوە کاریگەرییەکی نێگەتیڤی لەسەر ڕوسۆ دەبێ، هاوکات ژاوەژاوی شاری لەندەن زۆر سەغڵەتی دەکات، بۆیە پاش ماوەیەك ناچار دەبێ بۆ گوندی ووتتۆن بگوێزێتەوە. بەڵام هێندە ناخایەنێ پەیوەندییەکەی نێوان ڕوسۆ و دەیڤد یوم سارد دەبێتەوە. هۆی ئەم ساردبوونەوەیەی پەیوەندییەکەشیان ڕوونە: جەنتڵمانێکی وەك دەیڤید یوم تاقەتی نەبوو بەردەوام هۆشی بۆ سکاڵا و کڕووزانەوەی ڕوسۆ لە دەستی نەگبەتییەکەی ڕابگرێ، بۆیە زوو لێی دەتەکێتەوە.

پارانۆیاکەی ڕوسۆ لە ئێنگلاند پتر تین دەسێنێ. لە ژمارەیەك ڕۆژنامەدا چەند هێرشێك لەدژی ئەو بڵاو دەکرێنەوە، ئەم بڵاوکردنەوانە دەی گەیەننە باوەڕێك، کە گوایە لێرەش دەستەیەك "پیلانگێر" لە دژی ئەو یەکیان گرتووە.

ڕوسۆ ئاوها وێنا دەکات، کە نامەکانی کۆنترۆڵ دەکرێن، "بەردەوام لەژێر چاودێریدایە و سیخوڕەکان لەسەر شەقامەکان بە شوێنییەوەن". ئێستا ڕوسۆ تەنانەت لە دەیڤد یوم دەکەوێتە گومانەوە و بەوە تاوانباری دەکات، کە گوایە لە "پیلانی تاریکی"دا بەشدارە. لە نامەیەکدا بۆ لۆرد کۆنوەی دەنووسێ: "نازانم بە چ مەبەستێك منیان بۆ ئێنگلاند هێنا، بەڵام بێگومانم ئەو مەبەستە لە ئارادایە (...). من لەوە تێ ناگەم، کە لەبەر چ هۆیەك بەڕێزترین و بەناوبانگترین پیاو خەریکی ئەوەیە، سەرجەمی نەتەوەیەك هان بدات بۆ ئەوەی تاکە کەسێك بە ئامرازی خۆی بکات. من لێرەدا تەنها سەرەنجامەکەی دەبینم، بەڵام هۆکەییم جارێ لە لا شارراوەیە، بۆیە بەردەوام ئازاری خۆم دەدەم هەتا ئەو هۆیە بدۆزمەوە". ([39])

دۆخی پسیکۆییی و جەستەیی ڕوسۆ بەردەوام خراپتر دەبێ، نەخۆشی و دەردوێنای زێنزی بواری نادەن، بۆیە بەهاری ١٧٦٧ بەناچاری ئێنگلاند جێ دەهێڵێ و بۆ فەڕەنسا دەگەڕێتەوە، لێرەش بەنێو فەڕەنسادا ماوەیەکی دیکەی بێئارامی بەسەر دەبات و دەبێ هەموو کات چاوەڕوانی گرتن بێ لە لایەن حکومەتی فەڕەنسییەوە. تێرێزی دەزگیرانی تاکە مرۆڤێکە، کە لەم ژیانەی ڕاونان و دەربەدەریدا بە شوێنییەوە دەبێ، ڕوسۆش ناچارە (یان ئاوها لە تێرێزی دەڕوانی؟) لە بەردەم کەسانی نەناسیاودا وەك "کارەکەر"ی خۆی بیناسێنێ.

بەڵام هێندە ناخایەنێ ڕوداوێکی دیکەی زۆر گرنگ لە ژیانی ڕوسۆدا ڕوو دەدات. ڕوسۆ ڕۆژی ٣٠ ئۆگوستی ١٧٦٨ لە بەردەم پارێزگاری بورگۆیندا تێرێز مارە دەکات! بەڵام تێرێز ئەو ژنە بوو، کە نزیکەی بیستوپێنج ساڵ وەکو خۆشەویست و کارەکەر لەگەڵ ڕوسۆدا ژیا بوو و پێنج منداڵی لە ئەو هێنابووە جیهانەوە، ڕوسۆش هەموو ئەم منداڵانەی لێ سەندبوون و ڕەوانەی بێکەسخانەی کردبوون!



ڕوسۆ لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا پتر لەتەك خۆیدا خەریك دەبێ. لە یەکەم ڕۆژی تاراوگەوە، وەك لاسایی ئۆگوستین، دەست بە نووسینی "کۆنفەسیۆنەکان" (الاعترافات) دەکات. ئەم نووسینە ئەمڕۆ وەك بەرهەمێکی خۆژیاننامەی جیهانی سەیر دەکرێ. بەرهەمی "کۆنفەسیۆنەکان" دوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمە سەرەکییەکانی و گەیشتن بە ناوبانگێکی جیهانی نووسراوە، ڕوسۆ لەم ساڵانەدا بەردەوام لە لایەن کڵێسە و دەوڵەتانەوە ڕاو دەنرا. نووسینی "کۆنفەسیۆنەکان" بەم وشانە سەرچاوە دەگرێ:

"من بە پرۆژەیەکی بێوێنە هەڵدەستم و هیچ کەسێك ناتوانێ لاسایی بکاتەوە. من دەمەوێ مرۆڤێك لەنێو سەرجەم سروشتی ڕاستەقینەیدا نیشانی هاوجۆرەکانی بدەم، ئەو مرۆڤەش خۆمم. من بەتەنیا. من لەنێو دڵمدا دەخوێنمەوە و لێرەشەوە مرۆڤ دەناسم. من وەك هیچ کەسێکی دی، کە هەتا ئێستا بینیومە، دروست نەبووم، تەنانەت دەوێرم بڵێم، من وەك هیچ زیندەوەرێك دروست نەبووم. جا گەر سروشت لەمەدا چاکی کردبێ یان خراپ (...)، ئەوا کاتێك دەردەکەوێ، کە مرۆڤ منی خوێندەوە. ڕۆژی قیامەت کەی دێ با بێ، من بەم کتێبەوە دەچمە بەردەم باڵاترین دادگەر و بەدەنگی بڵند پێی دەڵێم: ،،فەرموو، ببینە، من ئاوها ڕەفتارم نواندووە و لێهزریوم! من ئاوها بووم! چاك و خراپم بە هەمان ڕاستگۆیی گێڕاوەتەوە. هیچ شتێکم نەشاردۆتەوە و هیچی چاکم پێوە نەناوە (...)، من خۆم چۆن بووم، خۆیشمم ئاوها نیشان داوە: سووك و ڕسوا، گەر ئاوها بووبم، چاك و بەجەرگ و مەزن، گەر ئەمیان بووبم (...). سروشتی ئەزەلی! پۆلی لەژمارەنەهاتووی هاوجۆرەکەمم لە دەور کۆ بکەرەوە، با کۆنفەسیۆنەکانم ببیستێ، ئینجا با لەسەر بێکەرامەتیم سکاڵا بکات و لەسەر ساتەکانی تەنگانەشم سوور هەڵبگەڕێ، با هەر یەکەیان لە بەردەم

خاوەنشکۆتدا ناخی خۆی بەهەمان ڕاستگۆیی من هەڵبداتەوە و ئینجا بوێرێ بڵێ: من چاکترم لەو کەسەی ئەویا،". ([40])

ڕوسۆ بە "کۆنفەسیۆنەکانی"، واتا بە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیان و درکاندنی خۆ و ڕەفتارە شازەکانی، باوەڕ دەکات خۆی هەڵدابێتەوە. بەڵام ئەو بۆی نالوێ، ڕەفتارە شازەکانی "وەك دەربڕینی کایە تاریکەکانی پێزانین و ویستی خۆی ببینێ". بۆ ئەو هێندە بەسە، کە ڕەفتارە نائاساییەکانی وەك نیوەی خۆی دابنێ و بییان گێڕێتەوە، ئیتر هەروەك بەم شێوەیە نهێنییەکانیان ئاشکرا بکات. بەڵام ڕوسۆ هەندێك جار هەست بە لێڵبوونی پێزانینی دەکات: "هۆ بزوێنەرە ڕاستەقینە و سەرچاوەییەکانی زۆربەی ڕەفتارم بەتەواوی ڕوون نین لە لام، کەچی پێشتر وام هەست دەکرد دەیانزانم ". کەچی سەرباری ئەمەیش کەلێنەکانی یادوەریی نایهەژێنن. ئەوەی لەیادی چۆتەوە، بێواتایە و لەبەر ئەم هۆیەش شایانی گرنگیپێدان نییە. بۆیە گەشبینی ناخی دەتەنێ. ([41])

ڕوسۆ باوەڕ دەکات، "من" بتوانێ ڕاستیی خۆی دەربڕێ. بەڵام لەبەر ئەوەی بڕوای بە هاومرۆڤەکانی نەماوە، ئەوا بۆ ئەم مەبەستەی خۆڕاگەیاندن دەچێتە بەردەم خوا: ڕاستی و دادپەروەریی ڕاستەقینە تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا هەن. "دادگەری ئەزەلی" لەم ڕۆژەی دادگای مەزندا "بوون و بێگوناهی، جەوهەری ڕاستەقینە و نرخی مۆراليی ڕوسۆ" دیاری دەکات و "بە بەندەی دادگاییکراو بێگومانیەك" سەبارەت بەوە دەبەخشێ، کە "لێرەبوون و بێگوناهبوون هەمان واتایان هەیە". ([42])

کێشە سەرەکییەکەی ڕوسۆ لە کۆنفەسیۆنەکانیدا ئەوەیە، کە ئەو ناتوانێ جیاوازی لە نێوان خۆناسین (زانینی خۆ) و هەست-بەخۆ-کردندا ببینێ. "هەست ڕاستەوخۆ بڕیار بەسەر بێگوناهیی مندا دەدات. بەڵام هەستی ئاسان بەوە



ڕەزامەند نابێ، کە تەنها لە لای خۆی بێگومان بێ. ئەو هەستە دەبێ خۆی دەربڕێ، ڕاگەیاندنیشی دەربڕینە بە ووشە، کە بە هەمان شێوە (ی هەستی ئاسان) خۆجۆر و ئاسانە. خۆزگەکەی ڕوسۆش هەر ئەمە بوو، کە بە وشەیەکی کورت هەموو شتێك بڵێ و باوەڕ بە هاومرۆڤەکانی سەبارەت بە بێگوناهیی خۆی بهێنێ. هەر بۆیە زۆر جار زەلیلییەکەی بە شیڕە دەڕەوێنێتەوە: ،،من بێگوناهم،،، بەبێ ئەوەی بزانێ، خەڵکی گومان لە دەربڕینی هەڵبەستراو دەکەن و واش دەزانن فێڵێك لە پشتییەوە خۆی مەڵاس داوە". ([43])

پرسیاری "من کێم؟" کتوپڕە و لەناکاو سەر هەڵدەدات. ڕوسۆ ڕاستەوخۆ وەڵام دەداتەوە: "من هەست بە دڵم دەکەم". خۆناسین بۆ ڕوسۆی مرۆڤی هەست و سۆز گرفت نییە: "لەبەر ئەوەی من ژیانم لەگەڵ خۆمدا بەسەر دەبەم، ئەوا دەبێ خۆم بناسم". بەڵام ناوەرۆکی چالاکیی هەستکردن، کە بناغەی زانستی خۆیە، هەردەم جیاوازە. سەرەڕای ئەمە بارودۆخەکان چەند بگۆڕڕێن، ناڕاستیی ئەم چالاکییە ناسەلمێنرێ. چالاکیی هەست دەتوانێ خۆی هەتا بێدوایەکی نوێ بکاتەوە، بەڵام دەسەڵاتەکەی لە هەموو ساتێکدا هەر کامڵە و کارەکتەرێکی ڕزگارکەری هەیە. من بە یەك هەنگاو خۆی لە لا ئاشکرا دەبێ و خاوەنی خۆیەتی. لەو ساتەدا کە من خاوەنی خۆیەتی، هەموو ئەو شتانەی پێشتر دەربارەی خۆی دەیزانین یان باوەڕی دەکرد بییان زانێ، دەکەونە ژێر گومانەوە: وێنەکەی پێشووی سەبارەت بە ڕاستییەکەی خۆی ناکامڵ و ساویلکە بووە، بەڵام ئێستا ڕووناکی بەسەر ڕاستیدا هەڵدێ! بۆیە نووسینە خۆژیاننامەکانی ڕوسۆ شێوەی جیاواز دەگرنە خۆ. ڕوسۆ سەرەتا بۆ "دەربڕین" دەگرێ، هەروەك ئیتر لە "کۆنفەسیۆنەکان"دا هەموو شتێك بڵێ، بەڵام پاشان "خەوەکانی پیاسەکەرێکی تەنیا" دێن و هەموو شتێك لە نوێوە سەرچاوە دەگرێتەوە: "من کێم؟ دەبێ جارێ لەمە بکۆڵمەوە". هەتا چەند ڕوسۆ بەنێو خەیاڵەکانیدا ڕۆ

دەچێ و لێرەشەوە هەموو پەیوەندییەك لەتەك هاومرۆڤەکانیدا بزر دەکات، ئەوەندەش زانستی خودی خۆی لە لا ئاڵۆز دەبێ. (٤٤)

ڕوسۆ دوای "کونفەسیۆنەکان" خۆزگەیەکی لە ڕادەبەدەری بۆ ئارامی و نیشتەجێبوون دەبێ، بۆیە ساڵی ١٧٧٠ بۆ پاریس دەگەڕێتەوە، جا گەرچی فەرمانی گرتنی لە لایەن پەرلەمانەوە هێشتا نەکێشرابۆوە. بەڵام ڕوسۆ دەیزانی، گەر نووسەران توخنی سیاسەت نەکەون، ئەوا دادگای فەڕەنسی وازیان لێ دەهێنێ. بەم شێوەیە ئەو لە ڕوسۆیەکی شێتی ڕاستی و ڕەخنەگری دەسەڵاتدارانەوە دەبێ بە پیاوێکی شەکەت و کۆڵدەر. ئێستا لە پاریس بەدەگمەن دەچێتە قاوەخانە وساڵۆنەکان، هەروەها چیدی لەتەك دۆستانی دێرینیدا: دیدەرۆ، دالۆمبێرت، هۆلباخ، فۆن گریم، پەیوەندی دانامەزرێنێتەوە، چونکە تەنانەت بڕوای بە ئەوانیش نەمابوو. ئێستا ڕوسۆ پتر خەریکی لێتوێژینەوەی ڕووەك دەبێ و بۆ ئەم مەبەستە زوو زوو بۆ دەرەوەی پاریس دەڕوات. بەڵام ئەو هەرگیز ڕوسۆ نەدەبوو، کە بەتەواوی پشتی لە پرسیارە سیاسییەکان بکردایە. بێگومان لەسەر کێشە هەنووکەییەکانی فەڕەنسا هەڵوێست نیشان نادات، بەڵام بەجۆشەوە ڕەچاوی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی گەلانی دیکەی ئەورووپا دەکات: لەسەر دواکاریی خەباتگێڕێکی کۆرزیکی دەستوورێك بۆ گەلی کۆڕزیکا دەنووسێ، هەروەها لەسەر تکای ئەریستۆکراتێکی پۆلۆنی بە توێژینەوەیەك هەڵدەستێ بە ناونیشانی "چەند تێڕوانینێك دەربارەی حکومەتی پۆلۆنی".

هەردوو نووسینەکەی کۆتایی ژیانی بە ناونیشانی "ڕوسۆی دادگەری ژان-ژاك" و "خەوەکانی پیاسەکەرێکی تەنیا" نیشانەیەکن بۆ باری تێکچووی ئەو و منگرفتییەکەی، خوێنەر هاوکات بەڕوونی پەککەوتنی توانستی ئەو بۆ نووسین دەبینێ. دیالۆژەکانی "ڕوسۆی دادگەری ژان-ژاك" بەڵگەنامەیەکی خەمناکن



سەبارەت بە هۆشی گرفتاری ئەو بە دەردوێنای زێنزی. ڕوسۆ دوای ئەوەی دیالۆژەکان تەواو دەکات، دەستنووسەکەی دەخاتە نێو زەرفێکەوە، بە مەبەستی ئەوەی بیبات بۆ کلێسەی نۆتەردام و لە ئالتارەکەیدا دای بنێ. لەسەر زەرفەکە ئەم وشانە دەنووسێ: "ئەم سپاردەیە دەسپێرم بە خوا، بە پارێزەری چەوساوەکان، بە خوای دادپەروەری. من لە مرۆڤ جگە لە بوختان و درۆ و خیانەت چاوەڕوانی هیچی دی ناکەم. خوای ئەزەلی، هیوام بە تۆیە!". ڕوسۆی شڵەژاو ڕۆژێکی فێبریوەری ١٧٧٦ خۆی بە کلێسەی سەرەکیی پاریسدا دەکات، بەڵام ئەو ڕۆژە نێوی کلێسە هەتا ڕادەیەك بە شیشبەند داخرا بوو، بۆیە ڕوسۆ ناتوانێ بگاتە ئالتار و سپاردەکەی دابنێ. ئەو بەڵام لەم پێکگەیشتە ئاوها تێدەگات، کە گوایە خوا نایەوێ سپاردەکەی لێ وەربگرێ و لەبەر ئەم هۆیەش هەرگیز جارێکی دی بۆ نۆتەردام ناچێتەوە. (٤٥)

هەروەها نووسینی "خەوەکانی پیاسەکەرێکی تەنیا" پتر باری تێکچووی ڕوسۆ نیشان دەدات، پیاوێکی هیلاك و پیر و نەخۆش، کە هەمیشە پتر دەکڕووزێتەوە و سکاڵا دەکات: "من تەنیام لەسەر زەمین، باوکم نیە، برام نیە، هەڤاڵم نیە، کۆمەڵگام نیە، هیچ شتێك جگە لە خۆم. بەم شێوەیە بەڕێزترین و خۆشەویسترین کەس بە پەیمانی هاومرۆڤەکانی لە نێوەندی کۆمەڵ دەرپەڕێنرا. ئێستاش دوای ئەم هەموو نەگبەتییە چی ماوە لێی بترسم؟ بۆ من لەسەر زەمین هەموو شتێك کۆتایی هات و تازە هیچ کەس ناتوانێ چاکەیەك یان خراپەیەکم لەگەڵدا بکات". (٤٦)

بەڵام ڕوسۆی تەنیاکەوتوو ئێستا هەمیشە پتر خۆی دەداتە دەست سروشتی سەرچاوەیی. لە "حەوتەم پیاسەدا" هارمۆنییەکی سەرنجڕاکێش لەنێو سروشتدا ڕوون دەکاتەوە، هارمۆنییەك کە توانستێکی ناخیی بۆ ئەوە هەیە مرۆڤ لە نەخۆشی چاك بکاتەوە:

درەخت و ڕووەك خشڵی زەوین. هیچ شتێك خەمبارتر لە ڕوانینی زەوییەکی ڕووت نانوێنێ، کە تەنها بەرد و لم بە چاوی مرۆڤ دەبەخشێ. بەڵام گەر زەمین بە جوانیی سروشت، بە هاژەی چەم و خوێندنی مەل ژیندار بوو، ئەوسا لەنێو هارمۆنیی ئەو جیهانەدا بەزمێکی پڕژین و ئاگامەندییەکی سەیری پێدەبەخشێ، ئەمەیش تاکە بەزمێکە، کە هەرگیز چاو و دڵی ئەو شەکەت ناکات. دەروونی ڕوانەرێك چەند زێنزاوی بێ، ئەویش هێندە زۆر خۆی بەو هارمۆنییە دەبەخشێ. ئێستا زێنزەکانی بە خەوێکی شیرین و قووڵ مەست دەبن، بە چەشنێك کە ئیتر لەنێو بێسنووریی ئەو سیستەمە جوانەدا بزر دەبێ و هەست دەکات یەکانگیری بووە. ئێستا هەموو بابەتێکی لەبیر دەچێتەوە و تەنها لەنێو گەردووندا هەست دەکات و دەبینێ. ئەوە دەبێ چاوێکی تایبەتی بێ، کە بتوانێ هێزی وێنا و ئیدێکانی ئەو ڕابگرێ. ([47])

ژیانی پاریس بۆ ڕوسۆی پیر لە کۆتایی ژیانیدا هەمیشە پتر دەبێ بە مایەی بار و ئازار، بۆیە ١٧٧٨/٥/٢٠ بەپیر بانگکردنەکەی مارکی دو ژێرارداوە دەچێ، بۆ ئەوەی لە باکوری پاریس، لە ئێرمێنوڤیل، لەگەڵیدا لەسەر موڵکەکەی بژی.

ڕوسۆ ١٧٧٨/٧/٢ لەسەر دەستووری ڕۆژانی دیکە پیاسەی بەیانیانی بەنێو سروشتدا دەکات. ماوەیەکی کورت دوای خواردنی بەیانی لەتەك تێڕێزدا، ئازارێکی تیژ لەنێو سەر و لەشیدا هەڵدەستێ. ڕوسۆ کتوپڕ لەسەر کورسییەکەی بەر دەبێتەوە و چیدی نایەتەوە هۆش خۆی. یەکەم ڕۆژی دوای مردنی، پەیکەرتاشی بەناوبانگی پاریس، ژۆن-ئەنتوان ئودۆ، ماسکی-مردووی ڕوسۆ هەڵ دەکەنێ. سەرانی شۆرشی فەڕەنسی لە ١١ی ئۆکتۆبەری ١٧٩٤ تابوتەکەی دەگوێزنەوە بۆ "نزرگەی پیاوانی مەزنی فەڕەنسا" لە پاریس.

## بەشی دووەم: ئەنترۆپۆلۆژی

### ١- دارشتن

ڕوسۆ بە دارشتنی تێزەکەی لە دیسکورزی "هۆی نایەکسانی لە نێوان مرۆڤان"دا سەرجەمی سەردەمەکەی ڕادەچڵەکێنێ. ڕوسۆ لەم سەردەمە گەشبینەی ڕۆشناییەکاندا وێنەیەکی ئەوتۆی گۆڕانی مێژوویی مرۆڤ دەکێشێ، کە تەواو جیاوازە لە پێشبینییەکانی ئەو سەردەمە. گۆڕانی مێژوویی مرۆڤ لە لای ڕوسۆ برێتییە لە "دازنان"، ئینجا بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە ڕوون بکاتەوە، ئەوا پەنجە بۆ شێوەکانی مرۆڤبوون ڕادەکێشێ، تاکو نیشانی بدات، کە ئەم شێوانەی بوونی مرۆڤ مێژوویی و قۆناغدارن و لێرەشەوە مرۆڤ لە هەر قۆناغێکی جیادا سیمای تایبەتمەندی بەو قۆناغە هەیە.

ڕوسۆ نایەوێ کێشەکانی مرۆڤی سەردەم لەنێو خودی ئەو سەردەمەوە ڕوون بکاتەوە، بەڵکو دەیەوێ لە کۆمەڵگای سەردەمەوە بۆ هەرە سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤ بگەڕێتەوە، ئەویش بەو مەبەستە، کە بە مرۆڤی سروشتیی "پەتی"، یان بە واتایەکی دی بە مرۆڤی " لەخۆدا یەك" و هێشتا "نامۆنەبوو" بگات. لەم ڕوانگەیەوە ڕوسۆ یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی "زانیننومای مافی سروشتی"، بۆ



نموونە هۆبس و لۆك. مێتۆدی ئەم فەیلەسوفانە لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکانیاندا ئەوە بوو، کە بۆ دۆخی سروشت پێش سەرهەڵدانی کۆمەڵگای سیاسی دەگەڕانەوە و سەرەتا خودی مرۆڤ و پەیوەندییە نێومرۆڤییەکانیان لەو دۆخەدا ڕوون دەکردەوە، تاکو کێشەی کۆمەڵگای سیاسی و چارەسەرەکانی نیشان بدەن.

لە ڕوانگەی ڕوسۆ، ئاوڕدانەوە لە ڕابوردووی دووری مرۆڤ تەنها بە هیپۆتێز دەشێ، ئەمەیش تەنها سروشتی شتەکان ڕوون دەکاتەوە نەك سەرچاوە ڕاستەقینەکانیان. ئایین فەرمان دەدات، کە "ئادەمیزاد" دەبێ باوەڕ بە کرداری خوا بهێنێ و دەربارەی نەپرسێ، واتا خوا مرۆڤی لە دۆخی سروشت دەرپەڕاندووە و هەر خۆیشی ئەو نایەکسانییەی نێوان مرۆڤانی ویستووە. بەڵام روسۆ بەوە بەرپەرچی ئەم فەرمانەی ئایین دەداتەوە، کە ئایین بۆی نیە ڕێگە لە توێژەرێك بگرێ، گەر هەوڵ بدات لە سروشتی مرۆڤ خۆیەوە بۆ مێژووی مرۆڤ بگەڕێ نەك هۆشرایەڵی دۆگمەکانی ئایین بێ.

ڕوسۆ سەرەتا بە جیاوازیکردنێك لە نێوان دوو شێوەی نایەکسانیدا هەڵدەستێ، تاکو لە پرسیارە کرۆکییەکەی هۆی نایەکسانیی لە نێوان مرۆڤاندا نزیکبکەوێتەوە. شێوەی یەکەم برێتییە لە نایەکسانیی سروشتی یان فیزیکی، کە لە سروشتەوە گۆڕراوە و جۆرەکانی برێتین لە نایەکسانیی تەمەن، تەندروستی، هێزی لەش و توانستی دەروون. شێوەی دووەمیان برێتییە لە نایەکسانیی مۆرالی یان سیاسی و بەندە بە پەیمانێکی بێجڵەو و کوێرانەوە. دامەزراندنی ئەم شێوەیەی نایەکسانی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەزامەندیی مرۆڤ خۆی یان ملکەچکردنی بەزۆر و سیما ڕاستەقینەکەی برێتییە لە جیاوازیی ماف، ئەمەیش بەو ڕێیەوە دەسەپێنرێ، کە مرۆڤێك کەسانی دەوری بۆ هۆشرایەڵی ناچار دەکات، یان بە مافی دەوڵەمەندییەکەی هاومرۆڤەکانی بە کۆیلە دەکات.

ڕوونکردنەوەی شێوەی یەکەمی نایەکسانی لە لایەن ڕوسۆوە تەنها بۆ نیشاندانی بوونێتی لە سروشتەوە. پرسیاری نایەکسانیی ڕوو دەکاتە دیاریکردنی ئەو "سات"ـە، کە ماف جێی دەسەڵات دەگرێتەوە و سروشت دەکەوێتە ژێر ڕکێفی یاساوە. ئەو پرسیارە دەبێ هەروەها ئەو لایەنەش ڕوون بکاتەوە، کە لەبەر چ هۆیەك "بەهێزترەکان" (دەوڵەمەندەکان) بڕیار دەدەن خۆیان بخەنە خزمەتی لاوازەکانەوە و گەل بە بڵاوکردنەوەی هزری "پەیمانێکی بەختیاری" هەڵبخەڵەتێنن.

ڕوسۆ لە ئاوڕدانەوەیدا لە مرۆڤی سروشت بە ناتورێکی nature (سروشتێکی) ئیزۆلە دەگات، کە لەنێو دەستی سروشت خۆیەوە "پێگەیشتووە"، بەڵام بەبێ ئەوەی خاوەنی هیچ بەزەییەکی سەرسروشتی بێ و هێشتا ماوێتی ببێ بە مرۆڤ. ئەم سروشتە هیچ ئاگایەکی لە چاکە و خراپە، لە مۆراڵ و ئەقڵ و یاسا نییە، تەنانەت هاوجۆرەکەی خۆی ناناسێ، ئەویش چونکە خاوەنی ڕەمەکی کۆمەڵایەتی نییە. مرۆڤی سروشت ئاژەڵێکە لەنێو ئاژەڵەکانی دیکەدا.

ڕوسۆ بە ڕەوانبێژی ژیانی ئەو مرۆڤە ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن لەژێر درەختێکدا خۆی تێر دەکات و لەسەر کانییەك تینوێتی خۆی دەشکێنێ، هەروەها چۆن لەژێر هەمان درەختدا، کە تێری دەکات، شوێنی نووستن دەسازێنێ. سروشت جارێ لە سووڕی خۆبەرهەمهێنانەوەدایە. زەمین بە دارستانی بێسنوور داپۆشراوە، هەروەها تەنها خۆی زەخیرە و کونجی حەشاردان بۆ هەموو ئاژەڵێك پێك دەهێنێ.

بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیە تەنها ڕوو دەکاتە لایەنی فیزیکیی مرۆڤی سروشت. ڕوسۆ دوای ئەمە ڕوو دەکاتە لایەنی "مۆرالی"، یان ڕاستتر ببێژین، ڕوو دەکاتە بناغەی مۆراڵ: سروشت مرۆڤی داوەتە دەست "ڕەمەك" و ئەو مرۆڤە سەرەتا تەنها چالاکیی ئاژەڵیی هەیە، یان بە پوختی ببێژین، "ویستن و



نەویستن"، "حەز و ناحەز"، برێتین لە جوڵە سەرەتاییەکانی ناخی. بەڵام ئەم تێڕوانینەی ڕوسۆ هاوکات ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە سەرهەڵدانی ئەقڵ و گۆڕانی هزر لە لای مرۆڤ بەندن بە زێنزەکانییەوە. مرۆڤی سەرچاوەیی، وەك تاکێکی "ئازاد"، تەنها ویستی ناسینی ئەو شتانەی هەیە، کە دەیەوێ بییان چێژێ. بۆیە ئێستا ڕوسۆ ڕەخنەگرانە دەپرسێ، کە ئیتر دەبێ لەبەر چ هۆیەك ئەو ئیندیڤیدە (تاکە) نەترسە هەوڵی هزرین بدات! ڕەمەکە جیاکانی، کە هێشتا نەهەژێنراون، ڕوو دەکەنە تاکە هەستی لێرەبوونی (ئەکزیستێنسی) هەنووکەیی، بەبێ ئەوەی سەبارەت بە ئایندە بهزرێ، جا ئەو ئاییندەیە چەند لێوەی نزیك بێ.

چـــێژەکانی مرۆڤـــی سروشـــت لـــە پێداویـــستییەکانی تێناپـــەڕن، پێداویستییەکانیش برێتین لە خواردن و خواردنەوە، لە نووستن و جووتبون، کە بەئاسانی ساتار دەکرێن. بەڵام مرۆڤ ترسی لە ئازار و برسێتی هەیە، ئەمەش بێگومان نەك بەهۆی مەرگەوە، چونکە ئاژەڵ هەرگیز نازانێ کەی دەمرێ. مرۆڤ دوای دوورکەوتنەوە لە دۆخە ئاژەڵییەکان بە زانینی مەرگ و وەی دەگات.

مرۆڤی سروشت لە جەوهەرییەوە "چاك"ـە و هاوکات وەك ناتورێکی (سروشـــتێکی) ئـــازاد مـــۆتیڤێکی سروشتبەخـــشی هەیـــە، کـــە برێتییـــە لـــە خۆخۆشویستن (amour de soi). سروشت ئەم مۆتیڤەی بە مرۆڤ بۆ مسۆگەرکردنی خۆهێشتنەوە بەخشیوە. ڕەمەکی خۆخۆشویستن لە ڕوانگەی ڕوسۆ سیمایەکی باشی مرۆڤی سروشتە، چونکە بەهۆی ئەو ڕەمەکەوە هەمیشە خەریکی خۆیەتی و لێرەشەوە پاڵی پێوە دەنێ خۆی وەك ئیندیڤید بپارێزێ.

بەزەیی ڕەمەکێکی دیکەی سروشتییە و چ لە لای مرۆڤ و چ لە لای ئاژەڵ بەدی دەکرێ، بۆ نموونە لە لای ئەسپ. بەزەیی برێتییە لە "نەویستن ی مرۆڤ بۆ بینینی هاوجۆرەکەی لە ئازاردا" و بەمەش دەبێتە هۆی هێشتنەوەی ڕەگەزی مرۆڤ، چونکە سنوورێك بۆ خۆخۆشویستن دادەنێ و نایەڵێ کاریگەرییەکی

نالەباری هەبێ. ڕوسۆ بەزەیی لە دۆخی سروشتدا بەرانبەر ڕەوشت لە دۆخی کۆمەڵایەتیدا دادەنێ. لەبەرئەوەی بەزەیی تەنها ڕەمەکە، ئەوا مرۆڤ، بەبێ ئەوەی هێشتا هزرینی هەبێ، خێرا بە هانای هاوجۆرەکەیەوە دەچێ. بۆیە بە بڕوای ڕوسۆ هەموو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ لەم ڕەمەکە سروشتییەوە دەگۆڕرێن، ئەویش چونکە دەبێ مرۆڤپەروەری و نەرمی چ واتایەکیان هەبێ جگە لە بەزەییهاتنەوە بە لاوازێکدا یان تەنانەت بە خەتابارێکدا.

"خۆشەویستی" یەکێکە لەو ڕەمەکانەی، کە بەسەر هەموو بەربەستێکدا زاڵ دەبێ، لەبەر ئەم هۆیە دوور نییە کە ئەم ڕەمەکە نەبووایەتە پاڵهێزی تێکشکاندنی ڕەگەزی مرۆڤ، ئەویش چونکە مرۆڤ بەرێی خۆشەویستییەوە تاسەی مرۆڤێکی دی دەکات و لێرەشەوە سنووری خۆهێشتنەوە دەبڕێ. بەڵام ڕوسۆ لە حاڵەتی خۆشەویستیدا دوو لایەن دیاری دەکات: لایەنی جەستەیی و دەروونی، یان: ئەو ڕەمەکە گشتییە، کە ڕەگەزێك بۆ لای ڕەگەزەکەی دی دەبات، هەروەها مەیلێك، کە ئەم ڕەمەکە بە ئۆبژێکتێکی تایبەتییەوە بەند دەکات.

مرۆڤی سروشت لە ڕوانگەی ڕوسۆوە تەنها خۆشەویستیی جەستەیی دەناسی، بەڵام خۆشەویستیی دەروونی بە پێچەوانەوە هەستێکە کە لەتەك کولتووردا دێتە ئاراوە، واتا لەتەك ئەو خو و نەریتانەی کۆمەڵێك لەسەریان ڕێکدەکەوێ. ئەم جۆرەی خۆشەویستی بەندە بە تێگەیشتەکانی جوانی و پایەگا و بەراوردەوە.

یەکەم هەستی مرۆڤی سروشت بریێتییە لە هەستی لێرەبوون، یەکەم خەمیشی بۆ خۆهێشتنەوەیە. سروشت بەخشندەی شتە پێویستەکانێتی و ڕەمەك پاڵی پێوە دەنێ بەکاریان بهێنێ. ڕەمەکە جیاوازەکان پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن شێوەی جیاوازی لێرەبوون تاقی بکاتەوە، بەڵام لە نێو ئەم ڕەمەکانەدا تەنها ئارەزووی جووتبوون پاڵهێزە بۆ پەرەسەندنی ڕەگەزی مرۆڤ. بێگومان



سەرەتا کرداری ئارەزووی جوتبوون تەنها سەرەنجامێکی ئاژەڵییانەی کوێر بووە. هەر ئەوەندەی ئارەزووی دوو ڕەگەزە جووتبووەکە دادەمرکایەوە، ئیتر یەکتریان نەدەبینیەوە، یان منداڵەکەیان دایکی جێدەهێشت، دوای ئەوەی پێویستی پێی نەدەما.

ئەوسا ئەم ئاژەڵە ئاوها دەژیا. بەڵام گرفتێکی زۆر لە ڕەوتی گۆڕاندا سەرهەڵدەدەن و پێویستە نەهێڵرێن: درەختی بەرز هەن و بەرهەمەکانیان بەئاسانی دەستگیر نابن، بۆیە ئێستا ڕاهێنانی لەش زەروور دەبێ. ئاژەڵ هەن، کە بە هەمان بەرهەم دەژین و بەمەش ڕوو لە ژیانی ئەو دەکەن، بۆیە مرۆڤ فێری ڕاکردن و خۆئامادەکردن بۆ شەڕ دەبێ، لێرەشدا تەنها بەرد و لکی درەخت چەکە سەرەتاییەکانی پێکدەهێنن.

بە تەشەنەی ڕەگەزی مرۆڤ بەنێو جیهاندا گرفتەکانی مرۆڤ پەرە دەسێنن. ئەو زەوییانەی مرۆڤان لەسەریان دەژین و کەژەکانیساڵ دەبن بەهۆی ڕێکخستنی شێوازی جیای گوزەران. ساڵی نەهات، زستانی درێژخایەن و سارد، هاوینی گەرم و سووتێنەر، وزەی جیاوازی چالاکیی لەنێو مرۆڤاندا گۆڕان پێ دەدەن. مرۆڤان لە کەناری دەریا و ڕووبارەکاندا قولاپ دروست دەکەن و دەبن بە ماسیگر و ماسیخۆر؛ لە دارستانەکاندا تیروکەوان دروست دەکەن و دەبن بە ڕاوچی و شەڕانی؛ لە ناوچە ساردەکاندا دەکەونە بەخێوکردنی ئاژەڵ و بە پێستەکانیان خۆیان دەپۆشن، هەتا ئیتر جارێك برووسکەیەکی ئاگرهەڵگیرسێنەر ئاگریان پێدەناسێنێ و ئەوانیش بۆ خۆپاراستن لە سەرما بەکاری دەهێنن، پاشان فێری دەسوێژێك دەبن بۆ ئەوەی ئەو توخمە بپارێزن و سەرلەنوێ ئاگر هەڵبگیرسێننەوە.

پەرەسەندنی دۆزینەوەکانی مرۆڤ زۆر ئاسان دەیگەیەننە ئاستێك، کە بە تێگەیشتی جیاوازی پەیوەندی بگات. مرۆڤ لەکاتی بەراوردی ئەو تێگەیشتانە

لەتەك پێداویستییەكانی خۆیدا بەناچاری بۆ نێو شێوەیەكی هزرین دەخزێ و وەك ئامرازێك دەیخاتە گەڕ، تاكو شتی پێداویستییەكانی بۆ پاراستنی خۆی دەستگیر بكات. ئەم تێڕوانینە نوێیانە دەسەڵات بە مرۆڤان بەسەر ئاژەڵدا دەبەخشن، دەسەڵاتیان لە ئێستا بەدواوە دەكەوێتە پەرەسەندن، ئینجا دەخزێن بۆ نێو فێربوونی تەڵەنانەوە و "فێڵ" ی دیكە، هەتا پاشان لە كۆتاییدا دەگەن بە ئاستێك كە تێیدا دەبن بە وەستای بەخێوكردن.

بەڵام خزانی مرۆڤ بۆ نێو هزرین لەوەش قووڵتر بڕ دەكات: مرۆڤ فێر دەبێ لە خۆی بڕوانێ و بەمەش لە نێوان خۆی و جیهانی دەرەوەیدا میانەیەك دەهێنێتە گۆڕێ. ئێستا لە ناخیدا ئارەزووی "نازین" دەپشكوێ و خۆی وەك ڕەگەز لە سەرووی ئاژەڵەوە، لە ئاستێكی بەرزتردا، دادەنێ. مرۆڤ لێرەوە بۆ جیاوازیكردن لە نێوان ڕەگەزەكەی خۆیدا ئامادە دەبێ، چونكە تاكی مرۆڤ لەم ڕوانینەیدا بۆ دەرەوە هاوجۆرەكەی خۆیشی دەكەوێتە بەر چاو. بەم شێوەیە هاوڕێتمیی ژیان دەشكێ و مرۆڤ لەوە دەڕوانێ، كە پێشین هەرگیز نەی دەبینی.

ئەزموونە نوێكان "خۆزگەی لەشساغی" چێ دەكەن، ئەمەش تاكە پاڵهێزێكە بۆ جیاوازیكردن لە نێوان حاڵەتی جیاوازدا. لە لایەك بەرژەوەندیی گشتی هیوای لاكردنەوە لە یەكتری بە مرۆڤان دەبەخشێ، ئینجا هەموو پێكەوە لە ڕەوەیەكدا كۆ دەبنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ كەس بە كەسانی دیكەوە بەند بێ و هەروەها هەموویان هەتا ساتاركردنی پێداویستییەكە پێكەوە دەمێننەوە. بەڵام مرۆڤ لە لایەكی دی ناچار دەبێ كە بە هاوجۆرەكەی خۆی كەمبڕوا دەبێ، چونكە هەموو پێكەوە بۆ هەمان شت تێدەكۆشن و لێرەشدا هەر یەكە سوودی خۆی دەبینێ.

بێگومان ئەم گۆڕانانە زۆر درێژخایەنن و هەنگاوەكان هێواش دەنرێن، بەڵام مرۆڤ بەتوانا دەكەن هەنگاوی خێراتر بنێ: هەتا چەند هۆش پێبگات،



ئەوەندەش بەرهەمەكانی چالاكیی لەشیان كامڵتر دەبێ. ئێستا چیدی مرۆڤ لەنێو ئەشكەوتدا نانوێ، بەڵكو بە ئامرازی بەردین دەكەوێتە دروستكردنی "خانوو" لە قوڕ و لكی درەخت. ئەم گۆڕانەی ئێستا بۆ ڕوسۆ برێتییە لە سەردەمی "یەكەم شۆڕش". مرۆڤان بەهۆی ئەم گۆڕانەوە بەسەر خێزانی جیاوازدا دابەش دەبن و شێوەیەكی "خاوەنداری" دەسەپێنن. بەهۆی ژیانی خێزانییەوە گۆڕانێكی بنەڕەتیی بەسەر هەستەكانی مرۆڤدا دێ، چونكە بەهۆی پێكەوەژیانەوە خۆشەویستیی هاوسەری و خێزانی سەر هەڵدەدات. سەرەنجامی ئەم خڕبوونەوەیەی مرۆڤان برێتییە لە دروستبوونی كۆمەڵی بچووك، بەڵام بەشداربووانی جارێ لە یەكێتیدا پێكەوە دەژین، ئەویش چونكە پەیوەندییەكی ئازاد كۆیان دەكاتەوە.

ئێستا ڕوسۆ دەربارەی زمان پرسیار دەپرسێ، كە چۆن بە تایبەتی لە باوەشی خێزاندا دەگۆڕڕێ. كێشەی سەرەكی لە حاڵەتی زمانی سەرچاوەییدا برێتییە لە چۆنێتی گەیشتن بە هێما. چونكە گەر مرۆڤی سروشت پەیوەندیی كۆمەڵایەتیی نەبێ، واتا بەتەنیا بۆ خۆی بژی، ئەوا پێویستیی بە زمان نابێ. یەكەم زمان، كە لە دۆخی سەرچاوەییدا پێویستە، برێتییە لە "هاوار"، كە لە مرۆڤ لە باری مەترسی یان ئازاردا بەڕێی ڕەمەكەوە هەڵدەستێ و مرۆڤ بەو دەنگە داوای یارمەتی لە هاوجۆرەكەی دەكات. بەڵام لەتەك پەرەسەندنی گرفتەكانی ژیان و لە ڕەوتی بەكۆمەڵایەتیبووندا ژمارەی هێماكان پەرە دەسێنن، ئەمەش واتای زەروربوونی بڵاوبوونەوەی زمان دەبەخشێ. پاشان دەنگ بە تۆنی جیاواز و گەیەنراو بە بزووتنێكی تایبەتیی لەش دەوڵەمەند دەكرێ، تاكو واتاكە ڕوونتر بكرێتەوە. مرۆڤ سەرەتا بابەتە دیار و بزێوەكان بە ئاماژە و بابەتەكانی بیستن بە دەنگ ڕوون دەكاتەوە، بەڵام تەنها بابەتەكانی شیاوی پێناسە و

ئەوانەی ئامادە دیاری دەکات، ئەویش نەك هەموو کاتێك، چونکە بابەتەکان بە هاتنی تاریکی دیار نامێنن و چیدی شیاوی بەکارهێنان نابن. بۆیە ئێستا "سەرنج" پتر پێویست دەبێ. پاشان مرۆڤ سەبارەت بەوە دەهەزرێ، کە لەجیاتی ئاماژە دەنگی جیاواز بەکار بهێنێ، چونکە ئەمیان چاکترە، بەڵام دەبێ ئەم شێوەیەی بەکارهێنانی زمان بەهۆی ڕانەهاتوویی ئۆرگانە تورتەکانی زمانەوە بۆیان گران بوو بێ. لە سەرێکی دیکەوە دەبێ وشەکانیان واتایەکی زۆر فراوانیان هەبوو بێ، ڕەنگە بە یەك وشە ڕستەیەکیان دەربڕی بێ، ئەویش چونکە جارێ نەیان دەتوانی ئاخافتن بەسەر ڕستەی تێگەیەنەردا بەش بکەن. مرۆڤ بەدووی ئەمەدا و بە تەقەلایەکی زۆر و درێژخایەن فێر دەبێ، بکەر لە تەواوکەر و کردار لە ناو جیا بکاتەوە، بەڵام ناوەکان لەو دۆخەدا جارێ تەنها ناوی خۆیی بوون و چاوگیش فۆرمی کردار بووە. تێگەیشتی ڕاناو زۆر درەنگتر دێتە ئاراوە، چونکە هەموو ڕاناوێك ڕوو دەکاتە واژەیەکی ئەبستراکت، هەروەها چونکە ئەبستراکتاندنەکان لە خۆیاندا چالاکییەکی ناسروشتی و درێشخایەنی هۆشمانن.

ئەو کاتە هەر بابەتێك ناوێکی تایبەتیی لێ دەنرا، بەڵام ڕەگەز و جۆرەکان جارێ گرنگ نەبوون و دۆزینەرانی زمان جیاوازییان لە نێواندا نەدەکردن. هەر بابەتێك لە شێوەیەکی تایبەتی و خۆییدا دەکەوتە بەر چاویان، واتا لەو شێوەیەدا، کە چۆن ئەو بابەتە لەنێو سروشت خۆیدا دەردەکەوێ. گەر داربەڕوویەك ناو بنرایە "ب"، ئەوا دەبوو درەختێکی دیکە ناوبنرێ "پ"، چونکە یەکەم تێگەیشت، کە مرۆڤ لە دوو شتەوە چێی دەکات، برێتییە لە تێگەیشتی "جیاوازی"، ئەمەیش کاتێکی درێژخایەنی تێڕوانینی دەوێ، هەتا ئیتر مرۆڤ دەزانێ، کە ئەو دوو شتە لە چیدا یەکدەگرنەوە. ناولێنانێکی بەم چەشنە ئاسان نییە، سەرەتا دەبێ مۆرکی بابەتەکان بناسرێ و ئینجا ئەو لایەنەی لە یەکیان جیا دەکاتەوە، ئەمانەش پێش پلەی جیاوازیکردن و



ناولێنانن. جگە لەمانە تێگەیشتەکان لە هۆشی مرۆڤدا ناچەسپێن، گەر وشەکان یاریدەدەر نەبن، هۆشیش لە ڕستەدا نەبێ تێیان ناگات. هەموو تێگەیشتە گشتییەکان لە هۆشەوە دێن، ئینجا دوای ئەوەی "وێنا" دێتە نێوانەوە، گشتێتییەکەیان بزر دەکەن. مرۆڤ ئێستا هەوڵ دەدات، ئاخۆ بتوانێ وێنەی درەختێك لەنێو هزریدا بەدی بکات. ئاشکرایە ئەوەی هەرگیز بۆ بەدی نایەت، چونکە وێنای درەختێکی گەورە یان بچووك، چڕ یان پەرش، ڕوون یان تۆخ دەکات. تەنانەت گەر بشێ وێنای ئەو لایەنە بکرێ، کە تایبەتە بە هەموو درەختێك، ئاشکرایە هەرگیز لە درەختەکە ناچێ. کەواتە هەموو خودە ئەبستراکتەکان بە وشە نەبێ دەرنابڕێن و مرۆڤ تێیان ناگات. ئێمە بەبێ پێناسە بە تێگەیشتی سێگۆشەیەك ناگەین. کاتێك هۆش وێنای دەکات، تەنها سێگۆشەکە خۆی دەبینێ: هێڵەکان دەکێشێ یان ڕووبەرەکەی بۆیە دەکات. کەواتە تێگەیشت دەبێ لە ڕستەدا دەربڕدرێ، واتا مرۆڤ دەبێ بخافتێ. مرۆڤ لەتەك بەکۆمەڵایەتیبووندا وردە وردە فێری ئاخافتن دەبێ، بەتایبەتی لەنێو خێزاندا، لێرەش بە تایبەتی لە لای منداڵ، چونکە ناچارە پێداویستییەکانی بە دایکی ڕابگەیەنێ.

زۆر کار و کێشەی نێوماڵ پاڵ بە خێزانەوە دەنێن پەرە بە سنوورەکانی خۆی بدات، تاکو گوزەرانی چاکتر ببێ. بەم شێوەیە ژمارەی مرۆڤان هەمیشە پتر پەرە دەسێنێ، هەموو گۆشەکانی جیهان بە کۆمەڵ و دەستەی جیاواز پڕ دەبنەوە و هەر یەکەیان لەسەر بنەمای نەرێت و کارەکتەری خۆیی یەکی گرتووە، واتا شێوازی ژیان و خۆراك و کلیما نزیکیی ئەو مرۆڤانە دیاری دەکەن نەك ڕێنوما و یاسا.

مرۆڤ لەنێو کۆمەڵە جیاوازەکاندا فێری پەیوەندی دەبێ، دراوسێکان لە یەکتری نزیك دەکەونەوە و فێری سەردانی یەکتری دەبن. ئێستا مرۆڤ فێر دەبێ لە بابەتی جیاواز بڕوانێ و لە نێوانیاندا بەراوورد بکات، بەبێ ئەوەی بزانێ بەو شێوەیە بە تێگەیشتەکانی "جوانی" و "شایان" دەگات و بە هەستەکانی خوازیاریان دەبێ. دانیشتوان هێندە یەکتری دەبینن، کە ئیتر "خۆزگە"ی یەکتریبینینەوە دەگۆڕرێ، هاوکات هەستێکی ناسك و شیرین چەکەرە دەکات، بەڵام لەتەك سەرهەڵدانی هەر بەربەستێکدا بۆ "تووڕەبوون" وەردەچەرخێ. بە سەرهەڵدانی خۆشەویستی "غیرە" دێتە ئاراوە.

چۆن تێگەیشت و هەستەکان ئاوەڵا دەبن، چۆن هۆش و سۆز بەردەوام لە ڕاهێناندان، بە هەمان شێوە دانیشتوان لەتەك یەکتریدا "ڕادێن" و ئەڵقەی پەیوەندییەکە چڕتر دەبێتەوە. مرۆڤان لە بەردەم ماڵەکاندا فێری کۆبوونەوە دەبن و بە سەما و گۆرانی، کە بریتین لە کۆڕپە ڕاستەقینەکانی خۆشەویستی و ڕابواردن، کات بەسەر دەبەن. ئێستا هەموو یەکێك "دەرك"ی ئەوانی دی دەکات و دەخوازێ ئەوانیش دەرکی بکەن. بۆیە "ڕێز"ی گشتی نرخێك وەردەگرێ. بەڵام چاکترین گۆرانیبێژ، چاکترین سەماکەر، جوانترین و بەهێزترین کەس، زۆرزانترین و بێژەرترین کەس، بەزۆری دەرکیان پێدەکرێ. ئەمە یەکەم هەنگاوە بۆ نایەکسانی و هاوکات بۆ سەرهەڵدانی گرفت. ئینجا هەر ئەوەندەی یەکەم پایەگا بە هەندێك کەس بەخشرا، ئیتر "فیز" و "بێز"، "شەرم" و "بەخیلی" سەر هەڵدەدەن.

لەکاتی دابەشبوونی تێگەیشتەکانی ڕێزگرتندا هەموو یەکێك هەبوونیان بە مافی خۆی دەزانێ و کەس ناتوانێ هیچ کامێکیانی لێ زەوت بکات. بەڵام لەسەرخۆ فرمانەکانی نێو پێکەوەژیان دەگۆڕرێن. مافخۆریەکی ویستیار بە "حورمەتشکاندن" دادەنرێ. بێگومان ئێستا کێشەکە لەوەدا نییە، کە کەسێك



گرفتی بۆ چێکراوە، بەڵکو لەوەدایە، کە حورمەتشکاندن ناوەرۆکێکی ستەمتر لە گرفت وەردەگرێ. بەکورتی: هەتا چەند نرخی ڕێز سەر بکەوێ، بێڕێزی ئەوەندە سووکتر دەبێ.

مرۆڤ بە هاتنی ئەم ژیانە کۆمەڵایەتییەی ئێستا ناچار دەبێ زۆر لە سیما سروشتییەکانی خۆی بگۆڕێ، هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك پێش دانانی یاسا خۆی بە سزادانی لۆمەکەرێك هەڵدەستێ، ئەوا چیدی چاکییەکەی دۆخی سەرەتا نامێنێ. بەڵام گەرچی بەزەیی سروشتی دەپووکێتەوە و زۆر لە توانستەکانی مرۆڤ گۆڕانیان بەسەردا دێ، سەرباری ئەمەیش ئەم سەردەمە هێشتا هەر "بەختەوەرترین" و "سرەوتووترین" قۆناغی مرۆڤایەتییە، ئەویش چونکە خۆی لە "ناوەڕاستی" تەمەڵییەکانی دۆخی سەرەتا و "خۆویستی" (amour propre) ی دۆخی کۆمەڵایەتیدا دەبینێتەوە. کەواتە مرۆڤ لە دۆخی سەرچاوەییەوە بەسەر بەختەوەرترین دۆخی کۆمەڵایەتیدا رووەو تێکچوونێکی خۆیەتی دەپەڕێتەوە، کە بریتییە لە "خۆویستی"، واتا بریتییە لەو بەدهەستەی دۆخی کۆمەڵایەتی، کە بناغەی ژیانی لاداوی مرۆڤە و هۆی هەوڵەکانێتی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و سامان، یان بۆ هەڵزنانی مرۆڤ لەسەر شانی کەسانی دەوری. بەڵام ئەم قۆناغەی ناوەڕاست تەواو "گونجاوە" بۆ مرۆڤ و ڕوسۆ ناوی دەنێ "لاوێتیی ڕاستەقینەی جیهان" یان "سەردەمی زێڕینی شوانی". ڕوسۆ وەك نموونە پەنجە بۆ ژیانی وەحشییەکانی ئەمەریکا و ئەفریکا ڕادەکێشێ، کە ژیانێکی ساغە و هاوکات شێوازە هاوڕێتمییەکەی نیشانەیە بۆ ئەوە، کە مرۆڤ بە ژیانێکی بەو چەشنە تایبەتمەندە. مرۆڤ هێشتا خۆی بە هەندێك کاری پێویستەوە بۆ ژیانی خەریك دەکات و ئەنجامدانیان هێندە هێزی پێویست نییە.

بێگومان گەرچی لاوێتیی ڕاستەقینەی جیهان زۆر کەم کەوتۆتە بەر مەترسیی دەرەکی، کەچی سەرباری ئەمەیش لەنێو لێژاوێدا خۆی دەبینێتەوە:

(یەکەم کەس، کە بە هزریدا هات بڵێ: "ئەم زەوییە هینی منە"، ئینجا کەسانێکی زۆری ساویلکە بڕوایان پێ کرد، ئەو کەسە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی "سیڤیلیزاسیۆن"ـە).

بەڵام بە بڕوای ڕوسۆ ڕەنگە ئەو گۆڕانە گەیشتبێتە ئاستێکی ئەوتۆ، کە چیدی شیاوی ڕاگیرکردن نەبوو بێ. کەواتە ئاشکرایە، تێگەیشتی "خاوەنداری" بە یەك جار لە هۆشی مرۆڤدا چێ نەبووە، بەڵکو ئەم تێگەشتە بە تێگەیشتی دیکەوە بەندە و هەموو بەدووی یەکدا دەگۆڕڕێن، هەروەها بۆ چێبوونی دەبێ چالاکی و تێڕوانین پەرەیان سەندبێ، نەوە بە نەوە گەیاندبێتیانن و بەدووی یەکتریدا گۆڕانیان پێدابن، پێش ئەوەی دۆخی سروشت بە دوا قۆناغی گەیشتبێ.

بە گۆڕانی کشتیاری (الزراعە)، کە بەندە بە پیشەسازییەکانەوە، "سیڤیلیزاسیۆن سەرچاوە دەگرێ". کشتیاری بریێتییە لە بناغەی سەرهەڵدانی خاوەنداری و دامەزراندنی حکومەت و دانانی یاسا. بەڵام بەکارهێنانی زەوی بۆ کشتیاری و پاشان دابەشکردنی زەوی، ڕاستەوخۆ ماف بە خاوەنی دەدات بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی بۆ خۆی هەڵبگرێ و پاشان زەوییەکە خۆیشی وەربگرێ. لێرەوە موڵکداری بەردەوام سەر هەڵدەدات، کە ساڵ بە ساڵ بۆ خاوەنداریی تایبەتی دەگۆڕڕێ.

لە ئەنجامی کاری دابەشدا کشتیار و کرێکاری میتال لە یەکتری جیا دەبنەوە و بە زەرووره ناچار دەبن بەرهەمەکانیان لەگەڵ یەکتریدا بگۆڕنەوە، لێرەشەوە هەردوو بەشی دانیشتوان پێکەوە بەند دەبن. بەڵام ڕادەی جیاوازی پێداویستییە ئابوورییەکان ئاستی جیاوازی بەندبوون لەتەك خۆیدا دەهێنێ، هەتا لە کۆتایی ئەم گۆڕانە بەردەوامەدا موڵکدار و بێموڵك سەر هەڵدەدەن و هەردووکیان بەتوندی بەرانبەر یەکتری دەوەستنەوە. موڵکدارەکان پشت بە "مافی سروشت" دەبەستن، واتا بە ئەو کاتەی دەستیان بەسەر یەکەم موڵکدا



گرت، بەڵام بێموڵکەکان پشت بە "مافی بەهێزتر" دەبەستن. ئەو موڵکانە سەرباری ئەمەیش جارێ ناڕەوا دەستیان بەسەردا گیراوە و موڵکدارەکان ناتوانن مافێك بسەپێنن، کە بەو پێیە بێموڵکەکان لە "هەبوونی ماف بۆ هەموو شتێك" بەدەر بکرێ.

ئێستا لەنێو ئەم دۆخەدا توانستە سروشتبەخشەکانی مرۆڤ بەتەواوی ئاوەڵا دەبن: ئەقڵ دەکەوێتە چالاکی و هۆش دەگاتە نزیکەی ئاستی کامیلبوونی. سەرەنجام بریێتییە لە "جەنگی یەك دژ بە یەك"، کە زیانی بەتایبەتی بۆ دەوڵەمەندەکان دەبێ، چونکە لە لایەك لەنێو خۆیاندا یەکنەگرتوون و لە لایەکی دی هێزێکی ئەوتۆیان نییە تاکو بتوانن خۆیان و موڵکەکانیان بپارێزن. بۆیە ئێستا "دەوڵەمەند" پلانێکی "بێڕادە فێڵزانانە" دەچنێ: "پەیمانی کۆمەڵایەتی". دەوڵەمەند ڕوو دەکاتە مرۆڤەکانی دەوری و پێیان دەڵێ:

"با یەك بگرین، هەتا لاوازەکان لە چەوساندنەوە بپارێزین و تەمائکاران بەگیر بهێنین، هەتا بۆ هەر یەکەمان ئەوە مسۆگەر بکەین کە هینی ئەو خۆیەتی؛ با پەیڕەوەکانی ئاشتی و دادپەروەری دابڕێژین، تاکو هەموومان بۆ پێکەوەژیان ناچار بکەن (...)؛ بە کورتی، لەجیاتی ئەوەی هێزەکانی خۆمان بۆ تێکشکاندنی خۆمان بخەینە گەڕ، لە دەسەڵاتدارییەکی تاك و بڵنددا یەکیان دەخەین، تاکو بەپێی یاسای دانایانە ڕابەرایەتیمان بکات، ئەندامانی کۆمەڵ بپارێزێ و بەرگریان لێ بکات، دوژمن بشکێنێ و ژیانی گشتی لەنێو بەختیارییەکی نەگۆڕدا مسۆگەر بکات".

بەم شێوەیە هەژارە لەژمارەنەهاتووەکان بۆ پەیمانێك ناچار دەکرێن، ئەوانیش پێی ڕەزامەند دەبن و لە دژکارانیان هێزی پارێزەر دروست دەکەن. دوای ئەم پەیمانە ئازادیی سروشتی بۆ هەمیشە لەناو دەچێ و هاوکات خاوەنداریی تایبەتی و نایەکسانی دەسەپێنرێن.

یاسا و کۆمەڵگا جیاوازەکان، کە کەم یان زۆر لەسەر شێوەیەکی بەم چەشنە دامەزراون، هەژارەکانیان لە کۆت خست و دەوڵەمەندەکانیان بەهێزتر کرد، داگیرکردنی بێمافیان کرد مافێکی نەگۆڕ، پاشان هەندێك لە تەماحکاران زۆربەی مرۆڤیان بۆ کار و کارەکەری و نەگبەتی کێش کرد.

لە گۆڕانە جیاکانی نایەکسانیدا دامەزراندنی مافی خاوەنداری و یاسا یەکەم قۆناغ پێك دەهێنێ، دووەم قۆناغ برێتییە لە دامەزراندنی حکومەت، سێیەم و دوا قۆناغ برێتییە لە وەرگۆڕینی ئەو دەسەڵاتدارییەی کە بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی سەپێنرا، بۆ دەسەڵاتدارییەکی بێجڵەو و شێتگیر. لە قۆناغی یەکەمدا ستاندی سامان و هەژاری سەر هەڵدەدات، لە دووەمدا ستاندی دەسەڵات و لاوازی، لە سێیەمدا ستاندی سەروەری و کۆیلەتی.

گرفتەکانی کۆمەڵگا، کە لە بناغەدا هۆی دامەزراندنی دامودەزگا سیاسییەکان پێکدەهێنن، بەزەرووره تێکدانی خودی ئەو دامودەزگایانە لەتەك خۆیاندا دەهێنن. جیاوازییە سیاسییەکان بەزەرووره جیاوازی لە نێوان ئەندامەکاندا دروست دەکەن، چونکە سەردار ناتوانێ دەسەڵاتە ناڕەواکەی بسەپێنێ، گەر "بیچمی پارێزەر" و "بودەڵە" بەلای خۆیدا ڕانەکێشێ و بەشێکی ئەو دەسەڵاتەی پێنەبەخشێ.

یەکەم پەیمانی کۆمەڵایەتی دەبێ بە پاڵهێزێك بۆ ئەوە، کە مرۆڤانی ناوچەکانی دیکە کۆ ببنەوە و یەك بگرن، تاکو بتوانن بە هێزێکی کۆیی بەرەنگاری ئەو ببنەوە. بەم شێوەیە کۆمەڵانی جیاواز بەسەر زەمیندا دەتەنێنەوە و یەکێتیی مرۆڤایەتی کۆتایی دێ، بەڵام ئێستا "جەنگی یەك دژ بە یەك" بەهێزتر لە جەنگی پێشینی نێوان تاکەکاندا کڵپە دەسێنێ. لە جەنگدا خوێنڕشتن بە مایەی شەرەف دادەنرێ، بەڕێزترین کەس ئەرکی خۆی لە



کوشتنی بەرانبەرەکەیدا دەبینێ و بە هەزاران مرۆڤ خۆیان بەکوشت دەدەن بەبێ ئەوەی هۆکەی بزانن.

## ٢- دانوستاندن

ڕوسۆ لەنێو نایەکسانیی سەردەمدا دەژی، لە نێوان ئەو مرۆڤانەدا، کە بەسەر بوون و ڕووکەشدا بەش بوون. مرۆڤ وەك چۆنبوونی خۆی دەر ناکەوێ و ئاخافتنی لە هزرینی جیاوازە. مرۆڤی کۆمەڵگای نایەکسانی لە پشت ماسکی ڕووکەشەوە خۆی حەشار داوە و تەنها لە خۆویستیی پەرچێنراوەوە دەڕوانێ، واتا لەو سۆزە نێگەتیڤەوە، کە بەردەوام سەبژێکتە هەڵگرەگەی خۆی خستۆتە نێو پێوانەوە لەتەك هاومرۆڤەکانیدا. کەواتە نیشاندانی نەرمی و ڕێز لە لای ڕوسۆش، بە هەمان شێوەی هۆبس، بەزۆری بۆ بەرژەوەندیی خۆیە، ئاکارەکان تەنها فۆرمی ناڕاستەقینەی پێکەوەژیانن، بەڵێ، تەنانەت فەیلەسوف شیاوی جیابوونەوەیە لە فەلسەفەکەی.

مرۆڤ چییە؟ ئایا ئاوهای لێهاتووە یان هەر ئاوها بووە؟ ڕوسۆ بە ڕەخنەوە ڕوو دەکاتە هۆبس، لۆك و پوفندۆرف وەك نوێنەرانی "زانیننومای مافی سروشت". ئەمان هەموویان لەکاتی توێژینەوەی بناغەکانی کۆمەڵگادا بەزەرووری ناچار بوون بۆ دۆخی سروشت بگەڕێنەوە، بەبێ ئەوەی کەسیان پێی بگات. ئەمان بە بڕوای خۆیان لە وەحشی دەدوێن، کەچی تەنها لە مرۆڤی کۆمەڵایەتی کۆڵیونەتەوە، بۆیە، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، توێژینەوەکانیان لەکاتی پاککردنی کۆمەڵگادا ناتەواو ئەنجام داوە. ڕوسۆ بە هەمان شێوەی ئەوان بە هیپۆتێز لە مرۆڤ دەڕوانێ و لە دۆخێکی دیکەدا دەی هێنێتە پێش چاوی، بەڵام ئەم دیدەی بۆ نێو ئەو دۆخە هێندە بڕ دەکات، کە نەشیاوە وەکو دۆخ زانستییانە

بسەلمێنرێ. روسۆ خۆی دەبێژێ، کە ڕەنگە دۆخێکی هەرە سەرەتایی ئاژەڵیانە هەرگیز نەبوو بێ، بەڵام ئەمە ناشێ ڕێگر بێ لەوەی کە توێژەرێك "لەنێو سروشتی مرۆڤدا بۆ مێژووەکەی خودی مرۆڤ بگەڕێ". جگە لەمە ئێستاش لەنێو کۆمەڵی نایەکسانییەوە لە هەندێك ناوچەی جیهاندا مرۆڤان بەدی دەکرێن، کە کەم یان زۆر هاوکێش بە شوێنەوارە فیزیکییەکەیان دەژین: زۆر شتی باوی نێو کۆمەڵی نایەکسانی لەنێو وەحشیەکانی ئەمەریکا و ئەفریکادا نییە. کەواتە دەبێ مرۆڤ لە سەرچاوەدا بە شێوەیەکی دی بوو بێ، لە ڕەوتی مێژوودا بۆگەنی کردبێ و بە نامۆبوویی لە نێوان ویست و مەیلەکانیدا بژی.

ڕوسۆ لەنێو جەوهەری مرۆڤدا کنە دەکات و وەکو هۆبس بە "گورگی مرۆڤ" ناگات، بەڵکو بە مرۆڤی "چاك"، کە لەنێو دەستی سروشت خۆیەوە دەرچووە و هیچ شتێك هێشتا ناخی نەهەژاندووە، چونکە نازانێ هزرین و ڕوانین چین. مرۆڤ هیچ ئاگایەکی لە چاکە و خراپە، لە مۆرال، لە ئەقڵ و یاسا نییە، تەنانەت هاوجۆرەکەی خۆی ناناسێ، ئەویش چونکە خاوەنی ڕەمەکی کۆمەڵایەتی نییە. ئەو سروشتە ئاژەڵێکە لەنێو ئاژەڵەکانی دیکەدا، برێتییە لە یەکی ژمارەیی نەشکاو و توانستەکانی تەنها کەمێك لە ئەوانەی ئاژەڵ ڕێککەوتووترن.

سەرەتا تەنها ژیان هەبوو، واتا تەنها زێنزایەتی هەبوو. ڕوسۆ دەربارەی ئاژەڵێتیی مرۆڤ دەپرسێ، تاکو ڕوونی بکاتەوە، کە چ شتێك لەنێو ئەو ئاژەڵێتییەدا مرۆڤێتیی ئەو پێك دەهێنی یان دەشێنێ. کەواتە مۆراڵێتی، بە هەمان شێوەی ئەقڵ، ڕەگی لەنێو زێنزایەتیدا هەیە و سەرەڕای ئەمەش جیهانێکی دی ئاشکرا دەکات. تەنها ڕوونکردنەوەی گۆڕانێکی پێشڤەر، کە ڕیزێك هۆی دەرەکی بزواندوویانە، بەبێ هیچ نەسازییەك سروشتە ئاویتەکەی مرۆڤ



نیشان دەدات، کە لە سەرێکەوە ئاژەڵە و لە سەرێکی دیکەوە ئەقڵدار و بەڕەوشتە، ئەمەیش بێگومان بە واتای ئەقڵدار و بەڕەوشت بووە. [١]

مرۆڤی دۆخی سروشت، وەك سروشتێکی تەنیا و بۆخۆبەس، ناسۆسیال نییە، بەڵکو پێش-سۆسیالە، نامۆرالی نییە، بەڵکو پێش-مۆرالییە. ئەو مرۆڤە بەختیارە، چونکە نەشکاوە و لەگەڵ خۆیدا یەکە، چونکە لەتەك شوێنەوارە فیزیکییەکەی خۆیدا لە هاوکێشییەکی بێزەحمەت و پێشدراودا دەژی و جارێ وەك سروشت بۆ "جیهان"ی مرۆڤی کولتووری وەرنەشکێنراوە. [2] ئەو مرۆڤە تەنها خەریکی خۆیەتی و ساتارکردنی پێداویستییەکانی لە سنووری ویستی تێناپەڕن، بۆیە خەمەکانی تەنها ئاراستەی خۆی کردوون و بەمەیش خۆخۆشویستن ئەو مۆتیڤەی پێکدەهێنێ، کە سروشت پێی بەخشیوە. مرۆڤ لە سروشتەوە خاوەنی ئەم ڕەمەکەیە بۆ مسۆگەرکردنی خۆهێشتنەوە. بەڵام کاتێك ئاژەڵ بەهۆی ڕەمەکی پەتییەوە وەردەگرێ یان دەگەڕێنێتەوە، ئەوا مرۆڤ وەرگرتن و گەڕاندنەوە بەڕێی "ئەکتی ئازاد"ەوە دەنوێنێ و تەنها بە ئەوە هەڵدەستێ، کە خۆی "دەیەوێ"، بەڵام ئەوەی دەوێ، کە بۆ خۆی پێویستی پێیەتی. مرۆڤ بەهۆی ئەم ئەکتە ئازادەوە توانستی "خۆکامڵکردن"ی هەیە وەك تاکە توانستێك، کە دەبێ بە سەرچاوەی گۆڕانی گیروگرفت و ڕەوشتەکانی، ئەویش چونکە لە لای ئەم، بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە، جڵەوی ڕەمەکی (ئینستینکتی) نییە.

کەواتە جیاوازییەك لە نێوان ئەنیمالێتیی (ئاژەڵێتیی) مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە. ئەم جیاوازییە تۆوی مرۆڤێتیی مرۆڤی هەڵگرتووە و برێتییە لە توانستێك بۆ لادان لە دەستوورە دانراوەکانی سروشت، واتا لەو دەستوورانەی شوێنەوار سەپاندوونی. مرۆڤ بەهۆی ئەم لادانەوە بۆی دەلوێ دەستووری (نۆرمی) دی لەجیاتی دەستووری بیۆلۆژی دابنێ و بەمەیش سنووری دەستوورە

بیۆلۆژییەکان بە ڕێی گەشەپێدانیانەوە ببڕێ. توانستی لادان یان ئەکتی ئازاد بڕێتییە لە مەرجی خۆکامڵکردن. (٣)

بێگومان گەر مرۆڤ تەنها خاوەنی ڕەمەکی خۆخۆشویستن بووایە، ئەوا زۆر دەشیا کە ئەو ڕەمەکە ببوایە بەهۆی تێکشکاندنی ڕەگەزەکەی. مرۆڤی سروشت بە بڕوای ڕوسۆ خاوەنی ڕەمەکێکی دیکەیە، واتا بەزەیی، کە بڕێتییە لە نەویستییەک بۆ بینینی هاوجۆرەکەی لە ئازاردا و لێوەی سەرجەم ڕەوشتەکانی مرۆڤ دێنە ئاراوە. کاتێک خۆخۆشویستن بۆ خۆهێشتنەوەی تاک ڕەمەکێکی چاکە، ئەوا بەزەیی دەبێ بەهۆی هێشتنەوەی ڕەگەزی مرۆڤ، چونکە سنوورێک بۆ خۆخۆشویستن دادەنێ و نایەڵێ چالاکییەکی بێجڵەوی هەبێ.

مرۆڤ بەهۆی پاڵهێزی دەرەکییەوە بە یەکەمین دۆزینەوەکانی دەگات، بەمەیش دەچێتە ئاستێکی بەرزترەوە لە ئاژەڵ و لێرەشەوە بۆ بەراورد لە نێوان خۆی و "ئەو"دا، پاشان درەنگتر لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا، دەخزێ. دوای ئەوەی مرۆڤ بۆ یەکەمین جار لە خۆی دەڕوانێ، ئیتر لە ناخیدا ئارەزووی نازین دەپشکوێ و خۆی وەکو ڕەگەز لە ئاستێکی بەرزتردا دادەنێ. "ئەمە یەکەم هەنگاوە لەنێو خۆوە بۆ دەرەوە. ئێستا لەحیاتی ڕووکردنە من، کە هەتا ڕادەیەک پەیوەندییەکی ڕەهایە، پەیوەندییەکی ڕێژەیی ڕووەو دەرەوە، ڕووەو "ئەوان" (...) سەر هەڵدەدات". (٤) "پچڕانی (شکانی) نێوان بۆخۆبەسییەکەی سەرەتا لە لایەک و هەروەها پەرچاندنی کۆمەڵایەتی و هاڤرکێ لە لایەکی دی، پچڕانی هەموو ئیندیڤیدێک (تاکێک) لەتەک خۆیدا دەهێنێ. بەهۆی سۆسیالبوونەوە، کە دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا دادەمەزرێنێ، هەموو تاکێک لەتەک خۆیدا دەکەوێتە نەسازییەوە". (٥)

گۆڕانی مرۆڤ ڕووەو کۆمەڵ بۆ ڕوسۆ "ڕێکەوتێکی مێژوویی"یە نەک گۆڕانێکی زەرووری؛ هێزێکی ئەزەلی مرۆڤ لە دۆخی سروشت دەرناپەڕێنێ،



بەڵکو پاڵهێزی دەرەکیی جیاواز، کە بە هۆیانەوە توانستە سروشتبەخشەکان ئاوەڵا دەبن و مرۆڤ بە تێگەیشتنی جیاواز دەگات. ئەم تێزەی ڕوسۆ هاوکات دەیسەلمێنێ، کە ئەقڵگەرایی (ڕاسیۆنالیزمی) کلاسیکی لە بناغەوە هەڵە بووە، چونکە ئەقڵی بە دراوێکی سروشتی و پێگەیو و ئامادە دانابوو. ڕوسۆ خوای سەردەمەکەی، واتا ئەقڵی ئەزەلی، بە یارمەتیی فەلسەفەی زمان لە پایەگای دەسەڵاتەوە دادەگرێ و دەیسەلمێنێ، کە تێگەیشتنەکانی مرۆڤ لە ڕەوتی بەکۆمەڵایەتیبووندا گۆڕراون. کەواتە ئەقڵ، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، سەرەکی نییە و لاوەکییە.

ڕەوتی مێژوو بەشێوەیەکی ئەزموونی ڕووەو کۆمەڵی مرۆڤ دەڕوات، ئینجا دوای ئەوەی هاوکێشی پێداویستییەکانی مرۆڤ تێک دەچێ، زەروورەی دامەزراوی سیاسی دێتە ئاراوە. کەواتە کاری دابەش - گەر لە ڕووی دەرەکییەوە لە کێشەکە بڕوانین - ڕۆڵی بڕیاردەری بۆ پەرەسەندنی نایەکسانی، بۆ پەرەسەندنی هاڤرکێ و نەسازیی بەرژەوەندییەکان هەیە. ئەقڵ لەنێو ئەم دۆخەدا دەکەوێتە چالاکی. کەواتە سروشتی مرۆڤ بە فێربوون دەگۆڕێ. ئەقڵ درەنگتر لە پێداویستییەکانی لەش، واتا لە ڕەوتی ساتارکردنی پێداویستییە بەردەوام پەرەسەندووەکاندا، دروست دەبێ. سەرەتا پێداویستییەکان ساکار و هاوڕێتمین و بەئاسانی ساتار دەکرێن. بەڵام هەر ئەم "هەقیقەتە"یە، کە ڕاستەوخۆ دەبێ بەهۆی پەرەپێدانێکی زۆر بڵاوی ژمارەی دانیشتوان و لێرەشەوە گرانکردنی دامرکاندنەوەی پێداویستییەکان. مرۆڤ لە پێناوی مانەوەی خۆیدا ناچاری هزرین (فێربوونی هزرین) دەبێ. (٦)

بەڵام بەختەوەرترین سەردەمی مرۆڤایەتی بەپێش کۆمەڵی کولتووریدا ڕادەبووری و بڕێتییە لە سەردەمی زێڕینی شوانی. لەم دۆخەدا کۆمەڵی بچووک سەر هەڵدەدەن، دەتوانین بڵێین تیرە و هۆز، کە یەکگرتنی مرۆڤ لە نێویاندا

لەسەر دەستووری یاسا نییە، بەڵکو شێوازی ژیان و کلیما نزیکییان دیاری دەکەن؛ واتا کۆمەڵی جیاوازی سروشتی بەپێش "ڕێکخراوی سیاسی" یان دەوڵەتدا ڕادەبوورن و لەنێو هەر یەکەیاندا کارەکتەر و نەریتی تایبەتی هەیە. ئەم سەردەمە ئیدیالی ڕوسۆیە نەك دۆخی سەرچاوەیی سروشت، چونکە ئەم سەردەمە خۆی لە نێوان تەمەڵییەکانی دۆخی سەرەتا و خۆویستیی دۆخی کۆمەڵایەتیدا دەبینێتەوە. مرۆڤی ئەم سەردەمە زۆر دوورە لە ئازارەکانی سیڤیلیزاسیۆن: لە نایەکسانی و نائازادی، نارەسەنی و خۆنەسازی. بەڵام گرفتی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی بە تەواوبوونی سەردەمی زێڕین سەرەتا دەگرێ، ئێستا بە دۆخی "جەنگی یەك دژ بە یەك" دەگەین، کە ڕوسۆ هەروەها وەك سیمای سەردەمەکەی دەیبینێ. مرۆڤی هۆبس لە لای ڕوسۆ لەم سەردەمەدا دروست دەبێ، واتا مرۆڤ لەم کاتە بەدواوە دەبێ بە گورگ. هۆی ئەم گۆڕانەی ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنداریی تایبەتی. چونکە ئەو لایەنە جەختە، کە تەنها بەدووی دامەزراندنی خاوەنداریی تایبەتیدا دەبێ هونەرەکانی بردنەوەی میتال و کشتیاری هاتبنە ئاراوە، بۆ ئەوەی بەرهەمی زۆرتر لە زەوی ببەنەوە. لێرەوە جیاوازییەکانی نێوان ئەو کەسانە، کە زەوییان هەبووە، هەروەها ئەو کەسانە، کە زەویان نەبووە، گەورەتر بوون. سەرەنجام بەهۆی میراتگری و تەشەنەی ژمارەی دانیشتوانەوە شیمانەی ئەوەیش سەر هەڵدەدات، کە موڵك لەسەر حسابی خەڵکانی دی پەیدا بکرێ یان تەشەنە پێ بدرێ. لێرەوە ئیتر کۆمەڵ بۆ نێو جەنگی نێوخۆیی دەخزێ.

ئاشکرایە تەقینەوەی گرفتێکی زۆر، کە سەرجەم دانیشتوان لە ژێریاندا دەناڵێنێ، بەتایبەتی زیان بە دەوڵەمەندەکان دەگەیەنێ، چونکە لە سەرێکەوە موڵکەکانیان جارێ نارەوا داگیرکراون و لە سەرێکی دیکەوە "لەبەر بەخیلییان بە یەکتری" نایانەوێ لە دژی بێموڵکە لەژمارەنەهاتووەکان یەك بگرن. ئەمان نەك



تەنها دەبێ لەوە بترسن، کە ژیانیان بدۆڕێنن، بەڵکو موڵکەکانیشیان، بە پێچەوانەی هەژارانی بێموڵکەوە، کە خۆیان تەنها لە بەردەم مەترسیی نەمانی ژیانیاندا دەبیننەوە. سەرەنجامی ئەم دۆخەی جەنگی یەك دژ بە یەك بریێتییە لە پەیمانی ساختەی کۆمەڵایەتی، کە نەسازییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان موڵکدار و بێموڵك هۆی چێبوونی پێکدەهێنن: دەوڵەمەندەکان دەیانەوێ بە دۆخێکی ئاشتی بگەن، کە گەرەنتی بۆ هاتنەئارای ئاسایش بدات، هاوکات هەژارەکانیش لە پێناوی پاراستنی ژیانیاندا ناچار دەبن دەستبەرداری "هەبوونی ماف بۆ هەموو شتێك" ببن.

بێگومان دیاریکردنی سەردەمێکی زێڕینی شوانی لە لایەن روسۆ، کە تێیدا مرۆڤ جارێ ژیانێکی بەختیار دەژی و تەنها بە ئەو کارانە هەڵدەستێ، کە بۆ ساتارکردنی پێداویستییەکانی خۆی سوودمەندن، دەنگنانی ڕوسۆیە بەو هەقیقەتەدا، کە مرۆڤ لە ناخییەوە توانای بۆ ژیانی ئاشتی و ئارامی هەیە. هەروەها ئەوەش، وەك لە سەرەوە نیشانمان دا، کاریگەرییە دەرەکییەکانن، کە ژیانی خۆیی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ تێك دەدەن. بەڵام ئایا ئەم ژێرپەڕینە، یان ئەم دازنانەی مرۆڤی "چاك" بۆ نێو خۆویستی، چۆن لە ناخەوە دێتە ئاراوە؟ ئایا چۆن "چاك" لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبووندا "خراپ" دەبێ؟ ئێمە دەبێ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە سەرلەنوێ ڕوو بکەینەوە دۆخی سروشت، تاکو ئەو پنتە دیاری بکەین، کە تێیدا جەوهەری مرۆڤ تێکدەچێ، چونکە ئەم تێکچوونە لەنێو خودی دۆخی سروشتدا ڕوو دەدات.

ئێمە دەبێ لە لای ڕوسۆ لەنێو خودی دۆخی سروشتدا جیاوازی لە نێوان دوو قۆناغدا بکەین، کە هەردووکیان لە پنتێکدا یەکتری دەبڕن و تێیدا سروشتی "پیرۆز" بۆ سروشتی "خراپ" وەردەگۆڕرێ، مرۆڤی "چاکی" سروشت بۆ مرۆڤی "خراپ"ی سروشت ژێر دەپەڕێ. ڕوسۆ لێرەدا سەرلەنوێ دووبەشبوونی دیانی

دەهێنێتەوە. ئێمە لە لای ڕوسۆ سەرەتا مرۆڤی "چاك"ی سروشتمان هەیە، کە تەواو ئاژەڵییە، بەڵام ئەم مرۆڤە بەڕێی کاریگەرییە دەرەکییەکانەوە لە "هێڵەکە"ی فڕێ دەدرێ و لێرەشەوە ناچار دەبێ، گۆڕان بە مۆرکە سروشتییەکانی بدات، ئێستا بۆ مرۆڤی "خراپ"ی سروشت وەردەگۆڕرێ؛ ئەم وەرگۆڕانە لەتەك تێگەیشتی "ژێرپەڕین" (FalI) ی دیانەکاندا یەك دەگرێتەوە. (٧)

بەڵام لێرەوە هاوکات ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە لە لای ڕوسۆ پێویست نییە سەرچاوەی خراپە بخرێتە ئەستۆی خوا یان تەنانەت ئەستۆی مرۆڤ خۆی، کە بەهۆی ژێرپەڕینییەوە بۆ نێو دۆخی کۆمەڵایەتی "گووناهبار بووە". ڕوسۆ دەبێژێ: هیچ پێویست نییە "مرۆڤ لە سروشتییەوە وەکو خراپ وەربگیرێ، چونکە دەتوانین سەرچاوە و ڕەوتی خراپەکەی دیاری بکەین". (٨) هۆ ناخییەکەی ئەم بڕوایەی ڕوسۆ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەو لە جەوهەرییەوە خۆی بە "چاك" دەزانی، هەروەها ئەو زانیننومای دیانەکانی سەبارەت بە گوناهی ڕەچەڵەکیی مرۆڤ وەرنەدەگرت و سەرجەم دادناپەروەری و سۆزی بۆ کاریگەرییە دەرەکییەکان، بۆ دۆخە کۆمەڵایەتییە خۆسەپێنەرەکان، دەگەڕاندەوە؛ یان گەر ڕوونتر بڵێین: مرۆڤ لە جەوهەریدا بێگوناهە، بەڵام زۆر هۆی دەرەکی لە دۆخی بێگوناهی ژێریان پەڕاندووە و ئەمەیش بە شێوەیەك، کە ئەو ئەمرۆ دەتوانێ چ بۆ بەدکاری و چ بۆ بەڕەوشتی بڕیار بدات. مرۆڤ لەو شێوەیەدا بێگوناهە، کە لە دەستی سروشت، واتا لە دەستی خوا، دەرچووە. (٩)

خراپە لە لایەن مێژوو و کۆمەڵگاوە دەهێنرێتە گۆڕێ، بەڵام بەبێ ئەوەی جەوهەری مرۆڤ تێك بدات. هەڵەی کۆمەڵگا هەڵەی مرۆڤ نییە لە جەوهەرییەوە، بەڵکو هەڵەی مرۆڤە پەیوەست بە مرۆڤی دیکەوە. خراپە لە لای ڕوسۆ دەشێ هاوتا بکرێ لەگەڵ سۆزی مرۆڤدا بۆ شتی دەرەکی، بۆ ڕووکەش، بۆ



موڵکخوازیی شمەکی ماتەری. خراپە دەرەکییە، هەموو کاتێکیش گەڕانەوە بۆ لای خۆ دەبێ بە پاڵهێزی چاکبوونەوە. (١٠) خراپە هەمان پایەگای "چاکەی سروشتی"ی نییە. خراپە برێتییە لە پەچە، لە ماسکی حەشاردەر، کە هەرگیز نەدەبوو، گەر مرۆڤ خاوەنی ئازادییەکەی نەبووایە، کە ئیتر بەڕێی فێڵ و ئەمسەر و ئەوسەری خۆنواندووەوە نکۆڵی لە دراوەکانی سروشت بکات. "لەژێر دەستی مرۆڤدا، نەك لەنێو دڵیدا، هەموو شتێك بەدجۆر دەبێ". (١١)

بەڵام ئایا مرۆڤ بەم وەرگۆڕانە بەبێ چارەسەر بۆگەن دەکات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە دوالیزمی ڕوسۆدایە. با لە تێگەیشتی مرۆڤ لە لای روسۆ بڕوانینەوە: مرۆڤی سەرچاوەیی نزیکەی سروشتێکی ئاژەڵییە. خۆخۆشویستنەکەی تەنها ڕوو دەکاتە لێرەبوونە زێنزییەکەی. بەڵام لێرەبوونی مرۆڤ، تەنانەت دوای وەرگۆڕانی خۆخۆشویستن بۆ خۆویستی، لە ناوەرۆکەوە هێشتا هەر زێنزی دەمێنێتەوە، بێگومان ئێستا هێندە نەبێ، کە ڕووکردنە بابەتەکانی حەز "شکاوە"، واتا ناڕاستەوخۆیە. چونکە خۆویستی بەزۆری ڕوو دەکاتە ئەو کۆسپانە، کە ڕێگرن لە چێژتنی بابەتەکانی حەز، هەروەها ڕوو دەکاتە هاومرۆڤەکان و وەك دەسوێژ لێیان دەڕوانێ، واتا وەك گەیەنەر بە چێژە شیاوەکان دایان دەنێ. کێشەکە لێرەدا بە لێرەبوونی زێنزییەوە (بیۆلۆژی-ئاژەڵییەوە) بەندە، نەك بە شتی "هۆش"ەکییەوە. ئێمە ئەمیان لە لای خۆزگەی گەیشتن بە شەرەفمەندی و ناوبانگ دەبینین. بەڵام ئەو کەسە، کە بۆ بەها (شتە) هۆشەکییەکان تێ دەکۆشێ، دەبێ بە دیلی "لێرەبوونی رەها"ی خۆی، چونکە ئەو کەسە پێویستیی بە بڕواگریی لە لێرەبوونە تایبەتییە زێنزییەکەیدا هەیە، جا ئەمە جوانییە (سروشتییە)کەی بێ، زیرەکییە (پۆتێنسییە)کەی یان دەسەڵاتە (ماتەرییە)کەی بێ. بە کورتی، ئەو "خۆ"یە، کە مرۆڤی نرخبەزیوی کۆمەڵایەتی دەیەوێ بەڕێی کەسانی دیکەوە مسۆگەری بکات (ئەویش چونکە خۆهەستی مرۆڤی سروشتی

دۆڕاندووه)، بریتییه له سەبژێکتی خۆویستی سۆز و حەزە زێنزییەکان. مرۆڤ تەنانەت دوای وەرگۆڕانی خۆخۆشویستن بۆ خۆویستی هێشتا هەر لێرەبوونە زێنزییەکەی وەك جەوهەری ڕاستەقینەی خۆی دەبینێ، هێشتا هەر، وەك ڕوسۆ دەڵێ، مرۆڤی سروشتییە، جا گەرچی نرخە سروشتییەکەی دابەزی بێ. [12]

بەڵام ئەم بارە بێهیوا دەبوو، گەر مرۆڤ لەپاڵ لێرەبوونە زێنزییەکەیدا توانای بۆ "لێرەبوونێکی هۆشەکی" نەبووایە. مرۆڤ بە بڕوای ڕوسۆ هەبوویەکی سادە نییە، بەڵکو لە دوو جەوهەر (زوبستانس) پێکهاتووە، لێرەشەوە و بەهۆی ئەم دوو جەوهەرەوە خۆخۆشویستن هەستێکی سادە نییە، بەڵکو دوو پرنسیپی هەیە، کە بریتین لە پرنسیپی زێنزی و هۆشەکی، هەروەها هەردووکیان دوو شێوازی جیای ساتاربوونیان هەیە. پرنسیپی (ڕەمەکی) زێنزی ڕوو دەکاتە خۆشیی لەش، بەڵام پرنسیپی هۆشەکی ڕوو دەکاتە بەختیاریی دەروون. کەواتە خۆخۆشویستن بۆ دوو دیاردەی جیاواز وەردەفۆرمێ. خۆخۆشویستن لە لایەك سۆزی جودای هەیە و ئەو سۆزانەی ڕوو دەکەنە بابەتە تایبەتییەکان، بەڵام ناتوانن ڕاستەوخۆ پێیان شاد ببن: زۆر کۆسپ لەنێو پەیوەندییەکانی پێکەوەژیاندا لە بەردەمیاندا زیت دەبنەوە و گەر ڕایان بگرن، ئەوا پتر خەمی لابردنی کۆسپەکان دەخۆن وەك لەوەی بە ئامانجەکانیانەوە خەریك ببن؛ ئێستا کین و تووڕەیی دەیان تەنن. بەم شێوەیە خۆخۆشویستن، وەك هەستێکی چاك و ڕەها و لەخۆدائارام، بۆ خۆویستی، کە هەستێکی ڕێژەییە، وەردەگۆڕڕێ. بەڵام مرۆڤ لەپاڵ ئەم خۆ زێنزییەی خۆخۆشویستندا، کە تێك دەچێ، توانای بۆ لێرەبوونێکی هۆشەکی هەیە و لە ڕەوتی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتیدا دەگۆڕڕێ. ئەم لێرەبوونە هۆشەکییە بریتییە لە "خۆشەویستی بۆ ڕێکخستن"، کە ڕوسۆ هەروەها ناوی "ویژدان" لێ دەنێ. بەڵام ویژدان تەنها دوای چێبوونی تێڕوانینە جیاوازەکانی مرۆڤ دەکەوێتە چالاکی: دوای ئەوەی تێڕوانینەکانی دێنە ئاراوە،



ئیتر مرۆڤ بە زانینی ڕێکخستن دەگات و ویژدانی پاڵی پێوە دەنێ ئەو ڕێکخستنەی خۆش بوێ. [13] مرۆڤ بەهۆی خۆویستییەوە هەنگاوی بۆ نێو مێژوو نا، بەڵام ئێستا وەك مرۆڤی کۆمەڵ، کە لە ڕێکخستن ژێرپەڕیوە و ئەقڵی ئاوەڵا بووە، دەتوانێ بە پێزانراوی و خۆشەویستییەوە ڕووبکاتە(وە) ئەو ڕێکخستنە (ڕێکخراوە). [14]

بەڵام لێرەوە هاوکات ئەوە روون دەبێتەوە، کە مرۆڤ یەکێتییە سەرچاوەییەکەی خۆی چ لە ڕووی مێژوویی و چ لە ڕووی بیۆلۆژییەوە دۆڕاندووە، ئەمەیش بە چەشنێك، کە ئەم بەدجۆربوونەی سروشتی ئەو چیدی بۆ دواوە، "بۆ کاتەکانی بێگوناهی و یەکسانی"، شیاوی گەڕاندنەوە نییە. ڕوسۆ وەك ئەرکی ئایندە "ئیدێیەك" دادەنێ: ئیدێی "کۆنترا سۆسیال" (پەیمانی کۆمەڵایەتی).

مرۆڤان لە ڕوانگەی ڕوسۆ دەتوانن پەیمانێکی کۆمەڵایەتیی بەم چەشنە ببەستن، چونکە ویژدانی مرۆڤ، دوای گەیشتنی ئەو بە تێگەیشتەکانی دادپەروەری و ڕێکخستن، چالاك دەبێ. مرۆڤ ئێستا هەست بە "چاك"ی مۆڕالی دەکات، هاوکات دەبێ بە خاوەنی زۆر ڕەوشتی جیاواز و دەتوانێ بە یارمەتییان سۆزە زێنزییەکانی خۆی بێدەنگ بکات. چونکە گەر بەرژەوەندیی ماتەریی پێچەوانە لە نێوان مرۆڤاندا نەبێ، ئەوسا ئەوان دەتوانن دەنگی ویژدانیان ببیستن و لێرەشەوە هەستێکیان بۆ ڕێکخستنی ژیانی گشتی دەبێ، ئەمەیش هەستێکە، کە تەنها لە پێناوی بەختیاریی گشتیدایە.

کەواتە ڕێگاکە بریتییە لە ڕێگایەك بەرەو پێش، کە ئاڕاستەیەك ڕووەو مۆرالپەروەری وەردەگرێ، بەڵام لێرەدا دەبێ گەورەترین نزیکیی شیاو لە دۆخی سروشت چێ بکرێتەوە، ئەمەیش تەنها لەسەر زەمینەی مرۆڤپەروەری دەشێ. لەبەرئەوەی خۆنەسازیی مرۆڤ بەرهەمی پرۆسەی مێژووە، ئەوا ئازادیی نوێی

مرۆڤ تەنها لەنێو مێژوودا دەهێنرێتەوە: بە دارشتنی بنەماکانی مافی ڕاستەقینەی گشت، بە چەسپاندنی دەستوورەکانی دەسەڵاتدارییەکی ڕەوا، واتا تەنها گەر هاتوو کۆماری ڕوسۆ دامەزرێنرا، ئەوسا مافداری و مۆرالپەروەری دێنە نێو جیهانەوە. [١٥]

## بەشی سێیەم: کۆماری ڕوسۆ

### ١- دارشتن

#### ١-١ بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی

ڕوسۆ لە نووسینی "کۆنترا سۆسیال" (پەیمانی کۆمەڵایەتی)دا هەوڵێك دەدات بۆ ئەوەی چارەسەری کێشەی نایەکسانی لە نێوان مرۆڤاندا بکات. ئەو باوەڕ دەکات (ئەمەش پەیوەست بە هەوڵە تیۆرییە سیاسییەکانی سەدەی هەژدەیەمەوە زۆر پڕواتایە، چونکە نزیکەی لە هەموویان جیا دەبێتەوە)، کە تەنها بە "پێکەوەلکاندنی سیاسەت و مۆراڵ" شیمانەیەك دێتە ئاراوە، بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە دەسەڵاتداری بدرێ. کەواتە ڕوسۆ ڕوو دەکاتە بنەماکانی دەسەڵاتدارییەکی لێگیتیم (ڕەوا)، بە واتایەکی دی "لەسەر ڕێگەی ئەبستراکتاندن و گشتیدان (...) هەوڵ دەدات بە پرنسیپەکانی هەر لەشێکی سیاسی بگات"؛ یان دەیەوێ بەو هەلۆێستە بگات، کە بەرێیەوە "گەلێك ناوی گەل وەردەگرێ". [1]



ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییەی ڕوسۆ پێشنیاری دەکات، دەبێ کۆتایی بە پەیمانی ساختەی دەوڵەمەندەکان بهێنێ. ئەمان، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتییان، دوای تێکچوونی دۆخی ئاشتی و ئاسایش، بە بەستنی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی خەڵکانیان فریو دا و لێرەشەوە ئازادییەکەیان لێ زەوت کردن. ئێمە لێرەدا بە کێشە سەرەکییەکەی ڕوسۆ دەگەین، واتا بە کێشەی ئازادی، کە ئەو وەك جەوهەری ڕاستەقینەی مرۆڤ دەی بینێ. لەبەر ئەوەی پەیمانی کۆمەڵایەتیی دەوڵەمەندەکان پەیمانێکی ساختەیە و فێڵزانانە لە پێناوی بەرژەوەندییە خۆییەکانیاندا سەپاندوویانە، یان بە واتایەکی دیکە ببێژین، لەبەر ئەوەی ئەو پەیمانە لەتەك جەوهەری مرۆڤدا، کە ئازادییە، ناگونجێ، ئەویش چونکە "هێز" ڕەوایەتی بە نایەکسانیی مۆراڵی نادات، ئەوا بناغەی ئەو پەیمانەی دەوڵەمەندەکان، کە لە هێزەوە هاتووە، "ماف" نییە. ئەمەش بۆیە ئاوهایە، چونکە گەر هێز مافی چێ بکردایە، ئەوسا ماف بە هەمان شێوەی هەر گۆڕینێکی پەیوەندییەکانی هێز شیاوی نەمان دەبوو. بەڵام ئەوە هەقیقەتێکی نەشیاوی نکۆڵیلێکردنە، کە هیچ کەسێك ناتوانێ بەپێی ماف هەتا سەر دەسەڵاتدار بێ. گەر دەسەڵاتدارێك بییەوێ هەتا سەر دەسەڵاتەکەی مسۆگەر بکات، ئەوا دەبێ ئەو دەسەڵاتەی بۆ ماف وەربگۆڕێ و بە زەبر هۆشرایەڵی وەك فرمانی گەل بسەپێنێ. بەڵام لە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیی بەم چەشنەدا هیچی دی جگە لە "مافی بەهێزتر"خۆی نانوێنێ، چونکە دەسەڵاتدار بە هێز و فێڵزانی دەسەڵاتەکەی خۆی لە پلەیەکی نزمەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر سەر دەخات. بەڵام پرسیار لێرەدا ئەوەیە، کە چۆن لەبرییەك بۆ ئەو دەسەڵاتدارییە ناڕەوایەی دەوڵەمەندەکان، کە ڕوسۆ هاوکات وەك مۆرکی سەرجەم دەسەڵاتدارییەکانی سەردەمەکەی دەیبینێ، دابنرێ!

ڕوسۆ لە سەرەتای "کۆنترا سۆسیال"دا مەبەستەکەی ڕوون دەکاتەوە: "دەمەوێ لەوە بکۆڵمەوە، کە ئاخۆ دەستوورێکی ڕەوا و گونجاو بۆ ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی هەبێ"، بێگومان گەر لێرەدا "مرۆڤ لەنێو بوونی خۆیدا وەربگرین"، هەروەها یاساکانیش بە چەشنێك وەربگیرێن، "وەك چۆن ئەوان گەرەکە ئاوها بن". [٢]

کەواتە ڕوسۆ بەدووی دەسەڵاتدارییەکی ڕەوادا دەگەڕێ، چونکە کێشەکەی ئەو لە کرۆکەوە "ئیدێی دەوڵەتە". بە واتایەکی دی، مەبەستی ڕوسۆ هیچاندنی دەسەڵاتداریی ئامادە و جێگرتنەوەی بە دەسەڵاتدارییەکی نوێ نییە، وەك چۆن بۆ نموونە مارکسیزم لە مێژوویەکی درەنگتردا هەوڵی بۆ دەدات. کاتێك ڕوسۆ دەبێژێ: "مرۆڤ بەئازادی دێتە جیهانەوە، بەڵام لە هەموو جێیەك لە کۆت و زنجیردایە"، ئەوا لێرەدا دروشمێکی شۆڕشگێڕی ڕاناگەیەنێ. ئەم ڕستە بەناوبانگەی ئەو تەنها "برێتییە لە گەڕان بەدووی بونیادێکی سیاسیدا" و ئەمەیش بە مەبەستێکەوە، کە "دەسەڵاتداری (...) بە شێوەیەکی دادپەروەرانە و هەروەها بۆ مەبەستێك ڕێك بخات". [٣] ڕوسۆ بۆیە تەنها داوای ڕەوایەتیدان بە دەسەڵات دەکات، چونکە ئەو وا باوەڕ دەکات، کە دووبەشبوونی مرۆڤ بەسەر بوون و ڕواڵەتدا سەرجەم مرۆڤان بە سەروەر و کۆیلەوە دەگرێتەوە، کەواتە گەر مرۆڤ تەنانەت خاوەنی دەسەڵات و هێزیش بێ بەسەر مرۆڤە بەکۆیلەکردووەکانیدا، ئەوا هێشتا هەر لە ئەوان کۆیلەتر دەبێ. بەم پێیە کۆیلەتی هەمووان دەگرێتەوە و تەنها بە هەڵگێڕانەوەیەکی شۆڕشگێڕی لەناو نابرێ.

بەڵام مرۆڤ لەم هەنگاوەیدا بۆ دەسەڵاتدارییەکی ڕەوا گۆڕان بە هێزی نوێ نادات، بەڵکو تەنها هێزەکانی ئامادە یەك دەخات و بەرەو پێشیان دەبات. کۆی ئەو هێزانە واتای پێکەوەچالاکبوونی کەسانێکی زۆر دەبەخشێ، کە ئامانجیان



هێشتنەوەی هێزەکان و ئازادیی هەر تاکێکی هاوچالاکە. کەواتە نابێ ئەم یەکخستنەی هێزەکانی ئامادە زیان بە ئازادیی تاك بگەیەنێ.

ڕوسۆ ئیدێی دەوڵەت بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە: "دەبێ فۆرمێکی کۆمەڵایەتی بدۆزرێتەوە، کە بە سەرجەم هێزی کۆیی ئەندامەکانی، بەرگری لە کەس و موڵکی هەر ئەندامێك بکات و بپارێزێ، کە لە نێویدا هەر تاکێك، کاتێك لەتەك هەمووواندا یەکی گرتووە، تەنها هۆشرایەڵی خۆی بێ و هەر ئاوا ئازاد وەك پێشووی بمێنێتەوە". [٤] بەڵام ئەم کێشەیە جارێ پێویستیی بە چارەسەر هەیە.

مەرجی گەیشتن بەم پەیمانە برێتییە لە "یەکگرتنەوەی تەواوەتیی (تۆتال) خۆی" هەر ئەندامێك لەتەك کۆمەڵگادا، ئەمەیش سەرجەم ئەندامانی یەکگرتوو بەبێ جیاوازی دەگرێتەوە. هیچ ئەندامێك بۆی نییە بیانوو بگرێ. گەر کەمترین گۆڕان لەم مەرجەدا بۆ خاتری هەر ئەندامێکی بیانووگرتوو بکرێ، ئەوا پەیمانی کۆمەڵایەتی هەڵ دەوەشێتەوە. چونکە گەر ئەو ئەندامە هێشتا خاوەنی کەمێك لە مافە خۆییە سەرەتاییەکانی بوو، ئەوا لە زۆر حاڵەتدا دەبێ بە دادگەری خۆی و لێرەشەوە دۆخی سروشت درێژە دەکێشێ. بەڵام گەر هەر یەکێك خۆی بە هەمووان ببەخشێ، ئەوسا خۆی بە هیچ کەس نابەخشێ.

بۆ ئەوەی ئەم مەرجە بەدی بهێنرێ، ئەوا ڕوسۆ ئیدێی دەوڵەت لەم فۆرمولەدا کۆدەکاتەوە: "هەر یەکە لە ئێمە کەسی خۆی و سەرجەم هێزی بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتییانە دەخاتە ژێر ڕکێفی بەرزترین پایەگای ڤۆلۆنتێ ژێنێرالەوە، ئینجا ئێمە هەر ئەندامێك وەك کەرتێکی جیانەکراوەی سەرجەم وەردەگرین". [٥] سەرەنجامی ئەم هەڵوێستە برێتییە لە دروستبوونی لەشێکی سیاسی، بە واتایەکی دی، دروستبوونی "کەسەدەوڵەت"ێك، کە ڕوسۆ وەك لەشێکی زیندوو و ئۆرگانی دەی بینێ و بە لەشی مرۆڤ دەیچوێنێ. دەسەڵاتی "سۆڤەرین" سەری ئەو لەشە پێك دەهێنێ، ئەندامەکانیشی ئەندامی لەشن.

پرنسیپی هەردووکیان، چ هینی کەسەدەوڵەت و چ هینی لەشی مرۆڤ، منێکە، کە سەرجەم دەگرێتەوە و برێتییە لە هەستداری و پەیوەنـدیی نێوخـۆی کەرتـەکان. ئاشکرایە هەر شێوەیەکی گۆڕان لەو پرنـسیپەدا بکـرێ، هـەردووکیان دەگرێتـەوە: گـەر پەیوەندییەکـە تـەنها پاڵیەکییـەکی شـوێنی بـێ، ئەوسا مرۆڤەکـە دەمـرێ و دەوڵەتیش هەڵ دەوەشێتەوە.

ڕوسۆ ناوی جیاوازی بۆ ئـەم لەشـە سیاسـییە هەیـە: "سـەردەمی زوو نـاوی پـۆلیس بـوو، ئـەمڕۆ نـاوی کۆمـار یـان کەسـەدەوڵەتە. گـەر ناچـالاك بـوو، ئـەوا ئەندامەکانی ناوی دەنێن دەوڵەت، بەڵام گەر چالاك بوو، ناوی دەنـێن سۆڤەرێن؛ ئـەو پەیوەسـت بـە هاوجۆرەکەیـەوە نـاوی دەسـەڵاتە، ئەندامەکانیـشی لـەنێو کۆمەڵدا ناویان گەلـە. گـەر ئەندامـەکانی لـە سۆڤەرێنێتیی دەوڵەتـدا بەشـداریان کرد، ئەوسا ناو دەنرێن سیتۆیا، بەڵام گەر لەژێر ڕکێفی یاساکاندا بـوون، ناویـان ژێردەستەیە". [6] ئێمە سەرڕای ئەم تێگەیشتانە هەمیشە یـەك تێگەیـشتمان لـە بەردەمدایە: ڤۆلۆنتێ ژێنێراڵ (ویستی گشتی) .

## ١-٢ ویستی گشتی

پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك "فاکت"، بـە شـێوەیەکی ئـەزموونی (ئـەمپیری)، شیاوی تێگەیشتنە نەك وەك "پرنسیپ". پەیمانەکە برێتییـە لـە "ویـستیارترین کـردار". بـەڵام ویـستی گـشتی بـە شـێوەیەکی ئـەمپیری شـیاوی تێگەیـشتن نییـە، بەڵکو تـەنها بـە شـێوەیەکی پرنـسیپی. چـونکە ویـستی گـشتی وەك فاکـت برێتـی نییە لە دراوێك، بەڵکو برێتییە لە داواکاری بۆ وازهێنان؛ هەرگیز دامەزراو نییە، بەڵکو هەمیـشە ئاڕاسـتەیە؛ هـەروەها هـیچ نـاوەرۆکێکی نییـە و کـاری چـاك وەك ڕێنومـا دانـانێ، بـەڵکو مـەرج و مێتـۆد. مەرجەکـەی برێتییـە لـە دیـاریکردنی



فۆرمێـك، کـە دەبـێ ویـستی مـرۆڤ هـەی بـێ، ئـەویش تـەنها بـۆ ئـەوەی خـۆی و کارەکەی چاك بن. ئەو فۆرمە برێتییە لە گشتیبوون، واتا: بۆ ئەوەی مـرۆڤ چاك و بەڕەوشت و ئـازاد بـێ، ئـەوا نابـێ ویـستی تایبـەتیی هـەبێ، بـەڵکو تـەنها دەبـێ ویستی گشتیی هەبێ. [7]

ویست لە دوو ڕووەوە گشتییە: پەیوەست بە سـەبژێکتەکەی و هـەروەها بـە ئۆبژێکتەکەیەوە. ویست لە پەیوەندیی یەکەمدا گشتی دەبێ، گەر لـە نـاخی هـەر تاکێك و هاوکات لە ناخی هەمووئاندا هـەبێ، بـەواتای گـەر ویـستی سـەرجەم بـێ. بەڵام ویست لە پەیوەندیی دووەمدا گشتی دەبێ، گەر هەر تاکێك بـەبێ جیـاوازی و هاوکات هەمووان بگرێتەوە، واتا ئاڕاستەی سەرجەم کرابێ. ویست وەك ویـستی سـەرجەم، کـە ئاڕاسـتەی سـەرجەم، واتـا ئاڕاسـتەی خـۆی دەکـرێ، برێتییـە لـە ئۆتۆنۆمی و ئازادی. چونکە ئێستا ویستێکی ڕەها و ئۆبژێکتیڤییـە، کە بـە مـرۆڤ نالێ "چی" ئەنجام بدات، بەڵکو فـەرمان دەدات، کـە مـرۆڤ "چۆن" بریـار بـدات، ئەم بڕیـارەش تـەنها لـە ویـستەوە بـۆ ویـست دەدرێ. بـە کـورتی، مـرۆڤ دەبـێ لـە خوای نێو ناخییەوە، واتا لە ویژدانییەوە، هەڵوێست بنوێنێ. [8]

مرۆڤ بە بڕوای ڕوسـۆ بـەم بەسـتنەوەیە ئـازادیی پـێ دەدرێ. ئێـستا تـاك و کۆمـەڵ خۆیـان لـە پەیوەندییـەکی نێوخۆییـدا دەبیننـەوە. ئـەوەی تـاك دەیـەوێ، دەبێ بەزەروورە هەمان شت بێ کە کۆمەڵ دەیەوێ. ویستی خۆیی و کۆمەڵایـەتی دەبێ یەکانگیر بن و هەر لەنێو ئەم تاکە ویستەشدا یەکەیەك پێکدەهێنن. ناشـێ دوو ویست لەنێو کۆمەڵدا هەبن. گەر تاك خۆی دەوڵەت بـوو، ئەوسـا هۆشـرایەتی خۆی دەبێ. یەکخستنی کۆمەڵێك تاکی ئازاد، کە بڕیار دەدەن، واتا ئۆتۆنۆمن، بـە بڕوای ڕوسۆ هیچی دی جگە لە ئۆتۆنـۆمی ناگەیـەنێ. ڕوسـۆ پرنـسیپی یـەکگرتن لەنێو ئازادی یان ئۆتۆنۆمیدا بەدیدەکات. ئێستا چیدی دەوڵەت گەرەنتیی ئـازادی نادات، بەڵکو خۆی بەپێی جەوهەری ئازادییە. [9]

بەڵام كە ویستی گشتی ڕێنوما و داواكارییە، ئەوا ئەو واتایە نابەخشێ، كە گوایە لە لایەن هەمووانەوە هۆشرایەڵی دەكرێ و هەمووش بە ویژدانن، بەڵكو ئەو واتایە دەگەیەنێ، كە هەموو مرۆڤێك ویژدانی هەیە و بەرپرسیارە بەرانبەر ویستە خاوەن ویژدانەكەی. بۆیە ڕوسۆ كرداری ئاكاریی وەك نیشانەیەكی بەرزی خۆخۆشویستن دەبینێ: "تەنانەت كاتێك مرۆڤ چاكە بۆ خاتری چاكە دەكات، (ئەوا ئەم كارەی تەنها -ن) لە پێناوی (...) بەختیاریی خۆیدایە، چونكە هیچ شتێك وەك كرداری ئاكاریی شادییەكی ئاوها باڵا بە خۆ نابەخشێ، لە ڕاستیشدا هەموو مرۆڤێكی خراپ نابەختیارە. پاداشتی كرداری ئاكاریی برێتییە لە خۆڕەزامەندی: ،،باڵاترین بەختیاری لە خۆڕەزامەندیدایە. ئێمە لەسەر زەمین دەژین، هەتا شایانی ئەم پیرۆزییە بین و پێی بگەین. سۆزەكانمان بۆ نواندنی زۆر ڕەفتار ناچارمان دەكەن، بەڵام ویژدان دەمان گێڕێتەوە،،". [١٠]

بەڵام مرۆڤ هەموو كات دوای دەنگی ویژدانی ناكەوێ، بەڵكو خۆویستیی بێجڵەو وەك بناغەی تێڕوانین و ژیانی دادەنێ. بۆیە ڕوسۆ ویستی گشتی نەك تەنها لە ویستی خۆیی، بەڵكو هەروەها لە ویستی هەمووانی جیا دەكاتەوە. ئەم ویستەی هەمووان بۆ ئەو هیچی دیكە جگە لە كۆكراوەیەك پێك ناهێنێ: "جیاوازییەكی گەورە لە نێوان ویستی هەمووان و ویستی گشتیدا هەیە. ئەم ڕوو دەكاتە بەختیاریی گشت، بەڵام ویستی هەمووان ڕوو دەكاتە بەرژەوەندیی تایبەتی و برێتییە لە كۆی بەرژەوەندییە جیاكان". [١١] كۆ تەنها لە كەرتەكانی پێك دێ و ویستی گشتی سەرجەمە، بۆیە وەك سەرجەم لە كۆی ویستەكان گەورەترە. "هەنگاوێك لەپێشترە". ئێمە هەر لێرەوە دەتوانین لە هەڵوێستی ڕوسۆ بەرانبەر پارتی سیاسی و دەستە خۆییەكان تێبگەین. بۆ ئەوەی گەلی یەكگرتوو بەم سەرجەمە بگات، ئەوا ڕوسۆ داوا دەكات، كە نابێ پارتی سیاسی



لەنێو دەوڵەتدا هەبێ، چونكە، بە بڕوای ئەو، پارت هیچی دیكە نییە جگە لە نیشانەیەكی خۆویستی، بۆیە گەر هەبێ، ئەوا زیان بە دەوڵەت دەگەیەنێ.

لە كۆماری ڕوسۆدا تەنها ویستی گشتی هەیە و لە سنوورەكانی خۆی تێناپەڕێ. ئەمەیش نابێ ڕوو بدات، چونكە بە درێژبوونەوەی خاو دەبێتەوە. ڕوسۆ لەبەر ئەم هۆیە دژی دەوڵەتی گەورە و داگیركەرە، بە بڕوای ئەو قەوارەیەكی مامناوەندی زۆر گونجاوە بۆ دامەزراندنی كۆمارێك، چونكە ویستی گشتی توانای بڵاوبوونەوەی بەنێو دەروونی كۆمەڵدا دەبێ.

ڕوسۆ لە سروشتی ویستی گشتییەوە دەست دەداتە جیاوازیكردن لە نێوان دەوڵەتاندا و نرخە سیاسییەكانیان دیاری دەكات: ویستی گشتی دەشێ "بەرانبەر هاووڵاتییەكانی خۆی ڕاست بێ، بەڵام بەرانبەر بێگانە هەڵە بێ"، [١٢] واتا بەرانبەر دەوڵەتانی دیكە و ئەندامەكانیان تەنها ویستێكی تایبەتی دەبێ. لە نێوان دەوڵەتاندا هێشتا جیاوازی گەورە هەیە و پەیوەندییەكانیان، پەیوەست بە بەرژەوەندییە خۆییەكانیانەوە، جارێ لە دۆخی سروشتدان، ئەمەیش زۆر دوورە لە هاوشێوەیی سیاسی، بە چەشنێك، كە ئیتر لەم هاوشێوەییەوە بتوانن یەك بگرن: "ئەو كاتە مەزنەشاری جیهان بە لەشێكی سیاسی دەبێ، گەر مافە سروشتییەكەی هەردەم ویستی گشتی بێ و دەوڵەت و ئەندامە جیاكانی ئەندامی خۆیی بن". [١٣]

بەڵام دانانی ئەم ڕێژەیە نێو كۆمەڵ خۆیشی دەگرێتەوە. لەنێو كۆمەڵدا هێشتا هەر كۆمەڵی بچووكتر هەن و دوای بەرژەوەندییەكانی خۆیان دەكەون. ڕوسۆ ویستی ئەم جۆرە كۆمەڵانە لە دوو ڕەوەوە دیاری دەكات: ویستیان بەرانبەر ئەندامانی خۆیان ویستێكی گشتییە، بەڵام بەرانبەر كۆمەڵگا ویستێكی تایبەتییە. بۆیە "كۆمەڵە تایبەتییەكان هەمیشە لەژێر ڕكێفی ئەو كۆمەڵانەدان، كە لە نێویاندا خۆیان دەبیننەوە". [١٤] بۆ ئەوەی ویستی گشتی "بەدی بهێنرێ"،

ئەوا پێویستە ویستی نێو کۆمەڵە تایبەتییەکان وەربچەرخێنرێ و رووی بکرێتە ویستی گشتی. ڕوسۆ هەڵوێستێکی بەم چەشنە ناودەنێ "ڕەوشت". بە بڕوای ئەو "هەموو مرۆڤێك بەڕەوشتە، گەر ویستە تایبەتییەکەی هەردەم لەتەك ویستی گشتیدا جووت بێ".[١٥] چاکترین دەسوێژی ڕەوشتدانی مرۆڤ برێتییە لە فێرکردنی سیتۆیاکان بۆ خۆشویستنی نیشتمان. بەڵام نیشتمان لە لای ڕوسۆ نە لە سنوورەکانی و نە لە ئەندامانی پێکدێ، نیشتمان بۆ ئەو برێتییە لە کۆی نەرێت و حکومەت و دەستوور، بە کورتی، بوونی نیشتمان تەنها لە بوونی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە لە نێوان دەوڵەت و ئەندامەکانیدا. گەر ئەو پەیوەندییە نەبێ، ئەوا نیشتمانیش بوونی نابێ.

**١-٣ سۆڤەرین**

پەیمانی کۆمەڵایەتی بەرپرسیارییەکی جووتلایەنی لە نێوان تاك و کۆمەڵدا چێدەکات. هەموو ئەندامێك، کە پەیمانی لەتەك خۆیدا بەستووە، لە دوو ڕووەوە بەرپرسیارە: جارێك وەك ئەندامی سۆڤەرین بەرانبەر ئەندامان و جارێك وەك ئەندامی کۆمەڵ بەرانبەر سۆڤەرین. مەبەستی ڕوسۆ لێرەدا مافی هاووڵاتی نییە، کە بەو پێیە کەسێك ناچاری بەندبوون بەو بەرپرسیارییانەوە نییە، کە ئەو بەرانبەر خۆی هەیەتی. بۆ ڕوسۆ جیاوازی هەیە لە نێوان بەرپرسیاری بەرانبەر خۆ و بەرپرسیاری بەرانبەر سەرجەم، کە ئەندام کەرتێکێتی.

سەرجەم بە واتای سۆڤەرین، کە هەبوویەکی کۆییە و تەنها لە ئەندامانی خۆی، واتا ئەندامانی کۆمەڵ، پێك دێ، بۆیە نەشیاوە بەرژەوەندییەکی جیای لە



هینی ئەوان هەبێ. بەڵام ئەنجامدانی ویستی گشتی واتای سۆڤەرێنێتی دەگەیەنێ، چونکە تەنها ویستی گشتی بۆی هەیە هێزەکانی دەوڵەت ڕووەو ئەو ئامانجە بەڕێوە بەرێ، کە دەوڵەت لە پێناویدا دامەزراوە. ئەم ئامانجە برێتییە لە بەختیاریی گشت.

بۆ ڕوسۆ نەشیاوە سۆڤەرێنێتی کەرت بکرێ، چونکە ویست یان گشتییە یان گشتی نییە، یان ویستی گەلە یان ویستی کەرتێکە. لەم کێشەیەدا مەترسییەك بە بەرچاوی ڕوسۆوە دەشەکێتەوە: مەترسیی زاڵبوونی ویستی تایبەتی و پشتکردنە یاساکان، لێرەشەوە وەرگۆڕانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ دەسەڵاتدارییەکی تاکرەو. بۆیە گەر ئەندامێك لە هۆشرایەڵیی ویستی گشتی یاخی بوو، کە بوونی شتێکی نەشیاو نییە، ئەوا دەبێ ئەو ئەندامە لە لایەن سەرجەمەوە بۆ هۆشرایەڵی ناچار بکرێ. چارەسەرێکی نێوانی سەبارەت بەم کێشەیە مەحاڵە، بەڵام مەحاڵتر ئەوەیە، کە گەرەنتییەك بە هاریکاریی نێوان سۆڤەرین و ئەو ئەندامە بدرێ.

بەڵام گەرچی سەرجەم لە لای ڕوسۆ نەشیاوی کەرتبوونە، کەچی سەرباری ئەمەیش دوو پاڵهێز لەنێو دەوڵەتدا هەن، کە برێتین لە ویست و هێز. یەکەمیان بە واتای لێجیسلاتیف (دەسەڵاتی یاسادانەر)، دووەمیان بە واتای ئێکسەکوتیف (دەسەڵاتی بەجێگەیەنەر). دەسەڵاتی یاسادانەر لە لای گەلە وەك سۆڤەرێن یان وەك یاسادانەر، بەڵام ناشێ دەسەڵاتی بەجێگەیەنەر سەر بە گەل بێ، چونکە ئەم هێزە هیچی دی نییە جگە لە لەشێکی نوێ بۆ بەجێگەیاندنی هەندێك کاری تایبەتی، کە لە دەرەوەی سۆڤەرێنن.

بەم شێوەیە دەوڵەت پێویستیی بە ئۆرگانێکی تایبەتی دەبێ، واتا بە حکومەتێك، کە وەك هێزی گەیەنەر لە نێوان گەلدا وەك سۆڤەرین و گەلدا وەك

ژێردەستە بە ئەركی خۆی هەڵدەستێ، ئەم ئەركەشی برێتییە لە ئەنجامدانی داواكاریی یاساكان.

ئەندامانی ئەم لەشە نوێیە ناویان بەڕێوەبەر یان پارێزگارە، ژمارەیان كەم بێ یان زۆر، ئەمە بۆ ڕوسۆ رۆڵێكی ئەوتۆ نابینێ، چونكە ئێمە لە حاڵەتی ئەندامانی ئەم لەشە نوێیەدا بە "خزمەتكار"ەوە بەندین. (بڕوانە خوارەوە، "رۆڵی حكومەت").

## ١-٤ یاسا

لێرەبوون و ژیان لەتەك بەستنی پەیمانی كۆمەڵایەتیدا بە دەوڵەت دەدرێن. هەنگاوی دووەم برێتییە لە بزواندنی دەوڵەت ڕووەو ویستن و كردار بەرپێی یاسادانانەوە. چونكە ئەو پاڵهێزە، كە ئەم لەشەی بەرپێی پەیمانی كۆمەڵایەتییەوە پێكەوە لكاندووە، جارێ بڕیاری نەداوە، كە پێهەستانی چ كارێك بۆ هێشتنەوەی ئەو لەشە پێویستە.

بەڵام ڕوسۆ دەربارەی یاسای دانراو و لە ڕستەدا دارێژراو ناپرسێ، بەڵكو ئەو سەرەتا دەربارەی "سروشتی یاسا" دەپرسێ: هەر شتێك، كە لە خۆیدا چاك و بەجێ بێ، دەبێ بەپێی سروشتی لە پەیمانی مرۆڤ سەربەخۆ بێ. دادپەروەری، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، تەنها لە خواوە دێ و هەر خوا خۆیشی سەرچاوەیەتی، بەڵام گەر مرۆڤ بیتوانیایە ئەو دادپەروەرییە لەو بەرزییەوە وەربگرێ، ئەوسا لەسەر زەمین دەوڵەت و یاسا بۆ كۆمەڵ پێویست نەدەبوون. تەنها یاسا لەسەر زەمین بۆی دەلوێ ڕێكخراوی پێكەوەژیان دیاری بكات و بە مرۆڤ بڵێ، كە چ شتێك بۆ ڕێكخراوەكەی ئەو چاك و گونجاوە. یاسا، واتا ئەم دادپەروەرییە گەردوونییە، لە ئەقڵەوە هەڵدەقوڵێ و تەنها لە خوا خۆیەوە دێ، بەڵام بەبێ كاریگەری



دەمێنێتەوە، هەتا ئەو كاتەی گەرەنییەك سەبارەت بەوە نەدرێ، كە یاسا نابێ بەهۆی زیانی دادپەروەران و سوودی دادناپەروەران. بەتەنیا لەنێو ڕێكخراودا، واتا لەنێو پەیمانی كۆمەڵایەتیدا، دادناپەروەران دەخرێنە ژێر زەبرەوە. ئەمەیش سەرلەنوێ ئەو هۆیە پێكدەهێنێ، كە بۆچی پەیمان و یاسا پێویستن.

بەڵام ئایا یاسا چییە؟ یاسا لە لای ڕوسۆ برێتییە لە هەڵهاتنی، واتا كۆنكرێتبوونی ویستی گشتی، بە واتایەكی دی، برێتییە لە بڕیاری سەرجەم گەل بەسەر سەرجەم گەلدا. كەرەسە و فۆرم جەوهەری یاسا پێكدەهێنن: "فۆرم خۆی لە دەسەڵاتی بڕیاردەردا دەنوێنێ (...)، بەڵام كەرەسە لەو بابەتەدا، كە بڕیاری بەسەردا دەدرێ". كەواتە تەنها ویستی گشتی بۆی هەیە وەك سەبژێكتی یاسادانان دەربكەوێ. [١٦] هۆی ئەم داواكارییەی ڕوسۆ ئاشكرایە: لەبەر ئەوەی ئەو ویستە، كە بڕیار دەدات، گشتییە، ئەوا بابەتەكەیشی وەكو خۆی گشتی دەبێ: "كاتێك دەڵێم بابەتی یاسا گشتییە، ئەوا مەبەستم لەوەیە، كە یاسا لە ژێردەستەكانی وەك لەشێك و لە كردارەكانیان بە پێی ناوەرۆك و شێوەیان (واتا ئەبستراكت) دەڕوانێ، بەڵام هەرگیز ناشێ لە مرۆڤێك وەك تاك و لە ڕەفتارێك وەك حاڵەتێكی تایبەتی بڕوانێ. بەم شێوەیە یاسا دەتوانێ بڕیاری پریڤیلێگ بدات، بەڵام ناتوانێ بە كەسێكی تایبەتیی ببەخشێ؛ دەتوانێ چەند چینێكی جیاواز لە هاووڵاتی دروست بكات، بەڵام ناتوانێ دای بنێ كێ لەنێو ئەو چینانەدا وەردەگیرێ؛ یاسا دەتوانێ دەسەڵاتدارییەكی مۆنارشی دابمەزرێنێ، بەڵام ناتوانێ مۆنارشێك هەڵ ببژێرێ (...). بە كورتی، هەموو چالاكییەكی بەند بە بابەتێكی تایبەتییەوە دوورە لە دەسەڵاتی یاسادانەر". [١٧]

ڕوسۆ هەموو دەوڵەتێك، كە لە لایەن یاساوە ڕابەری بكرێ، ناو دەنێ كۆمار (ڕێپوبلیك)، جا دەسەڵاتدارییەكەی لە هەر شێوەیەكدا خۆی بنوێنێ، واتا ئەو دەوڵەتە دەشێ ئەریستۆكراسی، دیمۆكراسی یان مۆنارشی بێ، گرنگ لێرەدا

ئەوەیە، کە ویستی گشتی ڕابەری بێ: "هەموو دەوڵەتێکی ڕەوا ڕێپوبلیکە". [١٨] "تەنها لە دەوڵەتێکی بەم چەشنەدا ڕێس پوبلیکا (مەسەلەی خەڵکان — ن) نرخێکی هەیە و لەنێویدا بەرژەوەندیی گشت باڵادەستە". [١٩] بەم پێیە یاسا سەربەخۆیە لە پەیمانی مرۆڤ و هەر ئەمیش بۆی هەیە ڕێکخراوی پێکەوەژیان دیاری بکات.

گەلی ژێر دەستەی یاساکان دەبێ خۆی خاوەنیان بێ. تەنیا ئەو ئەندامانەی یەك دەگرن، بۆیان هەیە مەرجەکانی کۆمەڵگا دابنێن. بەڵام ئایا چۆن بە کارێکی ئاوها هەڵدەستن؟ ئایا بەهۆی یەکگرتنەوەیان لە بابەتێکدا؟ ئایا کۆمار خاوەنی ئۆرگانێکە، کە سووك و ئاسان ویستی خۆی ڕابگەیەنێ؟ بەڵام کێ ئەو پایەگایەی پێ دەبەخشێ، هەتا بڕیار بدات و پاشان ڕای بگەیەنێ؟ "جەماوەر"ێکی کوێر، کە زۆر جار نازانێ چیی دەوێ، چۆن دەتوانێ بە پرۆژەیەکی ئاوها مەزنی وەك یاسادانان هەستێ؟ بێگومان "گەل" هەمیشە چاکەی دەوێ، بەڵام هەموو کاتێك لە لایەنی خۆیەوە نای ناسێ. چونکە ئەو بڕیارە، کە ویستی گشتی بەڕێوە دەبات، هەموو کاتێك ڕۆشن نییە. کەواتە پێویستە ڕێگەی ڕاستەقینە نیشانی "گەل" بدرێ و شتەکانی لەو شێوەیەدا بۆ ڕوون بکرێنەوە، وەك ئەوان خۆیان بە ڕاستی چۆنن، یان تەنانەت هەندێك جار چۆن لە لای ئەو "دەربکەون". "هەندێك کەس چاکە دەبینن و ڕەفزی دەکەن، بەڵام ،،خەڵك،، چاکەی دەوێ و نای بینێ. کەواتە هەردووکیان پێویستییان بە ڕێبەر هەیە". [٢٠]

کۆمار پێویستیی بە یاسادانەرە (لێجیسلاتوێر)، واتا بە "مرۆڤێکی شاز"، کە خاوەنی "زیرەکییەکی نائاسایی" و "دەروونێکی ڕەحیم" بێ، کە "هەموو سۆزەکانی مرۆڤ بناسێ و لەژێر ڕکێفی هیچ کامێکیاندا نەبێ (...)، کە بەختیاریی لە ئێمە سەربەخۆ بێ و لەگەڵ ئەوەشدا خەمی بەختیاریی ئێمە بخوات". [٢١] بەڵام ئەم سیمایانەی لێجیسلاتوێر لە سنووری سیماکانی مرۆڤ



تێپەڕ دەکەن، بۆیە ڕوسۆ خۆی ئەم لایەنە ڕوونتر دیاری دەکات: "مرۆڤ پێویستیی بە خوایەکە هەتا یاسای بۆ دابنێ". [٢٢] ئەم کێشەیە پێویستیی بە ڕوونکردنەوە هەیە.

لێجیسلاتوێر یاسادانەر نییە. گەر لێجیسلاتوێر دانەری یاسا بێ، ئەوا یاساکان هینی خۆی دەبن و ئەمەش بە واتای ویستێکی تایبەتی دەبن. لێجیسلاتوێر تەنها بەهۆی دانابییەکەیەوە ویست و بەختیاریی گەل دەناسێتەوە، هەروەها پایەگاکەی نە دەسەڵاتدارییە و نە بەڕێوەبەرایەتییە. "لێجیسلاتوێر کۆمار دادەمەزرێنێ، بەڵام خۆی لە دەستوور بەدوور دەگرێ. پایەگاکەی ئاستێکی تایبەتی و بەرزترە و هیچ پەیوەندییەکی بە دەسەڵاتداریی مرۆڤەوە نییە". [٢٣]

ئەرکی لێجیسلاتوێر بە هەمان شێوەی پایەگاکەی شازە، لێرەشدا ئەو پەیوەست بە گەلی خۆیەکخستووەوە ئاڕاستەی کێشەی جەوهەری دەبێتەوە: گەل لە زمانی مۆرالپەروەری و دانایی، واتا لە زمانی یاسادانەر (و فەیلەسوف) تێناگات. هەموو ئەندامێکی کۆمەڵ تەنها بەو پلانانە ڕازی دەبێ، کە پێی هەڵدەسووڕێن و لە سنووری سوود و بەرژەوەندییەکانیدان. بۆیە ئەرکی سەرەکیی لێجیسلاتوێر بریتییە لە پەروەردە، لێرەشدا ئەو دەبێ، وەك ڕوسۆ داوای دەکات، خودی مرۆڤ هەڵبگێڕێتەوە: "دەبێ فۆرمی هەموو تاکێك، کە لە خۆیدا سەرجەمێکی کامڵ و سەربەخۆیە، بۆ کەرتی سەرجەمێکی گەورەتر وەربگۆڕێ، تاکو لێوەی هەموو یەکێك هەتا ڕادەیەك بوون و ژیانی وەربگرێ؛ دەبێ پێکهاتەی مرۆڤ هەڵبگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی بەهێزتری بکات (...)؛ دەبێ لە مرۆڤ هێزە خۆییەکانی بسەنێ و هێزی دیکەی ئەتۆی پێ بدات، کە بە ئەو نامۆن و بەبێ یارمەتیی کەسانی دی نازانێ بەکاریان بهێنێ". [٢٤]

بەم چەشنە لێرەوە بە نەسازیی ئازادییەکەی ڕوسۆ دەگەین: "بۆ ئەوەی ئەو گەلەی کە جارێ لە دروستبووندایە، چێژ لە پەیڕەوە دروستەکانی سیاسەت

ببینێ و دوای بنەما ئاقڵانەکانی دەوڵەت بکەوێ، ئەوا دەبێ سەرەنجام ببێ بە هۆ. هۆشی کۆمەڵگا، کە دەبوو بەرهەمی دەستوور بێ، دەبێ ئێستا لە بەردەم یاسادا ببێ بە ئەوە"، کە دەبوو لە خودی ئەو دەستوورەوە "(دروست) ببێ". [٢٥]

بەڵام لێجیسلاتوێر، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، ناتوانێ بۆ گۆڕینی گەل هێز بەکار بهێنێ، بۆیە زۆر جار ناچارە "بەزەروورە هانا بۆ ئۆتۆرێتییەکی دیکە بەرێ، کە بەبێ زەبر ڕاکێشەر و بەبێ گفتدان بڕواهێنەر بێ" بە مرۆڤ. [٢٦] ڕوسۆ نموونەی بەم چەشنە لە مێژووی هەندێك گەلدا دەبینێ. باوکانی ئەو جۆرە گەلانە هەمیشە ناچار بوون هانا بۆ ئاسمان بەرن و بانگی خواکان بکەن، هاوکات داناییەکەیان وەك پەیامی نێردراوی خوا ڕابگەیەنن. ڕوسۆ نموونەی ئەو جۆرە باوکانە دەهێنێتەوە، کە بریتین لە موسا، لیکروگ، محەمەد. هەروەها گەلانی دیکە هەبوون، کە بۆ ئەنجامدانی پرۆژەیەکی هێندە مەزنی وەك یاسادانان بێگانەیان ڕاسپاردووە یاسایان بۆ دابنێ، چونکە ئەو جۆرە گەلانە نەیان ویستووە ویستێکی تایبەتیی نێو خۆیان بڕیاربدات.

بەڵام زۆر جار ڕوویداوە و هاوکات هەمیشە دەشێ ڕوو بدات، کە کەسانی فێڵزان و ساختەچی دەربکەون و مافی پەیامبەری بە خۆیان بدەن. ڕوسۆ لەبەر ئەم هۆیە کارەکتەری لێجیسلاتوێر بە پوختی دیاری دەکات: تەنها "دەروونی مەزنی لێجیسلاتوێر" وەك "موئجزەیەکی مەزن" ڕەوایەتی بە پەیامەکەی دەدات. ئەو فۆرمەی لێجیسلاتوێر بە گەلی دەبەخشێ، وەك فۆرمی ئەو فێڵزانانە کورتخایەن نابێ، کە دێن "ڕەوەیەك شێت لە دەوری خۆیان کۆ دەکەنەوە". [٢٧]

بێگومان ئێمە لە لای ڕوسۆ بەدووی بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی و چەسپاندنی یاساکاندا بە کۆتایی کێشەی دەوڵەت ناگەین، واتا لەو شێوەیەدا کە ئیتر ژیانێکی دادپەروەر و بەختیار سەرەوتێنرا بێ. ئێمە لە کۆمارەکەی ڕوسۆدا گۆڕانێکی مێژووییمان بە ئاراستەیەکەوە لە بەردەمدایە، کە بریتییە لە



چێکردنەوەی گەورەترین نزیکیی شیاو لە دۆخی سروشت، ئەمەیش تەنها بە ڕێی موئجیزەی یاساوە دەشێ. گەر مرۆڤ یاساکان وەك دەربڕینی ویستی خوایەکی ئەزەلی ببینێ، ئەوسا ئەو، وەك لە حاڵەتی یاساکانی سروشتدا، نەشیاوە بتوانێ لێیان لا بدات، بە پێچەوانەوە وەك زەروورە وەریان دەگرێ؛ ئەوسا یاساکان، بە هەمان شێوەی یاساکانی سروشت، کە هەرگیز لە هێزی مرۆڤەوە چێ نابن و مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ وەریان بچەرخێنێ، شیاوی لێلادان نابن. گەر ئەم پەیوەندییە بەدی بهێرێ، ئەوسا بەندبوونی مرۆڤ "بە یاساکان و ئۆرگانەکانی بەجێگەیەنەری (...) ئەو یاسایانەوە" [٢٨] ئاراستەیەك ڕووەو بەندبوون بە شتەکانەوە وەر دەگرێ، ئەمەیش بە چەشنێك، کە مرۆڤ وەك ڕێگری ئازادییەکەی خۆی دایان نانێ.

## ١-٥ ڕۆڵی حکومەت

گەرچی نەشیاوە سۆڤەرێن کەرت بکرێ، کەچی ڕوسۆ سەرباری ئەمەیش ئۆرگانێکی دووەم لەنێو دەوڵەتدا دیاری دەکات، واتا حکومەتێك، کە ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە ئەنجامدانی ئەو فرمانانەی لە دەرەوەی سۆڤەرێندان. بەم پێیە لەنێو دەوڵەتدا دوو دەسەڵات هەن: دەسەڵاتی یاسادانەر، کە لە لای گەلە، هەروەها دەسەڵاتی بەجێگەیەنەر یان ئەنجامدەر، کە ناشێ لە لای گەل بێ. ڕوسۆ حکومەت بەتوندی لە سۆڤەرێن جیا دەکاتەوە، ئینجا بۆ ئەوەی ئەم جوودایییەی بەڕوونی دیار بێ، ناوی دەنێ "قەوارەیەکی نێوەندی، کە پەیوەندیی جووتسەریی لە نێوان ژێردەستەکان و سۆڤەرێندا چێ دەکات". حکومەت لە لایەن سۆڤەرێنەوە ڕادەسپێردرێ، یاساکان بەگەڕ بخات و هاوکات ئازادییە هاووڵاتی و سیاسییەکان بپارێزێ. [٢٩]

دامەزراندنی حکومەت پەیمانێکی نوێ نییە. ئەم دامەزراوە هیچی دیکە نییە جگە لە "ڕاسپێردراوێك"، هەروەها ئەندامەکانی، واتا بەڕێوەبەر و پارێزگارەکان، هیچی دیکە نین جگە لە کاربەدەستی ئاسایی سۆڤەرێن. هەر بۆیە سۆڤەرێن دەتوانێ ژمارەیان دیاری بکات، بییان گۆڕێ یان بییان کشێنێتەوە. کەواتە حکومەت نوێنەری گەل نییە و ئەمەیش لە لای ڕوسۆ شتێکی نەشیاوە، چونکە سۆڤەرێنێتی لە کرۆکەوە لە ویستی گشتی پێکدێ و ویستیش ڕێ بە نوێنەرایەتیکردن نادات. ویست یان ویستە یان ویست نییە.

حکومەت دوای دامەزراندنی دەسەڵاتی یاسادانەر دادەنرێ. ڕوسۆ ئەمە لە دوو کرداردا دیاری دەکات، کە بریتین لە "دەرکردن و ئەنجامدانی یاسا". سۆڤەرێن بەڕێی دەرکردنی یاساوە بڕیار بۆ دانانی حکومەتێك دەدات، بەڵام گەل لە کرداری دووەمدا چەند "ڕێبەر"ێك (کاربەدەستێك) ڕادەسپێرێ بۆ ئەوەی حکومەتێك دابمەزرێنن. ئەم کردارەی دووەم دانانی یاسایەك نییە، بەڵکو بەرهەمی یاسای دەرکراوە. [٣٠]

بەڵام ئێستا لەم حاڵەتەشدا کێشەیەك بۆ ڕوسۆ دێتە ئاراوە: گەل، کە هەم سۆڤەرێن و هەم ژێردەستەیە، چۆن دەتوانێ لەم حاڵەتەی حکومەتدا ببێ بە "کاربەدەست" (مووەزەف)؟ ڕوسۆ ئەم کێشەیە ئاوها چارەسەر دەکات، کە ئەو دەیەوێ دانانی حکومەت وەك یەکێك لە "مۆرکەکانی لەشی سیاسی" ببینێ. ئەم مۆرکە نەرمێتییەکی بزواو بە لەشی سیاسی دەدات و "بەتوانای دەکات بۆ ئەوەی دەسوێژی لە رواڵەتدا بەیەك نەساز پێکەوە بگونجێنێ"، لێرەشەوە بەهۆی ئەم مۆرکەوە وەرگۆڕینێکی کتوپڕی سۆڤەرێنێتی بۆ دیموۆکراتی دێتە ئاراوە. ئەمە بەبێ هیچ دۆخگۆڕییەکی هەستپێکەر ڕوو دەدات، هەروەها "تەنها بەڕێی پەیوەندییەکی نوێی هەمووان لەتەك هەمووانـدا" پیادە دەکرێ و ئێستا ئەو



هاووڵاتییانە، کە وەك کاربەدەست دیاری کراون، "لە ئەکتی گشتییەوە بۆ ئەکتی تایبەتی و لە یاساوە ڕووەو بەجێگەیاندن دەپەڕێنەوە". [٣١]

کەواتە دانانی حکومەت بەڕێی "ئەکتێکی ئاسانی ویستی گشتییەوە" [٣٢] ڕوو دەدات. بەدووی ئەمەدا "ئەم حکومەتە کاتییە لە دائیرەدا دەمێنێتەوە، گەر هاتوو ئەمە فۆرمێکی خوازراو بوو، یان بەناوی سۆڤەرێنەوە ئەو حکومەتە دادەنێ، کە لە لایەن یاساوە تەرخانکراوە". [٣٣]

حکومەت تەنها کاتێك ئەرکەکانی خۆی بەجێ دەگەیەنێ، گەر لەسەر ڕێنوماکانی ویستی گشتی بڕوات. کەواتە سێ ئەڵقەکەی کۆماری ڕوسۆ، واتا سۆڤەرێن و حکومەت و هاووڵاتی، هەر یەکەیان ئەرکی خۆی هەیە. بێگومان ئەم ئەرکانە تەنها بەرواڵەت لە یەکتری جیاوازن، بەڵام هەموویان لە کرۆکدا دیاریکراوی ویستی گشتین: "گەر سۆڤەرێن بییەوێ حوکم بکات یان حکومەت بییەوێ یاسا دابنێ یان هاووڵاتییەکان لە هۆشرایەڵی یاخی ببن، ئەوسا بەدووی ڕێکخراودا نارێکخراو دێ، دەسەڵات و ویست چیدی پێکەوە کردار نانوێنن و دەوڵەتی هەڵوەشاوە بۆ دەسەڵاتدارییەکی تیرانی و بۆ شێواوی دادەڕوخێ". [٣٤]

## ٦-١ ئابوریی دەوڵەت

ئەگەر ویستی گشتی باڵاترین پرنسیپی ئابووریی گەل بێ و وەك بنەمای حوکمداری وەربگیرێ، ئەوسا چاودێریی کاربەدەستان پێویست نابێ، کە ئاخۆ مشووری گەل بخۆن یان دوای بەرژەوەندییەکانی خۆیان کەوتبن. ڕوسۆ لەم تێڕوانینەوە ئابووری نەتەوەیی بەسەر دوو شێوازی جیادا بەش دەکات: ئابووریی میللی و تیرانی. شێوازی یەکەم بریتییە لە ئابووریی سەرجەم دەوڵەت، لەم حاڵەتەدا یەکێتییەکی ویست و بەرژەوەندی لە نێوان گەل و کاربەدەستاندا

چەسپێنراوە. بەڵام شێوازی دووەمی ئابووریی نەتەوەیی لە هەموو ئەو وولآتانەدا بەدی دەکرێ، کە گەل و حکومەت دوای بەرژەوەندیی جیاواز کەوتوون و بەمەیش ویستی جیاوازیان هەیە.

بەڵام تیۆرییەکەی ڕوسۆ سەبارەت بە ئابووریی سەرجەم دەوڵەت ئەو واتایە نابەخشێ، گوایە ڕوسۆ لایەنگری سیستەمێکی ئابووری بێ، کە مافی خاوەنداری بۆ هۆکانی بەرهەمهێنان بە مۆنۆپۆلی دەوڵەت بکات، بە پێچەوانەوە، بۆ ڕوسۆ "خاوەنداریی تایبەتی برێتییە لە زەمینەی کۆمەڵگای سیتۆیایی و گەرەنتییەکی ڕاستەقینەیە بۆ پەیوەستبوونی هاووڵاتییەکان". (٣٥)

زەرووەری خاوەنداری لە لای ڕوسۆ بەندە بە پێکەوەلکاندنی کاری مرۆڤ و شتی کارتیاکراوەوە. بەڵام ئەم پەیوەندییە بۆ ئەو هێندە گرنگ نییە، بەڵکو پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ زۆر گرنگترە، چونکە لەم پەیوەندییەوە مەترسییەك رووەو ئەو حاڵەتە نەخوازراوە سەر هەڵدەدات، کە یەکێکیان ببێ بە سەروەر و ئەویدیکەیان بە کۆیلە، ئەمەش بێگومان لە ڕوانگەی ڕوسۆوە ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە هەردووکیان ببن بە کۆیلە. بەڵام ڕوسۆ، وەك لە سەرەوە بینیمان، ئەم پەیوەندییەی لەنێو کۆمارەکەیدا بەڕێی "موئجیزەی یاسا"وە کووژاندۆتەوە. ئێستا یاسا هاووڵاتییەکانی لەنێو کۆماردا ژێردەستە و ئازاد کردووە، بۆیە " گونجاندنی بەڕێوەبەرایەتی لەتەك یاسادا برێتییە لە یەکەم مەرجی ئابووری نەتەوەیی". (٣٦)

ڕۆڵی بەرێوەبەرایەتیی حکومەت برێتییە لە بەجێگەیاندنی داواکارییەکانی ویستی گشتی، لێرەشدا گرنگترین ئەرکی حکومەت ئەوەیە کە هەژار لە دەوڵەمەند بپارێزی. بەڵام حکومەت ئەم کارە بەو ڕێیەوە ئەنجام نادات، کە "بچێ سامانی دەوڵەمەندەکان داگیر بکات"، بەڵکو حکومەت دەبێ "ڕێگەی کۆکردنەوەی سامان لە هەمووان بگرێ؛ نەك نەخۆشخانە بۆ هەژارەکان



دروست بکات، بەڵکو لە نەخۆشی بییان بپارێزێ؛ (...) نەچێ بە ڕێی دامەزراندنی ئیندوستری و هونەری لوکسوسەوە زیان بە پیشە دەستییە سوودمەند و پڕئەرکەکان بگەیەنێ، یان کشتیاری بە قوربانیی بازرگانی بکات". (٣٧)

بەم پێیە گەرەکە لە کۆماردا هەر یەکە "کەمێك" موڵکی هەبێ، بەڵام نابێ هیچ کەس "فرە" موڵکی نەبێ. جیاوازیی گەورەی سامان بۆ ڕوسۆ تەنها لەبەر ئەو هۆیە پڕمەترسی نییە، کە پەیوەندیی بەندبوون لە نێوان هاووڵاتییەکاندا دەهێنێتە ئاراوە، بەڵکو لەبەر ئەو هۆیەش پڕمەترسییە، چونکە سامانی زۆر دەبێ بەهۆی پشتکردنە یاساکان و سەرهەڵدانی هەژاری. گەر ئەم بەدحاڵەتە بێتە ئاراوە، ئەوسا دەوڵەت و ئۆتۆرێتیی لێك دەترازێن، پاشان دەسەڵات تەنها بەرواڵەت لە دەستی کاربەدەستاندا دەبێ، بەڵام لە هەقیقەتدا دەکەوێتە دەستی دەوڵەمەندەکانەوە، ئەمەیش بە ئەنجامێکەوە، کە دەوڵەت دادەڕوخێ یان فۆرمی دەسەلاتدارییەکی تیرانی وەردەگرێ.

بۆ ڕوسۆ بە هەمان شێوە هەژاری و تەنانەت بێسامانی نەخوازراون. گەر هەژاری هەبێ، ئەوسا هەژارەکان ناچار دەبن ئازادییەکەیان بە دەوڵەمەندەکان بفرۆشن. "هەژار" و "دەوڵەمەند" لە لای ڕوسۆ تێگەیشتی ڕێژەیین، هەردووکیان پێکەوە سەر هەڵدەدەن و مەرجی بوونی یەکترین. بە پێی داواکاریی ئەو چاکترە هەر یەکێك بتوانێ بە کارەکەی خۆی بژی، ئەمەیش تەنها دەشێ کاری "سەربەخۆ" بێ. کاری کرێ ئەو ڕاستییە دەگرێتە خۆ، کە مرۆڤێك "ناچارە خۆی بفرۆشێ "و یەکێکی دی "دەتوانێ بیکڕێ ".

ئەوە ئەرکی لێجیسلاتۆرە، کە چارەسەری کێشەی ئابووریی کۆمار بکات. لێجیسلاتۆر پێویستە دوای چەسپاندنی یاساکان ڕێگەی پەیداکردنی زەخیرە ئامادە بکات. باشترین ڕێگەی ئەو لەم کێشەیەدا ئەوەیە، کە فۆندێکی سەرمایەی

دەوڵەت دابمەزرێنێ، بۆ ئەوەی موچەی کاربەدەستان مسۆگەر بکرێ، هەروەها زەخیرە بۆ ڕۆژی تەنگانە بخرێ و پرۆژەی گشتی بەئاسانی بەڕێوە ببرێ. ڕوسۆ زەخیرەکان ناو دەنێ فیسکوس، گەر دراو بوون، بەڵام ناویان دەنێ موڵکی گشتی، گەر زەویوزار بوون. لێجیسلاتوێر دەبێ "بە تایبەتی فەزڵ بە موڵکی گشتی بدات"، چونکە کشتیاری "مسۆگەرترین دەسوێژە بۆ ساتارکردنی پێداویستییەکانی دەوڵەت". [٣٨]

سەرهەڵدانی کشتیاری لە "دیسکورزی نایەکسانی"دا بریتی بوو لە پێشکەوتن، چونکە مرۆڤ بەو ڕێیەوە دەستی بەسەر سروشتدا دەگرت. بەڵام کشتیاری لەتەك خۆیدا هەروەها یەکەم نایەکسانیی لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا هێنا. کشتیاری ئێستا بە پێچەوانەوە بۆ کۆمارێکی پێکهاتوو لە هاووڵاتیی هاوسامان چاکترین بناغەی ژیانی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێ، هاوکات ژیانی گوند لە بەراورد لەتەك ژیانی شاریدا، وەك ڕوسۆ دەیبینێ، ساغتر و نزیکترە لە سروشت، هەروەها بەئاکارترە لە ژیانی شاری. بەم پێیە کشتیاری لەنێو کۆماردا نەك تەنها مسۆگەرترین دەسوێژ بۆ ساتارکردنی پێداویستییەکانی دەوڵەت پێکدەهێنێ، بەڵکو هاوکات نزیکیی نێوان مرۆڤ و سروشت چێ دەکاتەوە.

## ١-٧ کاتی دەمەزراندنی کۆمار

لە ڕوانگەی مۆنتێسکیو هەموو گەلێك ناتوانێ بە ئازادی بگات. ڕوسۆ ئەم ڕوانگەیەی مۆنتێسکیو وەردەگرێ و ڕای دەگەیەنێ، کە گەیشتن بە فەوارەیەکی سیاسی واتای ئازادی بۆ گەلێك نابەخشێ. ئازادی لە لای ڕوسۆ تەنها لەنێو کۆماردا (ڕێپوبلیکدا) شیاوی بەدیهێنانە، چونکە لە ڕوانگەی ئەو تاکە دەسەڵاتدارییەکی ڕەوایە. بەڵام نەشیاوە دەستووری کۆماری بۆ هەموو گەلێك



دابنرێ. هەموو گەلێك توانای وەرگرتنی ئەو تاکە فۆرمە ڕەوایەی دەسەڵاتداریی نییە، ئەمەش بە چەشنێك، کە ئیتر هەر ئەندامێکی بتوانێ بڕیاری دروست لە پێناوی بەختیاریی گشتیدا بدات، هەر یەکێك لە ئەندامبوونی خۆی لەنێو ئەڵقەی سۆسیالدا بەئاگا بێ، بەڵام هاوکات ڕێ نەدات ئازادییە کەسییەکەی لە لایەن خۆویستان و فێڵبازانی زمانشیرینەوە لێ زەوت بکرێ. بۆ ڕوسۆ هەندێك گەل لە جەوهەرەوە بە کەڵکی ئازادی نایەن، هەندێکی دی لەسەر ڕێگەی دازنان هێندە پێشکەوتوون، بە واتایەکی دی هێندە ژێر پەڕیون، کە ئیتر چیدی ناتوانن بە ئازادیی کۆماری بگەن.

ڕێکخراوی کۆماریی دەوڵەت لە لای ڕوسۆ لە شوێنکاتێکی تایبەتیدا بەدی دەهێنرێ. گەل لەم شوێنکاتەدا هێشتا "ساکارێتیی سروشتی"ی نەدۆڕاندووە و هەست بە پێداویستیی سۆسیالبوون دەکات. ڕوسۆ ئەم قۆناغە ناو دەنێ "لاوێتیی گەل". ئێستا لەم ساتەی دامەزراندنی کۆماردا سەرەتادانی فێرکردنی ئاقلانە (ڕاسیۆنال) جێی پەروەردەی "نێگەتیف" دەگرێتەوە، ئەمەیش بۆیە دەشێ، چونکە گەل هێشتا لە هەرەتی لاوێتیدایە و بە ئاسانی شیاوی فێرکردن یان پەروەردەکردنە. بە بڕوای ڕوسۆ "زۆربەی گەلان، بە هەمان شێوەی مرۆڤ، تەنها لە گەنجێتیدا توانستی فێربوونیان هەیە، بەڵام نەشیاوە دوای پیربوونیان چاك بکرێنەوە. هەر ئەوەندەی بوون بە خاوەنی ئاکاری تایبەتی و لە نێویاندا پێشبڕیار خۆی چەسپاند، ئیتر ویستی چاککردنەوەیان پڕمەترسی و بێسوود دەبێ. گەل بەرگەی ئەو ئازارانە ناگرێ، کە لە هەوڵی نەهێشتنیاندا لەسەر لەشی دەچوزێنرێنەوە. ڕێئەکسیۆنی گەل لە هێنی نەخۆشە گەوجەکان دەچێ، کە لەکاتی ڕوانیندا لە پزیشك لەرزیان لێدێ". [٣٩] ڕوسۆ لە دۆخێکی بەم چەشنەی گەلدا گێڕانی شۆڕش وەك هەوڵێکی خوازراو دەبینێ، بەڵام دەڵێ، کە سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە تەنها لە لای ئەو گەلانە دەشێ، کە هێشتا بەربەڕن. ڕوسۆ بۆ ئەم

گۆڕانە نموونە دەهێنێتەوە: نوێکردنەوەی سپارتا لە لایەن لیکروگ، گۆڕانی سویسرە و هۆڵەندە دوای ڕوخانی تیرانەکان. ئەم گەلانە بە بڕوای ئەو هێشتا تێکنەچووبوون و "لە ناخەوە" بۆگەنیان نەکردبوو، هاوکات هێشتا خاوەنی شادییەکی بەربەریانە بوون سەبارەت بە سەربەخۆییەکەیان، بەلام سەربەخۆییەك، کە شوێنە جیۆگرافییەکەیان بۆی لواندبوون: سپارتا لە نێوەندی پێلۆپۆنیزدا و زۆر دوور لە دەریای گەیەنەری گەلان؛ سویسرا نیوەی ساڵ بە بەفر داپۆشراوە؛ هۆڵەندییەکان گەلێکی سادە و هەژاری پێکهاتوو بوون لە ماسیگر و دەریاوان و هەموو پێکەوە لە وولاتێکدا دەژیان، کە بە ئەزیەت لە دژی دەریا دەپارێزرا. بەلام شیمانەی نوێکاریی شۆڕشگێڕی و سەندنەوەی ئازادی لە لای ئەو گەلانە نەماوە، کە پێشتر یەك جار خاوەنی فۆرمێکی کۆماری دەوڵەت بوو بن یان لە پێشکەوتنی ژیاریدا (سیڤیلیزاسیۆندا) بەشدارییان کردبێ. بەرپبەرەکان، بە پێچەوانەی ئەم گەلانەوە، کە لەژێر زەبری چەوساندنەوەدا ژیاون، ئەو یادوەرییە لە لای خۆیان بزر ناکەن. ئەم گەلانە تەنها لە دژی ویستی خۆیان هۆشرایەڵ دەبن و ئەمەیش هەتا ئەو کاتەی بۆ ئەو هۆشرایەڵییە ناچار کراون. بەلام گەلانی سیڤیلیزەبوو بۆ هەمیشە دۆڕاون، چونکە خۆشویستنی یاسا و ئازادیی هاووڵاتێتییان (سیڤیلیان) لەبیر چۆتەوە، هەر بۆیە ڕاپەڕینیان ناتوانێ پشت بە هەستی سروشتی بۆ ئازادی ببەستێ. هەر تاکێکی نێو ئەم گەلانە دەیەوێ هەتا بشێ لەسەر حسابی ئەوانی دی سەربەخۆ و خاوەنی دەسەڵات بێ، ئینجا نایەکێتی لە نێوانیاندا وایان لێدەکات، کە هەموو سەراپا بکەونە ژێر ڕکێفی تیرانێك یان دامەزراوێکی بەهێزەوە. ئێستایش پارێزەرانی دەسەڵاتی تیرانی لەنێو ئەم دۆخەدا جگە لە پشتگیریی هەڵپەی سامان و ڕابواردن، یان خۆشکردنی زەمینەی گەیشتن بەم گەنجانە، هیچ کارێکی ئاقڵانەتریان لێ ناوەشێتەوە. گێڕانی شۆڕش لەنێو "نەتەوەیەکی" (ناسیۆنێکی) ئاوها بۆگەندا



تەنها خواستێکی کاتی دەبێ، کە پاشان بە دوویدا زوو یان درەنگ تێکشکان و ئینجا دامەزراندنی دەسەڵاتدارییەکی تیرانیی نوێ دەکەوێتەوە. ئەم جۆرە گەلانە پێویستییان بە سەرۆکێکە، کە بەسەریانەوە فەرمان بدات. ئەم سەرەنجامەش بەرهەمی جەوهەری بۆگەنبووی گەل خۆیەتی. گەر زۆرینەی دانیشتوانی کۆمەڵێك بە هیچ شێوەیەك یاسا و یەکسانی و بەختیاریی خۆش نەوێ، بە پێچەوانەوە خۆی بۆ هەڵپەی سامان و شمەکی دەرەکی تەرخان کردبێ؛ گەر مرۆڤ ژیانێکی بێموبالات لەنێو ڕووکەش و نەرێتی بۆگەنبوودا بەسەر بەرێ، ئەوسا تەنها بە زەبر ڕێکخراوێکی بەرگەگیراو لەنێو ئەو کۆمەڵەدا چێ دەکرێ. ڕوسۆ لە "مانوسکریپتی ژنێڤ"دا ناوەرۆکی ئەو جۆرە گەلانە نزیکتر دیاری دەکات: بە گشتی هەموو گەلێك، کە بە هۆی کۆیلەتیی درێشخایەنەوە، هەروەها بەهۆی ئەو گیروگرفتانەوە، کە سەرەنجامی ئەو کۆیلەتییەن، (سەری لێ) شێواوە، هەستی خۆشەویستی بۆ نیشتمان و بەختیاری بزر دەکات. گەلێکی بەم چەشنە دڵنەوایی خۆی لەسەر نەگبەتییەکانی بەوە دەداتەوە، کە خۆخەڵەتێنەرانە لەنێو هۆشیدا بڕوایەك سەبارەت بەوە دەچەسپێنێ، گوایە ژیانێکی لەوە چاکتر نییە و نابێ. بێگومان پێکەوەژیانی مرۆڤان لەنێو ئەو گەلەدا ڕادەبوورێ، بەلام بەبێ هیچ یەکێتییەکی ڕاستەقینە. ئەو مرۆڤانە وەکو کەسانێك دەژین، کە لەسەر پانتایی خاکێك کۆبوونەتەوە و هاوکات درزی شەقبردووی بێبناغە یەك بە یەك جیایان دەکاتەوە. بە بڕوای ڕوسۆ "یەکێتیی گەل" کاتێك دەبێ، گەر خودی ئەو یەکێتییە لەنێو کۆماردا گەرەنتیی ئازادیی گەل بدات و ڕێ بە هەڵمەتی تیران بۆ دەسەڵات نەدات. (٤٠)

### ٨-١ ئایینی هاووڵاتی (سڤیل)

کۆمار، که هاوکات له هاووڵاتییانی سۆڤەرێن و ژێردەستەی یاساکان پێکدێ، ئایینێکی تایبەتیی گەرەکە، کە روسۆ ناوی دەنێ "ئایینی هاووڵاتی". زەرورەی ئایینێك بۆ ڕوسۆ لەو بڕوا خۆییەوە دێ، "کە هەرگیز دەوڵەتێك دانەمەزرێنراوە و ئایین وەك بناغە نەخرابێتە خزمەتییەوە" ([٤١]).

روسۆ بۆ ڕوونکردنەوەی زەرورەی ئایین لەنێو دەوڵەتدا بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی کۆمەڵەکان و ئایینە تایبەتمەندەکانیان دەگەڕێتەوە، ئەمەش بە مەبەستێکەوە: دەیەوێ بەو دۆخە بگات، کە تێیدا ئایینی دیانی "سیستەمی تیۆلۆژی و سیاسی" لە یەکتری جیا دەکاتەوە.

لە روانگەی ڕوسۆ مرۆڤانی گەلە سەرەتاییەکان جگە لە خواوەندەکان هیچ پاشایەك و جگە لە تیۆکراتی هیچ حکومەتێکیان نەبوو. هەر لەم هەقیقەتەوە بەقەد ژمارەی گەلەکان خواوەند هەبوون، بەبێ ئەوەی هیچ خواوەندێك بەخیلی بە ئەوانیدیکە بەرێ. دەسەڵاتی هەر خواوەندێك لە سنووری ناوچەی ئەو گەلە تێنەدەپەڕی و هیچ مافێکی بەسەر گەلێکی دیکەی دراوسێوە نەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو ئایینێك تەنها بە یاساکانی خودی هەر دەوڵەتێکەوە بەند بوو، ئەوا تاکە دەسوێژێك، بۆ ئەوەی گەلێك بهێنرێتە سەر دینی خۆ، برێتی بوو لە ژێرخستنی ئەو گەلە و ناچارکردنی بۆ ئەوەی ئایینەکەی خۆی بە ئایینێکی نوێ بگۆڕێتەوە. پاشان لە سەردەمێکی درەنگتردا ڕۆمەکان توانییان نەك تەنها بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی مەزن خواوەندەکانیان و لێرەشەوە ئایینەکەیان لەنێو گەلانی ژێرخراودا بڵاو بکەنەوە، بەڵکو هاوکات خواوەندانی ئەو گەلانەیان وەرگرت. دانیشتوانی دەوڵەتی ڕۆم ژمارەیەکی فرە خواوەند و ئایینیان هەبوو. بەڵام کاتێك ئایینی دیانی سەری هەڵدا و وەك دەسەڵات چەسپێنرا، ئیتر نوێنەرانی ئەم ئایینە کایەکانی تیۆلۆژی و سیاسەتیان لە یەکتری جیا کردەوە.



ئەمە لە ڕوانگەی ڕوسۆ ئەو بەدکارەیە کە دیانەکان ئەنجامیان دا، ئەویش چونکە بەم رێیەوە یەکێتیی دەوڵەتیان نەهێشت و هەر بەهۆی خودی ئەم جوودابییەوە گەلانی دیانیان خستە مەینەتییەوە. دیانە سەرکەوتووەکان "کتوپڕ بە زمانێکی دیکە" دەدوان: دەوڵەتی زەمینییان خستە خزمەتی جیهانێکی دیکەی ئەوبەرییەوە، ئینجا هەمان ئەم دەوڵەتەیان لەژێر فەرمانڕوایی سەروەرێکی سەرزەمینیدا بۆ بەزەبرترین دێسپۆتی وەرگۆڕی. بۆ ئەوان ئایینی پیرۆز هەمیشە سەربەخۆ بوو لە دەسەڵاتداری جیهانی و هیچ پەیوەندییەکی بە لەشی دەوڵەتەوە نەبوو. هاوکات سەروەرانی ئایین داواکارییەکیان سەبارەت بە "چاك"بوونی هاووڵاتیی دیانی بەرزکردەوە، تاکو کۆمەڵگا لە ئاشتی و هارمۆنیدا بژی.

ڕوسۆ ئەم کێشەیەی نەهێشتنی یەکێتیی دەوڵەت لە لایەن دیانەکانەوە تێماتیزە دەکات، تاکو دەنگ بە زەرورەی ئەم یەکێتییەدا بنێ. بە بڕوای ئەو سەرەتا و پێش هەموو شتێك ئەو لایەنە جەختە، کە نەشیاوە هیچ دەوڵەتێك بەبێ ئایین دابمەزرێ. لایەنێکی دیکەی کرۆکی ئەوەیە، کە یاسا دیانییەکان بۆ دەستووری دەوڵەت زیانبەخشن، چونکە هاووڵاتیان دەخەنە ژێر ڕکێفی فرمانی دژ بە یەك و بەمەیش لە فرمانە ڕاستەقینە گشتییەکانیان دوور دەخەنەوە. کەواتە کۆمار ئایینێکی جیاوازی لە ئایینی دیانی پێویستە، واتا ئایینێك کە ڕێنومای ئەوتۆ بۆ سەرجەم ئەندانی سۆڤەرێن دیاری بکات، کە ئیتر ئەوان "چۆن" فرمانەکانی خۆیانیان "خۆش بوێ". بەڵام بۆ ئەوەی ئەم ئایینە لەنێو کۆماردا بچەسپێ و بەنێو ناخی هاووڵاتیاندا بتەنێتەوە، ئەوا ڕوسۆ داوای "شایەتمانێکی خاوێنی هاووڵاتییانە" ([٤٢]) دەکات و ئەو مەرجەش دادەنێ، کە دەبێ بەندەکانی ئەم شایەتمانە تەنها لە لایەن سۆڤەرێنەوە دابنرێن. بەڵام نابێ ئەم بەندانە وەك لای دیانەکان "دۆگم بن"، بەڵکو دەبێ "هەستی کۆمەڵ" بن.

تەنها بەڕێی ئەم هەستەی سەرجەم کۆمەڵەوە شیمانەیەك دێتە ئاراوە بۆ ئەوەی هەر ئەندامێك بتوانێ "هاووڵاتییەکی چاکی دەوڵەت و ژێردەستەیەکی دڵسۆز" بێ.

بەڵام ئێستا پرسیار لێرەدا ئەوەیە، کە ئاخۆ هەموو کەسێکی نێو دەوڵەت بییەوێ و بتوانێ بڕوا بەم ئایینە هاووڵاتییەی سۆڤەرێن بهێنێ! لە ڕوانگەی ڕوسۆ مەرج نییە هەموو یەکێك بڕوا بەم ئایینەی هاووڵاتی بهێنێ، بەڵام ڕوسۆ هاوکات ماف بە سۆڤەرێن دەدات ئەو کەسانە لە دەوڵەت بکاتە دەرەوە، کە بڕوایان بەو ئایینە نەهێناوە، ئەمەیش بێگومان نەك وەك بێئیمانێك (وەك چۆن دیانەکان پێی هەڵدەستان)، بەڵکو وەك دوژمنی کۆمەڵگا. ئەم جۆرە کەسانە بۆ ڕوسۆ ناتوانن یاساکان و دادپەروەرییان خۆش بوێ و ژیانیان لە کاتی پێویستدا بۆ فرمانەکانیان بەخت بکەن. بەڵام داواکارییەکەی ڕوسۆ بە تایبەتی سەبارەت بە هەڵوێستی ساختەچییانەی ئەندامەکانی خودی دەوڵەت لەوەیش تێپەڕ دەکات: کێ بە فەرمی بڕوا بە بنەماکانی ئەم ئیمانە نوێیەی دەوڵەت بهێنێ و سەرباری ئەمەیش هەڵوێستێکی ئەوتۆ وەربگرێ، کە هەر وەکو بڕوای پێیان نەبێ، ئەوا گەرەکە سزای مەرگ بەسەر ئەو کەسەدا بسەپێنرێ (٤٣).

بنەماکانی ئیمانی ئایینی هاووڵاتی دەبێ سادە و کەم ژمارە بن، هاوکات لە دەربڕیندا ڕوون بن و هیچ ڕوونکردنەوە و ڕاڤەیەکیان نەبێ. بنەما پۆزەتیڤەکانی ئیمان بریتین لە: ڤێهەیەی خوایەتییەکی بەهێز و ئاقڵ، چاکەکار و پێشڕوانەر و خەمخۆر؛ ژیانی ئایندە؛ پاداشتدانەوەی دادپەروەران؛ سزادانی خراپەکان؛ پیرۆزیی پەیمانی کۆمەڵایەتی و یاساکان. بەڵام هەروەها بنەمایەکی نێگەتیڤیش هەیە: "قبوڵنەکردن". روسۆ قبوڵنەکردنی هاووڵاتیانە لە هینی تیۆلۆژیانە جیاناکاتەوە، ئەویش لەو ڕوانگەیەوە، کە نەشیاوە هاووڵاتیانی ئیمانهێناو بتوانن لەتەك کەسانێکدا پێکەوە بژین، کە نەفرەتیان لێکراوە.



بێگومان ڕوسۆ دەزانێ، "کە ئەمڕۆ ئایینێکی ڕەهای نەتەوەیی نییە و جارێ نەشیاوە هەبێ" (٤٤)، لەبەر ئەم هۆیە پێشنیار دەکات، کە هاووڵاتیان دەبێ لێبووردنیان (تۆلێرانس) بۆ هەموو ئەو ئایینانە هەبێ، کە لێبووردوون. بەڵام گەر ئایینێك لەنێو دەوڵەتدا هەبێ و ڕزگاریی مرۆڤ تەنها لەنێو پەرستگاکەی خۆیدا دیاری بکات و نەفرەت لە ئایینەکانی دیکە بکات، ئەوا دەبێ ئەو ئایینە لەنێو دەوڵەتدا یاساغ بکرێ.

## ٢- دانوستاندن

ڕوسۆ لە "دیسکورزی نایەکسانی"دا دەربارەی پەیمانێکی ساختە دەدوێ، کە لە لایەن دەسەڵاتەوە بۆ دەسەڵات پێشنیار کراوە و هۆکەی بۆ خاوەنداریی تایبەتی دەگەڕێتەوە. بەڵام نووسینی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" پەیمانێکە، کە ڕوسۆ لە پێناوی هێنانەوەی ئازادیی مرۆڤدا پێشنیاری دەکات و هاوکات دەڵێ، کە هیچ دەوڵەتێك ڕەوا نابێ، گەر لەسەر بنەماکانی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییەی ئەو دانەمەزرابێ. ڕوسۆ لە "دیسکورزی نایەکسانی"دا ڕێگەیەکی مێژوویی دەبڕێ، واتا مرۆڤی تەنیا و بێمێژوو بۆ نێو مێژوو دەهێنێ، بەڵام بە پێچەوانەوە لە نووسینی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا مەرجی بناغەیی دادەنێ و داوا دەکات، کە پێویستە ئەو مەرجانە زەمینەی پەیمانی کۆمەڵایەتی بن. چونکە، لە روانگەی ئەو، لەسەر ئەم زەمینە مەرجییە، وەك "گەرەکێك"، دەرفەت بۆ گۆڕینی ناخی مرۆڤ دەهێنرێتە ئاراوە: "پەڕینەوە لە دۆخی سروشتەوە بۆ دۆخی سیڤیل (هاووڵاتێتی)، گۆڕانێکی زۆر سەرنجڕاکێش لەنێو مرۆڤدا بەدی دەهێنێ، چونکە لە هەڵوێستی ئەودا دادپەروەری جێگەی ڕەمەك دەگرێتەوە". (٤٥)

ڕوسۆ لە نووسینی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا داوای گشتێتی دەکات، بەڵام گشتێتییەك، کە بەسەر تایبەتێتیدا سەروەر بێ و دوای بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی هەوڵی بەدیهێنانی بدرێ. ئەو باوەڕ دەکات، کە تەنها بەم سەروەربوونەی گشتێتی بەسەر تایبەتێتیدا شیمانەیەك دێتە ئاراوە بۆ ئەوەی مرۆڤی دووبەشبوو بەسەر بوون و ڕووکەشدا چاك بکرێتەوە، ئەمەش لە لای روسۆ بە واتای، ئەو مرۆڤە جارێکی دی لە نوێوە بە سەرجەمێك بکرێتەوە، بۆ نێو دۆخێکی هاوکێشی ناخی، بۆ سروشتێتی لەنێو فۆرمێکی سۆسیالدا، بگەڕێنرێتەوە. ئەو فۆرمە سۆسیالە، کە ڕوسۆ بۆی دەگەڕێ، "دەبێ تۆتال بێ لە واتای هەڵگرتنی (نەهێشتنی - ن) خۆناموبووندا، کە بەڕێی نامۆبوونێکی تۆتال و بێمەرج و مۆرالییەوە لەنێو پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، بەڕێی خۆبەخشینی هەر یەك بە یەك، بەدی دەهێنرێ". [٤٦]

ڕوسۆ بەدووی ڕەهایەتیدا دەگەڕێ و لەم گەڕانەیدا دەیەوێ ئاڕاستە بدۆزێتەوە نەك دامەزراو: دەروونی دەوڵەت نەك لەشی. کێشەی ڕوسۆ ئیدێی دەوڵەتە، چونکە ئەو ناپرسێ، مرۆڤان "چۆن" دەتوانن دەوڵەت دابمەزرێنن، دەستوورێکی بۆ دابنێن و ڕابەریی بکەن، بەڵکو دەپرسێ، "چی" ڕەوایەتی بە دەوڵەت دەدات. [٤٧] بێگومان لایەنێك ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە کە دەوڵەت دەبێ لە لایەن مرۆڤ خۆیەوە بەبێ ڕێنوما و یارمەتیی دەرەکی دابمەزرێ. بەڵام ئایا دەوڵەتەکانی دەسەڵاتیش لەسەر هەمان شێوە دانەمەزراون؟ ئایا هیچ کام لەو دەوڵەتانە دەتوانێ ئەو ڕاستییە بشارێتەوە، کە هەموویان لە کرۆکەوە بۆگەنیان کردووە، ئەویش چونکە لەتەك جەوهەری مرۆڤدا ناگونجێن؟ لێرەدا ئیدێکەی ڕوسۆ بە پوختی ڕوون دەبێتەوە: دەوڵەتی بەرهەمی مرۆڤ دەبێ گونجاو بە جەوهەری ئەو خۆی، کە ئازادییە، دابمەزرێ. بەڵام ئێستا ئازادی چیدی ئازادییەکەی دۆخی پێشدەوڵەت نییە و ناوەرۆکێکی جیای هەیە. ئێستا بوون و



هەبوون و ماف دەبن بە "دەبێ"، بە کردن و فرمان، کە پێویستە بەدیبهێنرێن. داواکارییەکەی ڕوسۆ لە "ئێمیل"دا، کە دەڵێ "تۆ خۆت بە"، "تۆ هۆشرایەڵی هیچ ویستێکی دی مەبە"، دەبێ بە پەیڕەو بۆ هەڵوێستی سیاسی. [٤٨]

ویستی مرۆڤ بۆ ڕێکخراوێکی نوێی سۆسیال لە ویژدانییەوە، وەك خۆشەویستی بۆ ڕێکخستن، سەر هەڵدەدات. مرۆڤ بەهۆی خۆویستی و بەراوردەوە هەنگاوی بۆ نێو مێژوو نا، بەڵام ئێستا ویژدان خۆویستی و بێموبالاتی بۆ ویستی چاکە وەردەگۆڕێ و مرۆڤ چیدی بەدیلی لەنێو خۆزگە زێنزییەکانیدا نامێنێتەوە یان چیدی "خەریکی چەنەبازی" نابێ، بەڵکو ڕوو دەکاتە کۆمەڵ و کردار دەنوێنێ. مرۆڤی ڕوسۆ لەو ڕێیەوە لە مرۆڤی نوێنەرانی کلاسیکیی "مافی سروشت" جیا دەبێتەوە، کە ئەم مرۆڤە شیاوی گۆڕانە و دەتوانرێ بەڕێی پەروەردەوە فۆرمێکی نوێی پێ بدرێ، واتا لە مرۆڤەوە بکرێ بە سیتۆیا (هاووڵاتی). لە نێوان ئەم دوو تێگەیشتەدا جیاوازییەکی "نرخ" هەیە: مرۆڤ لە هاووڵاتی کەمترە. بەڵام ئێمە دەبێ لە لای ڕوسۆ هەوەها جیاوازییەك لە نێوان هاووڵاتی و بۆرژوادا بکەین. بۆرژوا بۆ ڕوسۆ مرۆڤێکە، کە تەنیا دوای بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکەوێ، بۆیە ئەم بۆرژوایانە لە کۆمەڵگای هاووڵاتیدا نازانن چییان دەوێ، بەڵکو لەتەك خۆیاندا کەوتوونەتە نەسازییە و بەردەوام لە نێوان ئەرك و مەیلەکانیاندا دەبزوێن، کە ئیتر نە مرۆڤ و نە هاووڵاتی دەبن، نە دەتوانن بۆ خۆیان نە بۆ کەسانی دیکە بن. بەڵام ڕوسۆ داواکارییەك بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤانە ئاقڵ بکرێن، واتا لە ڕوانگەی ڕوسۆوە هەوڵ بدرێ ئازاد بکرێن. گەر ئەم جۆرە مرۆڤانە سەبارەت بە ویستە خاوەن ویژدانەکەیان بێدار بکرێنەوە و ئیستایش هەست بە چاکەی سۆسیال بکەن، ئەوا دەتوانن هەڵوێستی بەویژدان لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتیدا وەربگرن. بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، بەگشتی سەرجەم ئەرکی پەروەردەیی، لە ئەستۆی

یاسادایە و ئەرکێکی یەکجار دژوارە. ڕوسۆ بەپوختی ئامانجی ئەم ئەرکە پەروەردەییە دیاری دەکات: تواندنەوەی منی مرۆڤ لەنێو یەکێتییەکی یەکساندا. کەواتە "ئەرکی یاسا بەتەنیا برێتی نییە لە سنووردانان بۆ ڕەفتارە دەرەکییەکانی مرۆڤ، بەڵکو یاسا دەبێ هاوکات ببێ بە پاڵهێزی ویستی مرۆڤ. باڵاترین ئەرکی پەروەردەیی دەوڵەت برێتییە لە فێرکردنی هاووڵاتییەکان بۆ خۆشویستنی یاسا وەك دەربڕراوی ویستی گشتی. بێگومان لەنێو ناخی هەموو مرۆڤێکدا ویستی گشتی هەیە، بۆیە ئەرکی پەروەردە برێتییە لە ڕووکردنە ئەم لایەنەی ناخی ئەو، تاکو بە هۆشرایەڵی ویستی گشتیی شاد بکات و ئەویش لێرەوە بتوانێ سۆزەکانی خۆی بێدەنگ بکات. گەر مرۆڤ ئەمەی پێ بەدیهێنرا، ئەوسا دەتوانێ ویستی گشتی ببیستێ. ویستی گشتی لێرەدا زۆر لە دەنگی ویژدان نزیك دەکەوێتەوە. مرۆڤ ئێستا یاساکان وەك ،،تۆمار،،ی ویستی خۆی وەردەگرێ و هۆشرایەڵییان دەکات". [٤٩]

بەڵام ڕوسۆ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زەبر بەدەر دەکات. لە کۆماری ڕوسۆدا هێزێك نییە، کە پێکەوەژیانی هاووڵاتیان بە تۆقاندن و سزادان ڕابگرێ. تەنها یاسا لەم کۆمارەدا جێگەیەکی تایبەتیی هەیە و تێیدا ویستی گشتی هەڵهاتووە. ئەم یاسا سروشتییە، یان ئەم دادپەروەرییە، بە هەمان شێوەی سەرجەم دادپەروەری، تەنها لە خواوە دێ، بەڵام ئێمە بەداخەوە ناتوانین لەو بەرزییەوە وەری بگرین. گەر ئەمە شیاو بووایە، ئەوسا پێویستیمان بە حکومەت و یاسای پۆزەتیڤ نەدەبوو و بۆ خۆمان لەسەر ڕێنومای ئەقڵ دەژیاین. بەڵام یاسا لەنێو نارێکخراویی کۆمەڵایەتیدا، کە چەندین بەرژەوەندیی جیاواز وەك نیشانەی خۆویستی خۆیان دەنوێنن، کە دادناپەروەرەکان سەروەرن، ئەویش چونکە ڕووکەش و زیادەڕۆیی لە هەڵپەی ماتەریدا ئەو ژیانە داگیر دەکەن، هەروەها کە مرۆڤ بەزۆری"بێرەوشتە"، چونکە دڵ و زمانی پێکەوە ناگونجێن، بە کورتی یاسا



لەنێو ئەم نارێکخراوییەدا پێمان دەڵێ، کە "چ شتێك چاکە و بۆ ڕێکخراوەکە گونجاوە"، ئەمەش سەرلەنوێ ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە ئەرکی یاسا تەنها دابینکردنی پێکەوەژیانی مرۆڤان نییە. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی پەڕینەوە لە دۆخی سروشتەوە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی یان دەوڵەتی. هەموو تاکێکی نێو ئەو کۆمەڵگایە بە پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕازی نابێ. لەنێو دەوڵەتدا هێشتا هەر گرووپ و تاکان هەن، کە دوای ویستی خۆیان دەکەون. بۆیە ئەمانە دەکەونە کەناری کۆمەڵگای هاووڵاتییەوە، کەواتە هاوکات لە دەرەوەی سۆڤەرێنن. تەنها ئەندامانی یەکگرتوو، ئەوانەی دوای ویستی گشتی دەکەون، سۆڤەرێن پێك دەهێنن. ئێستا ئەندامانی یەکگرتوو وەك پێکهاتەی سۆڤەرێن دەبێ یاسا بۆ سەرجەم دابنێن، واتا هاوکات سۆڤەرێن خۆی دەبێ بە ژێردەستەی یاساکان. بەڵام ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە سۆڤەرێنەکەی ڕوسۆ بەردەوام چالاك دەمێنێتەوە. گرنگترین جۆری چالاکی بۆ سۆڤەرێن برێتییە لە "کۆبوونەوەی بەردەوام"، کە بەڕێی یاساوە دەچەسپێنرێ. لەبەر ئەوەی یاساکان دەربڕدراوی ویستی گشتین، "ئەوا سۆڤەرێن کاتێك دەتوانێ کردار بنوێنێ، گەر گەل کۆ بووبێتەوە". ئەم کۆبوونەوانە نەك تەنها کرۆکی ڕووداوە سیاسییەکانی نێو دەوڵەت پێکدەهێنن، بەڵکو هاوکات بناغەی گۆڕانی پێشڤەرۆی سیاسیشن: "ئەوە هیچ بەس نییە، کە گەل بە جارێك بۆ هەمیشە دەستووری دەوڵەت (...) فۆرمولە بکات. هەروەها ئەوەیش بەس نییە، کە گەل حکومەتێکی بەردەوام زیت بکاتەوە یان بۆ هەمیشە بە هەڵبژاردنی کاربەدەستان هەستێ. جگە لە کۆبوونەوە شازەکان، کە بەهۆی حاڵەتە چاوەڕواننەکراوەکانەوە ئەنجام دەدرێن، دەبێ کۆبوونەوەی چەسپێنراو و بەردەوام (...) ڕوو بدات، بەڵام ئەم کۆبوونەوانە نە دەبێ لا ببرێن و نە دەبێ دوا بخرێن، هەتا ئیتر گەل بتوانێ

بەپێی یاسا لە ڕۆژە تەرخانکراوەکاندا کۆ ببێتەوە، بەبێ ئەوەی بۆ ئەم کۆبوونەوانە بانگکردنێکی تایبەتیی پێویست بێ". [٥٠]

پێدەچێ هۆکانی ئەم ئامادەییە (پرێزێنس) بەردەوامەی سۆڤەرێن بۆ کێشە و مەترسییەکانی نێو کۆمەڵگا بگەڕێنەوە، هەروەها ڕوسۆ بۆیە ئەم ئامادەییە هێندە بە گرنگ وەردەگرێ، چونکە بە نەشیاوی نازانێ، کە دەسەڵاتی بەجێگەیەنەر بۆ نێو بەدکرداری سیاسی نەخزێ. لەبەر ئەم هۆیە ڕوسۆ بە توندی داوای ئەوە دەکات، کە دەبێ تایبەتمەندێتیەکەی حکومەت لەو کاتانەدا، کە سۆڤەرێن کۆ دەبێتەوە، "لەکاربخرێ".

سۆڤەرێن وەك تاکە دەسەڵاتی یاسادانەر دەبێ مەرجەکانی کۆمەڵگای هاووڵاتی دیاری بکات. بەڵام ئایا کۆمەڵێك مرۆڤی "چاکەخواز"، کە لە پێناوی بەختیاریی سەرجەمدا یەکی گرتووە، چۆن دەتوانێ ئەو مەرجانە تەنها لەم هەستەی چاکەخوازییەوە فۆرمولە بکات؟ ڕوسۆ لە گەلی یەکگرتوودا تەنها ویستی چاکە دەبینێ، بەبێ ئەوەی گەل توانستێکی زەینیی ئەوتۆی هەبێ، کە بە یاریدەی چاکە بناسێتەوە و کێشەکانی نێو کۆمەڵ "بەڕۆشنی" دیاری بکات.

بە بڕوای ڕوسۆ ژمارەیەکی کەم مرۆڤ هەیە، کە چاکە دەبینێ و ڕەفزی دەکات، بەڵام جەماوەری چاکەخواز نای بینێ. کەواتە توانستی بینین مەرجی هەیە و بریتییە لە کۆبوونەوەی چەند فاکتەرێك، بۆ نموونە سەربەخۆیی لە زەرورەی ژیانی ڕۆژانە، کە تەنها دەشێ سەربەخۆیی ماتەری بێ، هەروەها ئاستی زەینیی بەرز. فاکتەرێکی دیکە ئەوەیە، کە مرۆڤ لە ویژدانییەوە ویستی بۆ پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نوێ هەبێ. کەواتە دەبێ مەبەستی ڕوسۆ لەو کەمایەتییە، کە چاکەی ناوێ، تەنها کەسانێك بێ، کە چ لە ڕووی دەسەڵات و سامانەوە، هەروەها چ لە ڕووی تێگەیشتنەوە، ئاستێکی بەرزتریان لە جەماوەر هەبێ. ئەمانە هەمان ئەو کەسانەن، کە لە "دیسکورزی نایەکسانی"دا لە



جەماوەری هەژاران بەتواناتر بوون بۆ ئەوەی "ئەو بارە تێکچووە زووتر ببینن (...) و هیوادار بوون بۆ خۆیان سوودی لێ وەربگرن". کەواتە ڕوسۆ بە هیچ شێوەیەك توانستی زەینیی پێگەیشتوو بە "گەل"وەك جەماوەری فراوان نادات، بگرە تەنانەت دان بە توانستی زەینیی دەوڵەمەندەکاندا دەنێ. بەڵام گەل بۆ ئەو لە ڕووی مۆرالییەوە لە ئەوان پێشکەوتووترە، ئەویش چونکە ویستی خۆی ئاڕاستەی ئامانجێك دەکات، کە بریتییە لە یەکسانی و بەختیاریی گشتی. کاتێك ڕوسۆ لە "پوبلیك" (خەڵکی گشتی) دەدوێ، ئەوا مەبەستی لە جەماوەری وردەبۆرژوازیی دانیشتوانە، کە بە هۆی ڕادەی نزمی "ڕۆشنبوونەوەی" زوو دەخەڵەتێنرێ، بەڵام ئەم جەماوەرە هەمیشە بۆ کۆمەڵگا چاکەی دەوێ، چونکە هێندەی ویستیارانی خراپە لە دۆخی بێگوناهی و یەکسانی دوور نەکەوتۆتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاسانتر و ئاقڵانەترە، کە لێجیسلاتوێر ئەم ویستیارانەی چاکە ڕۆشن بکاتەوە وەك لەوەی خۆی بە ویستیارانی خراپەوە خەریك بکات، ئەوا چالاکییە پەروەردەییەکەی لە ڕۆشناییدانی "گەلی چاکەویستەوە" سەرچاوە دەگرێ. [٥١]

بەڵام لەبەر ئەوەی لێجیسلاتوێر ناتوانێ زەبر بەکار بهێنێ، ئەوا ناچارە بە زەروورە هانا بۆ هێزسەروەرێك بەرێ، کە بەبێ زەبر ڕاکێشەر و بەبێ گفتدان بڕواهێنەر بێ بە مرۆڤ. کەواتە گەر دەسەڵات و ئەقڵ کورتیان هێنا، ئەوا تاکە یاریدەدەرێکی هەبوو بریتییە لە بانگەوازی سۆزی ئیڕاسۆنال (نائاقڵانە) بە یارمەتیی ئایین. سۆزی ئایینی لەم دۆخەدا وەك تاکە دەسوێژێکی شیاو و کاریگەر بۆ مەبەستی سیاسی دەخرێتە گەڕ، یان بە زمانێکی مۆدێرن بڵێین: سۆزی ئایینی بە هەمان شێوەی "ئیدیۆلۆژی" دەویسترێ، واتا وەکو بیروباوەر، کە

نرخەکـــەی لـــەو بیروبـــاوەڕەدا نییـــە، بـــەڵکو تـــەنها لـــە ســـوودمەندیی فونکسیۆنەکەیدایە. (٥٢)

هێنانی ئایین وەك دەسوێژێکی نائاقڵانە بۆ مەبەستی بڕواهێنانە بە مـرۆڤ. بۆیە ئەوە ڕێکەوت نییە، کە ڕوسۆ لە تێگەیشتی نائاقڵانەی "ژێنی"دا بۆ مۆرکـە ڕەواکانی لێجیسلاتوێر دەگەڕێ، تێگەیشتێك، کە لە گۆڕانی داهـاتووی کولتوویـدا، بە تایبەتی لە ڕۆمانتیکی ئەڵمانیـدا، ڕۆڵێکـی زۆر گـەورەی بینیـوە. بـەڵام لێـرەدا نابـێ ئـەو لایەنـە لـەیاد بکـرێ، کـە لێجیسـلاتوێر خـۆی لـە دەرەوەی ئـەو لەشـە سیاسـییەدا دەبینێتـەوە. زەرووڕەی بـوونی لێجیـسلاتوێر بۆیـە چـێبووە، چونکە ڕوسـۆ نەیـدەتوانی پێـشبینی بکـات، کـە کۆمەڵگایـەکی سیاسـی بـە شـێوەیەکی سپۆنتان و سروشتی بێتە ئاراوە. (٥٣)

پـۆرترێی لێجیـسلاتوێر تەریبـە بـە پێناسـەی پـەروەردکار لـە نووسـینی "ئێمیل"دا. لێجیسلاتوێر لە سەرێکەوە برێتییە لـە کەسایەتیی مێـژوویی، بـەڵام لە سەرێکی دیکەوە برێتییـە لـە "کەسـاندنی" یاسـای (یـان ویـستی گـشتیی) نێـو نـاخی مـرۆڤ. ئـەم مێتـافۆرە جووتەنییـەی لێجیـسلاتوێر لـە زانـستێکدا شـیاوی یەکخستنە: مرۆڤ خۆی هەڵگری یاسادانەرە وەك پرنسیپی مۆراڵپەروەری و هێزی داهێنانی ئازاد. (٥٤)

سەردەمێك خواوەندەکان یاسایان بـۆ گەلـەکانیان دەنـارد. ئـەو ئۆتۆرێتییـە پاشـان بـوو بـە خوایـەکی تـاك و تـەنیای کەسـی، کـە یاسـای ئـەزەلی بـۆ سـەرجەم مرۆڤایـەتی دەنێـرێ، بـەڵام لەسـەر زەمـین مرۆڤێـك، واتـا پەیامبـەرێك، وەك



زمانحاڵی خۆی هەڵ دەبژێرێ. خوا لە سەردەمێکی دیکەدا بوو بە خـوای ئـەقڵ و سروشت و گەردوون، کە یاسای سروشتی یان ئاقڵانە وەك پەیڕەو دادەنـێ. بـەڵام لە کاتی ڕوسـۆوە وەرچـەرخانێکی بنـەڕەتی لـە پرنـسیپی یاسـادانانـدا ڕوو دەدات. ئێستا چیدی خوا مرۆڤ بەکار ناهێنێ، تاکو یاسا بۆ مرۆڤایەتی بنێرێ، بـەڵکو بـە پێچەوانەوە مرۆڤ خوا بەکار دەهێنێ، هەتا یاسا بـە خـۆی بـدات. لێجیـسلاتوێری ڕوسۆ برێتییە لە خوایەتی و داهێنەری لە ناخی مرۆڤ خۆیدا. (٥٥)

## بەشی چوارەم: پەروەردەی سروشتی

لە مێژووی فەلسەفەدا پەروەردە بەشێك بوو لەنێو سیستەمە فەلسەفییەکاندا، ئەمەش لە سەردەمی ڕۆشنایییەکانەوە بەرەو پاش هەتا پلاتۆن بڕ دەکات. بەڵام ئیدێی پەروەردەزانی (پێداگۆگیگ) لەتەك روسۆدا نەك تەنها دەگاتە لوتکە، بەڵکو تەنانەت دەبێ بە کایەیەکی سەربەخۆ، بە واتایەکی دی، پەروەردە چیدی وەك کەرتێك یان پاشکۆیەکی فەلسەفە نامێنێتەوە، بەڵکو "تایبەتمەندیی خودی مرۆڤ دەبێ بە بناغەی دیاریکردنی پەروەردە" (١).

پەروەردە لە سەردەمی پێش ڕۆشنایییەکاندا بریێتی بوو لە خۆشەکردنێکی کەسی تاك بۆ نێو ئایین و ئاکار و ترادیسیۆنی کۆمەڵ. بەڵام تێگەشتی پەروەردە لە سەردەمی ڕۆشنایییەکاندا لەم بنەمایانە جیا دەبێتەوە. ئێستا مۆرکە سەرەکییەکەی پەروەردە ئەوەیە، کە لەو پرۆسەیەدا تێڕوانین بۆ نێو



پەیوەندییەکانی ڕێکخراوی بۆرژوایانەی کۆمەڵگا بە منداڵ بگەیەنرێ. لەم ڕوانگەیەوە کاتێك نەوەی نوێ وەك "بەتوانا" دەبینرا و وەردەگیرا، گەر بیتوانیایە بە بۆخۆگریی ئەو تێڕوانینە بناغەییانە هەستێ. لێرەدا پەروەردە، کە هەمیشە وەك نێوچالاکییەکی مرۆڤی شیاوی ئەنجامدانە، بە شێوەیەکی یەکلایەنی منداڵی بۆ پەروەردە تەرخانکراو وەردەگرت و وەك بابەت دایدەنا، بەمەش "دەیشتاند". ئەم پەروەردە پۆزەتیڤە لە منداڵ منداڵییەکەی دەسەند، چونکە لەتەك ئەودا وەك کاملێکی بچووك مامەڵەی دەکرد، منداڵی وەك دەسوێژێك بۆ ئەو مەبەستانە "خۆشە دەکرد"، کە کاملەکان لە دەرەوە دایان نابوون.

بە پێچەوانەوە ئیدێی ئازادیخوازی پەروەردەیی، کە لە سەردەمی ڕۆشنایییەکاندا بە تایبەتی لە لای ڕوسۆ دەیبینین، هەوڵ دەدات توانا بە مرۆڤ بدات بۆ ئەوەی خۆی بدۆزێتەوە، یان خۆی بەپڕی ئاوەڵا بکات و پێزانانە پلان بۆ ژیانی داهاتووی خۆی دابنێ. بە تایبەتی لەم بنەما پەروەردەییەوە جیاوازیی نێوان ڕوسۆ و سەردەمەکەی دەردەکەوێ. ڕوسۆ منداڵ وەك "خۆمەبەست" دادەنێ. چۆن هەموو مرۆڤێك مافی بۆ ئازادی و بەختیاری هەیە، ئاوهایش منداڵ مافی هەیە بۆ ئەوەی ژیانێکی منداڵانەی ئازاد و بەختیار بژی. بۆ ڕوسۆ ژیان بریێتییە لە هونەرێك، کە گەرەکە فێری منداڵ بکرێ. بۆیە لە "ئێمیل"دا ڕەخنەییانە دەبێژێ، کە ئەو منداڵەی ئەو پەروەردەی دەکات، نە دەبێ بە یاساناس، نە بە سەرباز و قەشە، بەڵکو بە ڕەهایی دەبێ بە مرۆڤ.

پەیوەست بە ئیدێ هەمەلایەنییەکانی پەروەردەناسییەوە لە سەردەمی ڕۆشنایییەکاندا ئەو لایەنە جەختە، کە ڕوسۆ کەرەسەیەکی فرەی لێکۆڵینەوە و ئامۆژگاریی پەروەردەیی لە بەردەم خۆیدا دەبینێتەوە و بەمەش بۆی دەبن بە بابەتی خەریکبوونی ڕەخنەیی. گرنگترین ئیدێکانی ڕۆشنایییەکان پەیوەست بەم

کێشەیەوە بریێتی بوون لە یەکسانی بۆ هەمووان و ئازادی لە ئۆتۆرێتیی دەوڵەت و کلێسە، ڕوسۆش لە ڕۆمانە پەروەردەییەکەیدا بە ناونیشانی "ئێمیل یان دەربارەی پەروەردە" دەیەوێ چوواندنێکی گشتییان پێ بدات. بەڵام لێرەدا هەرە نوێیەتییەکەی ئیدێی پەروەردە لەوەدایە، کە ڕوسۆ دەیەوێ لە "بابەتێکی تەواو نوێدا" کار بکات، بابەتێکی ئەوتۆ، کە - بە زمانی روسۆ- تەنانەت دوای "کتێبەکەی خۆی هێشتا هەر نوێ دەمێنێتەوە" ([2]).

گەر لە خودی پەروەردە وەك چالاکییەکی نێومرۆڤی بڕوانین، کە تێیدا پەروەردکار و منداڵی بۆ پەروەردە تەرخانکراو خۆیان دەبیننەوە، ئەوا دەکەوینە بەردەم نەسازییەك، کە بریێتییە لە نەسازیی نێوان پاراستنی ئازادیی کەسیی لە لایەك، هەروەها بەکۆمەڵایەتیکردنی کەسی تاك لە لایەکی دی. ئەم نەسازییە، کە نزیکەی نەشیاوی یەکالاکردنەوەیە، لە لای ڕوسۆ بەڕوونی دیار دەدات: "کاتێك پەروەردەزانی پێش ڕوسۆ نەسازییەکانی لێرەبوونی مرۆڤی دادەپۆشی، ئەوا (ئەو نەسازییانە) لە لای ڕوسۆ وەك گرژیی نەشیاوی هەڵگرتن سەر هەڵدەدەن"، واتا وەك ئەو گرژییانەی "کە لە ناخی لێرەبوونی مرۆڤدا هەن و بریێتین لە نەسازیی نێوان ئازادی و دیاریکراوی، تاك و کۆمەڵگا، ئەقڵ و هەست" ([3]).

ڕوسۆ ئەم کێشەیە لە "ئێمیل"دا پەیوەست بە مرۆڤی سروشتەوە ڕوون دەکاتەوە : "مرۆڤی سروشت سەرجەمێکە بۆ خۆی، بریێتییە لە یەکی ژمارەیی نەشکاو و تەنها لەتەك خۆی یان تاکی مرۆڤدا پەیوەندیی هەیە. مرۆڤی کۆمەڵگا تەنها کەرتێکە، کە نرخەکەی (...) پەیوەند (...) بە قەوارەی کۆمەڵایەتییەوە دیاری دەکرێ. بەڵام دامەزراوی کۆمەڵایەتیی چاك ئەوەیە، کە هەتا بۆی بکرێ سروشتێتی لە مرۆڤ بکاتەوە، لێرەبوونی بۆ خۆی لێ بسەنێ، کە ئیتر ئەو تاکە چیدی خۆی بە سەرجەمێك نەزانێ، بەڵکو خۆی بە کەرتی یەکێتییەکی



کۆمەڵایەتی بزانێ و تەنها لەنێو ئەم سەرجەمە نوێیەدا هەست بکات" (بڕوانە پاشکۆ، ئێمیل، بەشی یەکەم).

کەواتە گەر بلوێ پەروەردەی سروشتی بە پەروەردەی هاووڵاتییەوە بلکێنرێ، ئەوسا دەشێ نەسازییەکان لەنێو مرۆڤدا یەکالا بکرێنەوە و لێرەشەوە بەربەستێکی سەرەکی لە بەردەم بەختیاریی مرۆڤدا لا ببرێ. بەڵام ئایا ڕوسۆ بەڕاستی دەیەوێ منداڵ بەو ئامانجە پەروەردە بکرێ، کە لە کۆتاییەکەیدا ببێ بە هاووڵاتی؟ سەرەتا، وەك لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ دا، لایەنێك جەختە: پەروەردەزانی وەك زانستێکی سەربەخۆی پەروەردە، کە لەتەك ڕوسۆدا دێتە ئاراوە، تەنها لەتەك کێشە و شیمانەکانی پەروەردەی تاکی منداڵدا خەریکە. ڕوسۆ بێگومان لە نامەیەکدا دەنووسێ، کە "ئێمیل" و "پەیمانی کۆمەڵایەتی" پێکەوە یەکەیەك پێکدەهێنن (بڕوانە لا). بەڵام نابێ ئێمە ڕاستییەك لەیاد بکەین: روسۆ نووسەرێکە، کە دژبێژی مۆرکی ئەوە. بۆ ئەوەی لەم کێشەیە نزیکتر تێبگەین، ئەوا چاکتر دەبێ، گەر لە بەرهەمەکانی بڕوانین. ئەو خۆی ماوەیەکی کورت دوای بڵاوبوونەوەی "ئێمیل" پلانێکی نوێی دانا بۆ درێژەدان بەم کێشە پەروەردەییە. ئەم نووسینە دوای مردنی لەژێر ناونیشانی "ئێمیل و سۆفی یان تەنیاکان"دا بڵاو بۆوە. گرنگیی ئەم نووسینە لەوەدایە، کە ڕوسۆ نەهاتووە ئێمیل وەك هاووڵاتییەك یان وەك پیاوێکی کامڵ دابنێ و ئێستاش وەك ئەم پیاوە کامڵە بە کێشە کۆمەڵایەتییەکانەوە خەیك بێ. بە پێچەوانەوە، ڕوسۆ وەك کەسێك دای دەنێ، کە لەنێو ئەوپەڕی ناکامییەوە نامە بۆ پەروەردکارەکەی دەنووسێ و بۆی ڕوون دەکاتەوە، کە گوایە جیهانەکەی تێکشکاوە و ژنەکەی لێی جیابۆتەوە، هەروەها پەروەردەکەی نەیتوانیوە ڕێگە لە نوشستیهێنانی مرۆڤییانەی ئەو بگرێ! ([4]).

---

کەواتە ئێمە لە لای ڕوسۆ هێڵێکی ڕاستەوانەی پەروەردەییمان ڕووەو هاووڵاتییەکی چالاك و بەرپرسیار نییە، بەڵکو لە "ئێمیل"دا ڕۆمانێکی پەروەردەییمان هەیە و نەشیاو نییە وابۆچوونێکمان سەبارەت بەوە لە لا نەهێنێتە ئاراوە، کە هەروەك ڕوسۆ بییەوێ ئیدێی پەروەردەیەکی هاووڵاتییانە دابڕێژێ؛ بەڵام ئێمە هاوکات لە نووسینی "ئێمیل و سۆفی یان تەنیاکان"دا خەریکبوونێکی نوێی نووسەرمان هەیە سەبارەت بە نوشستیهێنانی کۆرپە پەروەردەکراوەکەی لە ژیاندا.

ڕوسۆ دەیەوێ مرۆڤ خۆی بەو چەشنە بناسێ، وەك ئەو خۆی چۆنە، چونکە مرۆڤ بەم ڕێیەوە لە خودی مرۆڤێتییەکەی و سروشتی لێرەبوونی خۆی تێدەگات. "ئەم پێشبینییەی روسۆ هاوکات دەزوولەیەکی ڕێنوماییکەری پەروەردەی ئێمیلە، بەڵام ئەم پێشبینییە برێتی نییە لە تێمێکی نێوەندی لە ،،پەیمانی کۆمەڵایەتی،،دا" (٥). "گەر خوێنەر بییەوێ لەو پلانەی ڕوسۆ بکۆڵێتەوە، کە بۆ پەروەردەیەکی هاووڵاتیانە دایناوە، ئەوا دەبێ تەماشای بەرهەمەکانی دیکەی ئەو بکات نەك "ئێمیل"، لێرەشدا بە تایبەتی لە ،،لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ئابووریی سیاسی،، و ،،چەند تێڕوانینێك دەربارەی حکومەتی پۆلۆنیا،، بڕوانێ" (٦). ڕوسۆ لەم دوو نووسینەدا، بە پێچەوانەی "ئێمیل"، هاوکات دەربارەی ئەو هونەرە دەدوێ، کە لەنێو مرۆڤدا خۆشەویستی بۆ فرمان و یاساکان بێدار دەکاتەوە، هەروەها دەربارەی ئەوەش، کە هاووڵاتییەکان بە نموونەی ڕەوشتی هاووڵاتێتی و نیشتمانپەروەریی فێر بکرێن بۆ ئەوەی چاك بن. لەبەر ئەوەی ناشێ کە هاووڵاتییەکان لە ڕۆژێکدا بفۆرمێنرێن، ئەوا ئەرکی دەوڵەت ئەوەیشە کە ئەوان هەر لە منداڵییەوە بە وانەی تایبەتی فێر بکات (٧).



کەواتە کێشە سەرەکییەکەی ڕوسۆ لە "ئێمیل"دا برێتییە لە "ئیدێی پەروەردە" ڕووەو پێگەیاندنی کەسێکی ئازاد و خۆناس. ئەو لە بەشی یەکەمی "ئێمیل"دا دەیدرکێنێ، کە ئێمە تەنها "لە دۆخێکی ئیدیالدا" توانامان بەسەر پەروەردەی مرۆڤدا دەشکێتەوە (بڕوانە پاشکۆ، ئێمیل، بەشی یەکەم).

ڕوسۆ لە "دیسکورزی نایەکسانی"دا مرۆڤ لەنێو پەیوەندییەکی ئیزۆلەی سروشتیدا دادەنێ. ئەم مرۆڤە خاوەنی هیچ ڕەمەکێکی بەکۆمەڵایەتیبوون نییە، بەڵکو بە تەنیا بۆ خۆی و لەتەك خۆیدا، وەك کەرتێکی جیانەکراوە لە سروشت، دەژی. هەروەها ڕۆمانی "ئێمیل یان دەربارەی پەروەردە" ڕوو دەکاتە منداڵی مرۆڤ و لە کۆمەڵگا دای دەبڕێ، بە مەبەستی ئەوەی ژیانی لەنێو سروشتدا بژێنێ و لەم ڕەوتەشدا هەمیشە پتر ئاشنای هەستەکانی خۆی ببێ. چۆن مرۆڤی سروشت هیچ ئاگایەکی لە چاکە و خراپە نییە و جارێ ئەقڵی ئاوەڵا نەبووە، ئاوهایش منداڵ چاکە و خراپە ناناسێ و جارێ زۆر دوورە لە تەمەنی ئەقڵ. ڕوسۆ دەبێژێ: سروشت دەیەوێ، کە منداڵ بەنێو منداڵیدا تێبپەڕێ، پێش ئەوەی ببێ بە مرۆڤ. ڕوسۆ لێرەدا بە ئاشکرا ڕەخنە لە جۆن لۆك دەگرێ و لە زۆر جێی "ئێمیل"دا درێژە بە ڕەخنەکانی لە ئەو دەدات. لۆك لە لێکۆڵینەوەکەیدا بە ناونیشانی "لێهزرین دەربارەی پەروەردە" (١٦٩٣) ئەو تێڕوانینە دەردەبڕێ، کە هۆشی مرۆڤ لەکاتی زاییندا برێتییە لە "تابولا رازا" (لەوحەیەکی خاڵی)، بە واتایەکی دی وەك پارچە کاغەزێکی پڕنەکراوە وایە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە بەرپرسیارییەکی گەورە دەکەوێتە ئەستۆی خێزان و فێرکاران سەبارەت بەوە، کە چی لەسەر ئەم کاغەزە بنووسرێ. کەواتە هەرچییەك لە منداڵ دەربچێ، ئەوا کامڵەکان بەرپرسیارن. گەر منداڵێك نەزان و شەرمن و بێئەدەب بێ، ئەوا ئەم مۆرکانەی نیشانەن بۆ نوشوستیهێنانی کامڵەکان و ئەمان بەرپرسیارن نەك منداڵەکە. بێگومان ئەم تێڕوانینانەی لۆك هزرۆکەی مەغزاداریان تێدایە، بەڵام

لۆك هاوكات منداڵ "دەبابەتێنی" (دەشتێنێ). ڕوسۆ بە پێچەوانەوە ئەو بڕوا بنەماییەی هەیە، كە "منداڵ لەنێو خودی خۆیەوە پڕبەهایە و تەنها دەسوێژ نییە بۆ مەبەستێكی تایبەتی" (٨). هەروەها ڕوسۆ "ژیانی هۆشەكی و پسیكۆیی منداڵ لەبەر ئەو هۆیە وەرناگرێ، بۆ ئەوەی (...) ئێمە (...) ئەو ژیانە بناسین و بتوانین منداڵەكانمان پەروەردە بكەین و پێبگەیەنین، بەڵكو (ئەو ژیانە وەردەگرێ)، چونكە منداڵ برێتییە لەو تەمەنەی ژیان، كە لە دۆخی سروشت نزیكترینە" (٩). ئەم دۆخە ئەوەیە، كە منداڵ جارێ زۆر دوورە لە تەمەنی ئەقڵ. ڕوسۆ پەیوەست بەم كێشەیەوە لە دژی لۆك دەنووسێ: "لۆك دەیویست منداڵ لەسەر بنەمای ئەقڵ پەروەردە بكرێ. ئەمە ئەمڕۆ لە لای ئێمە بووە بە مۆدە. بەڵام ئەم شێوازە بە بڕوای من سەركەوتوو نییە. هیچ شتێك لەو منداڵانە گەوجتر نییە، كە بەزۆر ئاقڵ كراون. ئەقڵ لەنێو سەرجەم توانستەكانی مرۆڤدا، كە بێگومان لە هەموویان پێكدێ، بە گرانتر و درەنگتر دەگۆڕرێ. ئەقڵ برێتییە لە بەرهەمی وەستایانەی پەروەردەیەكی چاك و بەم ڕێیەوە هەوڵ دەدرێ، مرۆڤێكی ئاقڵ بهێنرێتە گۆڕێ. كەچی زۆر كەس دەیانەوێ بەهۆی ئەقڵ خۆیەوە بەم ئاستە بگەن، بەبێ ئەوەی بزانن لە دوا پلەوە سەرچاوەیان گرتووە و لە منداڵەكەیان ئامرازێك چێ دەكەن. گەر منداڵ ئەقڵی هەبێ، ئەوا پێویستیی بە پەروەردە نابێ" (بڕوانە پاشكۆ، ئێمیل، بەشی دووەم).

كەواتە ڕێگەی پەروەردكار لە لای ڕوسۆ، لە بەراورد لەتەك پەروەردەی باوی پۆزەتیڤی سەردەمەكیدا، ئاڕاستەیەكی پێچەوانەی هەیە: لە سروشتێتییەوە ئاڕاستە دەگرێ، بە واتایەكی دی، "پەروەردەیەكی نێگەتیڤە". بنەمای سروشتێتی لە لای ڕوسۆ دیاریكەری ئەم هەڵوێستەیەتی. "پەروەردەی پۆزەتیڤ" لە لای روسۆ هەوڵێكی باوی كۆمەڵگایە بۆ ئەوەی هۆشی خاوی منداڵ پێش كاتی خۆی بفۆرمێنرێ، بەڵام ئەمە هەوڵێكە كە لە حەوسەڵەی منداڵدا نییە، چونكە



مرۆڤ بەم ڕێیەوە داوای مۆركی كەسانی كامڵی لێ دەكات. بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە ناكاملی دێتە جیهانەوە، ئەوا پێویستە دەرفەتی هەبێ بە شێوەیەكی سروشتی قۆناغەكانی گەشەكردنی ئۆرگانی ببڕێ: لە تەمەنی شیرمژەوە ڕووەو منداڵی، پاشان ڕووەو پوبەرتێ و ئینجا لە كۆتاییدا ڕووەو تەمەنی كامڵی.

كەواتە لە لایەك نابێ ئەو شتەی كە ڕوسۆ ناوی سروشتی لێ دەنێ، لەسەر دەستووری كۆمەڵگای هەیەپارێز بەدجۆر بكرێ، بەڵام لە لایەكی دیكەوە نابێ بە تەنیا لای خۆی جێبهێڵرێ، واتا پێویستە پەروەردە بكرێ، بێگومان پەروەردەیەك، كە "پێداویستییە ڕاستەقینە و سروشتییەكان"ی منداڵ بپارێزێ. ئەم پاراستنە، كە ڕوسۆ داوای دەكات، دژی نامۆبوونی مرۆڤ دەوەستێتەوە: پەروەردكار گەرەكە هەموو پێشكارییەك ئەنجام بدات، تاكو كۆرپەی بۆ پەروەردە تەرخانكراو وەك سەرجەمێك لەنێو سروشتەوە پێبگەیەنێ و ئەمەش تەنها بۆ خاتری خۆی منداڵەكە. ئێمە لێرەدا بەڕوونی نەسازییەكانی لێرەبوونی مرۆڤ دەبینین: منداڵی بۆ پەروەردە تەرخانكراو بۆی هەیە بە ویستی ئازادی خۆی شتەكان هەڵ ببژێرێ، بەڵام ئەو بۆی هەیە تەنها ئەوەی بوێ، كە پەروەردكار دەیەوێ!

كەواتە ڕوسۆ دەیەوێ سروشتی منداڵ بە ڕێگەی كۆنترۆڵێكی وردی پەروەردەكەیەوە بپارێزرێ، لێرەشدا پێویستە ڕەچاوی پلە جیاوازەكانی گۆڕانی جەستەیی و هۆشەكیی منداڵ بكرێ. منداڵ هەست و تێڕوانینی ئەوتۆی هەن، كە بە خۆی وەك منداڵ تایبەتمەندن، ئەوەش هەوڵێكی بەربەریانە دەبێ، گەر پەروەردكاران هەست و تێڕوانینەكانی خۆیان لەجێی ئەوانەی منداڵ دابنێن. بۆیە روسۆ دەنگ هەڵ دەبڕێ: وازی لێ بهێنن با لە ئازادیدا بژی! یارییەكانی برێتین لە خەریكبوونەكانی و لە نێوان هەردووكیاندا هیچ جیاوازییەك نابینێ! منداڵ لە كاتی یاریكردندا بە جیددیترین كارەكانی هەڵدەستێ!

بەم شێوەیە پەروەردکار لە "ئێمیل"دا بۆ ماوەی بیستوپێنج ساڵ، هەتا تەمەنی هاوسەرگیری، لەسەر ڕێنوماکانی سروشت لەتەك ئێمیلدا دەژی. چۆن ڕوسۆ لە "دیسکورزی نایەکسانیدا" ئەو ساتە دیاری دەکات، کە سروشت لەنێو خۆیدا کلۆر دەبێ و ئیتر لە خۆی دەردەپەڕێ، ئاوهایش دەیەوێ لە "ئێمیل"دا هەمان پنتی خۆدەرپەڕین دیاری بکات. هەر بۆیە ئێمیل لە سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەدوور دەگرێ و لەنێو سروشتدا، لە نزیکی خۆیەوە وەك نوێنەری سروشت، دەی ژێنێ. ئەم "پەروەردە نێگەتیڤە" ڕێ بە ئێمیلی منداڵ دەدات، خۆی بۆ گۆڕانە خۆییەکانی تەرخان بکات.

داهێنەری لە پەروەردەدا ڕۆڵێکی سەرەکی لە لای روسۆ دەگێڕێ. منداڵان گەرەکە کرۆکی زمان لەنێو شوێنەوارە ڕاستەوخۆکەیاندا بدۆزنەوە. شوێنەوار واتایەکی دیکەیە بۆ "سروشتی کراوە"، کە لە پلەی یەکەمدا برێتییە لە فێرکار و جێی فێربوون بۆ تاقیکردنەوەی کرداره خۆییەکان. بەڵام مەرجی ئەمە برێتییە لە ئەزموونکردنی شوێنەوار بە زێنزەکان. ئەوە ئەرکی پەروەردکار نییە، بە وشە شتە نادیارەکان بۆ منداڵ ڕوون بکاتەوە، بەڵکو ئەرکەکەی لەوەدایە، کە دەرفەتی بۆ ئاوەڵا بکات، تاکو شتەکان بە چاوی خۆی ببینێ و لێوەیان زانینەکانی هەڵبهێنجێ. منداڵ نەك هەرگیز ناتوانێ لە بیردۆزە ماتماتیکییەکان تێبگات، بەڵکو نەشیاوە بتوانێ لە تێگەیشتی "خوا" و ڕستە ئاڵۆزە ئایینییەکان تێبگات، بۆیە گەر کەمترین هەوڵ بدرێ بۆ ئەوەی ئەم ڕستانە بەزۆر بخزێنرێنە نێو مێشکییەوە، ئەوسا سەرەنجامێکی ئەوتۆی لێ دەکەوێتەوە، کە ئەو منداڵە توانستی سەنگاندن دەدۆڕێنێ. سەرجەمی پێشبڕیارەکان، ئۆتۆرێتی، نموونەکان، دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، سروشتێتی لەنێو منداڵدا دەکوژن. هەر بۆیە ڕوسۆ پێشنیار دەکات، کە منداڵ لە بەزمی کۆمەڵگا دوور بخرێتەوە و ببرێ بۆ "گوند": گەر منداڵ ژیانێکی سادە لە نێو



سروشتی کراوەدا بەڕێوە بەرێ و هاوکات زۆربەی کات بۆ خۆی جێ بهێڵرێ، ئەوسا پەروەردکار ئەرکەکەی خۆی بە چاکی ئەنجام داوە. چونکە سروشت دەیەوێ کە منداڵ سەرەتا منداڵ بێ پێش ئەوەی پێبگات. ڕەچاونەکردنی ئەم بنەمایە، لە ڕوانگەی ڕوسۆوە، بەرهەمێکی ئەوتۆ دەخاتەوە، کە منداڵ پێناگات، هەروەها "بێچێژ"ی لێ دەردەچێ و ئیتر پاشان هێندە ناخایەنێ، کە بۆگەن دەکات، بۆیە بە توانجەوە ڕوو لە پەروەردکارانی سەردەمەکەی دەکات: "ئێمە دەمانەوێ دکتۆری گەنج و منداڵی پیر" بەخێو بکەین.

روسۆ هەروەها بۆ پەروەردەی سێکسوالێتی داوا لە پەروەردکاران دەکات ڕاستگۆ بن و هیچ شتێك پەیوەست بە سێکسوالێتییەوە لە منداڵ نەشارنەوە. بۆ ئەوەی فزوولییەتی منداڵ ساتار بکرێ، ئەوا پەروەردکار پێویستە بە ئاسانی و ڕوونی، "بەبێ زەردەخەنەی تەوسدار و لچهەڵقورتاندن"، وەڵامی ئەو پرسیارانەی منداڵ بداتەوە، کە بە سێکسوالێتییەوە پەیوەستن. بەڵام دەبێ ئەو وەڵامانە ڕاست بن. هەر ئەوەندەی منداڵ درۆیەکی پەروەردکار ئاشکرا بکات، ئیتر بەرهەمی ئەو پەروەردکارە تێکچووە.

کەواتە ئیدێ پەروەردەزانییەکەی ڕوسۆ زەمینەیەکی دوولایەنیی هەیە: زەمینەکە لە لایەك لە تێگەیشتنی ئەودایە سەبارەت بە مرۆڤ، لە لایەکی دی لە "پەروەردەیەکی نێگەتیڤ"دایە. بەم پێیە سروشت ئامانج و ڕێگەی پەروەردە دیاری دەکات: سروشت لە لایەك وەك یاسامەندییەکی پسیکۆلۆژییانەی ژیانی خۆبگۆڕ چوواندنی هەیە، بەڵام لە لایەکی دی وەك نۆرم ی مرۆڤی ئازاد، کە تەنها ئەوەی دەوێ، کە خۆی دەیتوانێ و ئەوەش دەکات کە خواستی خۆیەتی (١٠). بەڵام ڕوسۆ بە شێوازێکی نێگەتیڤ و بە دەسوێژی ناڕاستەوخۆ هەوڵی گەیشتن بەم ئامانجە دەدات. ئەرکی نێگەتیڤی پەروەردکار ئەوەیە، کە منداڵ لە سەرجەم ناسروشتێتیی هێزە کولتووری و داواکارییە کۆمەڵایەتییەکان بپارێزێ،

ئەركە پۆزەتیڤەكەی ئەوەیە، كە ناڕاستەوخۆ كاریگەریی لەسەر گۆڕانی منداڵ بنوێنێ، لێرەشدا شوێنەواری منداڵ و و دۆخە پەروەردەییەكان بە چەشنێك ڕێك بخات، كە بتوانن بە شێوەیەكی پۆزەتیڤ ڕۆڵێك بۆ كامڵبوونی منداڵ بگێڕن ([١١]).

## بەشی پێنجەم:

# زانینەوەی کلاسیکی مافی سروشت لە نموونەی تۆماس هۆبس و جۆن لۆکدا

### ١- دارِشتن

بۆ پتر تێگەیشتن لـە ڕوسـۆ و فەلسەفە سیاسـییەکەی، چاکترە هـزری ئـەو بخرێتە بەراوردەوە لەتەك تیۆرییە سیاسییەکانی تۆمـاس هـۆبس و جـۆن لۆکـدا. کاتێك ڕوسۆ ئیدێی کۆمارێك لە پێناوی چاککردنەوە و ئـازادیی مرۆڤـدا دادەنـێ، ئەوا بە پێچەوانەوە فەیلەسوفی ئینگلیـزی، بێگومـان هـەر یەکـەیان بـۆ مەبەسـتێکی تایبـەتی، لـە کێشەی دەسـەڵاتداری دەڕوانـن: هەڵبەسـتنی لەشـێکی سیاسـی لـە لای هـۆبس بـۆ مەبەسـتی چەسـپاندنی ئاشـتی و ئاسایـیشە لـە نێـوان مرۆڤاندا، بەڵام دامەزراندنی لەشێکی سیاسی لە لای لۆك بۆ مەبەسـتی پاراسـتنی خاوەنداریی تایبەتییە.



### ١-١- تۆماس هۆبس

هۆبس (١٥٨٨ —١٦٧٩) هەموو شێوازێکی ژیان ناو دەنێ دۆخی سروشت، گـەر دەسەڵاتی سۆڤەرێنێکی ڕەها بەسەرییەوە زیت نەبووبێتەوە و هەر تاکێکی نێـوی بۆ پێکـەوەژیان ناچـار نـەکات. زەرورەی ئـەم سـۆڤەرێنە بـۆ هـۆبس لـەوێوە سـەر هەڵـدەدات، کـە بـۆ ئـەو دۆخـی سروشـت هاوکـات دۆخـی جـەنگ پێکـدەهێنێ. بێگومان ئەم دۆخە لە لای هۆبس تـەنها واتـای شـەڕ و کوشـتار ناگەیـەنێ، بـەڵکو بەگشتی دۆخێکی درێژخایەنـە و بەئاشـکرا ئامـادەیی مـرۆڤ بـۆ شـەڕ و دەمەقاڵـە بەدی دەکرێ؛ بەکورتی، مرۆڤ شەڕانگێزە. ئەوەی لەم دۆخەی "جـەنگی یـەك دژ بـە یـەك"دا وەك سـیمای مـرۆڤ باڵادەسـتە، بـڕێتین لـە ڕەمـەکی خۆهێـشتنەوە و منخوازیی بێجڵەو.

هۆبس فەلسەفە ماتەریالیستییەکەی ڕاستەوخۆ لـە ئەنترۆپۆلۆژییەکەیـدا دەخاتە گەڕ. مرۆڤ برێتییە لە جەستە، زەیـن و ئـەقڵ بـڕێتین لـە زێنزایـەتی و تەنها لە ڕووی پلەوە لە زێنزایەتیی ئاژەڵ جیاوازن. کـرداری مـرۆڤ هیـچی دیکـە نییـە جگـە لـە وازیـی زێنزەکـانی، کـە وەك پەرچەچالاکیی ڕووەو دەرەوەی ئـەو دەردەکەون. لەبەر ئەم هۆیە مرۆڤ ئـازاد نییـە، بـەڵکو دیلـی زێنزەکـانێتی، بـەڵام ئەمـە هاوکـات بـەبێ جیـاوازی ئـاژەڵیش دەگرێتـەوە. مـرۆڤ هـەموو ئـەو شـتانە وەردەگرێ، کە لەنێو سۆزە زێنزییەکانیدا شادیبەخشن، بەڵام هـەموو ئـەو شـتانە پـەرچ دەداتـەوە، کـە بـۆ ئـەو مایـەی ناخۆشـین. کەواتـە کـرداری مـرۆڤ تـەنها ڕوودانێکی فیزیکییە. ئێمە چ لە زانستە سروشتییەکان و چ لە لای مـرۆڤ هـەمان دیاردە بەدی دەکەین، هێندە نەبێ، کە ئێمە نـاوی جیـاواز لـەو دیاردانـە دەنـێین: لە زانستی سروشتیدا تـەنها پەسـتان و لێـدان کاریگـەرن، بـەڵام، بەرانبـەر ئەمـە،

لەنێو کۆمەڵدا تەنها بەرژەوەندی و دەسەڵات خۆیان دەنوێنن؛ هەر بۆیە چۆن لەو زانستانەدا ڕاستیی ئەزەلی نییە، ئاوهایش لەنێو کۆمەڵی مرۆڤدا نۆرمی ئەزەلی نییە. (١)

مرۆڤی دۆخی سروشت ئاژەڵە، چونکە لەم دۆخەدا تەنها حەزی سروشتی کاریگەرە. سروشت ڕەوایەتیی بە هەموو یەکێك داوە بۆ ئەوەی هەموو شتێك بە ویست و هەوەسی خۆی بکات، یان هەموو شێوەیەکی موڵك و سامان هەتا ڕادەی "بڕکردنی" ویست و توانستی بسەنێ. کەواتە مرۆڤان لە سروشتەوە یەکسانن بە یەك. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك لەم یەکسانانە ڕەوایە بۆ نواندنی هەر هەڵوێستێك یان بۆ سەندنی هەر شتێك، ئەوا دەبێ هەموو لە یەکتری بترسن. چونکە سەرەنجامەکانی ئەم مافە بە شێوەیەك هاوکێش دەکەونەوە، کە ئیتر هەر وەکو ماف نەبێ. (٢)

هۆبس سێ فاکتەری سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی ناکۆکی دیاری دەکات: هاڤرکێ، بێبڕوایی (واتا بەرگریی لە خۆ)، هەروەها دەردی ناوبانگ (واتا هەوڵی گەیشتن بە شەرەفمەندی). ئەم سێ فاکتەرە هۆی ناکۆکییەکانی نێوان مرۆڤانن. ئامانجی هاڤرکێ گەیشتنە بە دەسەڵات. هاڤرکێی نێوان مرۆڤان، کاتێك هەر یەکە تاکڕەوانە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی تێدەکۆشێ، دەبێ بە هۆی شەڕ و ناکۆکی. گەر دوو کەس هەمان خۆزگەیان بۆ شتێك هەبێ و نەتوانن ئەو شتە لە نێوان خۆیاندا بەش بکەن، ئەوا هەر یەکەیان دەبێ بە دوژمنی ئەویدی. بەڵام هەوڵی هەر یەکەیان بۆ گەشتن بەو بابەتە بەندە بە ڕەمەکی خۆهێشتنەوەی مرۆڤەوە، بۆیە هەر یەکەیان دەخوازێ ئەویدیکەیان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە یان تەنانەت بیکوژێ. بەڵام کاتێك هەموو یەکێك توانای هەیە بە تەنیا یان بە یەکگرتن لەتەك کەسانی دیکەدا زیان بە مرۆڤی دی بگەیەنێ، ئەوا خۆیشیان لە مەترسیدا دەژین، کە لە لایەن کەسێك یان دەستەیەکی بەهێزترەوە کۆتاییی بە



ژیانیان بهێنرێ. بەهۆی ئەم ترسەوە، واتا ئەم بێبڕواییەوە، هیچ کەسێك لە ئاسایشدا ناژی. تاکە ڕێگەی هەر تاکێك ڕێگەی ئاقڵانەی دەستپێشکەرییە، واتا ڕێگەی فێڵ و زەبرە، تاکو بتوانێ کەسانی دی هەتا ڕادەی بڕکردنی توانست و ویستی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕوانگەی هۆبس ئامانجی کۆتاگر نییە، ئەوا مرۆڤ بۆ ماوەیەکی هێندە درێژ هەوڵی سەرورەریی دەدات، کە ئیتر چیدی دەسەڵاتێکی دیکە بەدی نەکات و بەهۆی گەورەیی قەوارەکەیەوە ژیانی ئەو بخاتە مەترسییەوە. ئەمەیش بۆ هۆبس هەڵوێستێکی ڕەوایە، چونکە بە خۆهێشتنەوەی مرۆڤەوە بەندە.

دەردی ناوبانگ بۆ مەبەستی گەیشتنە بە شەرەفمەندی. هەموو یەکێك دەیەوێ دراوسێکەی بەو چەشنە ڕێزی لێ بگرێ، کە ئەو بە شایستەی خۆی دەزانێ. گەر کەسێك ڕێزی لە لایەن دراوسێکانییەوە لێ نەگیرێ، ئەوا هەوڵ دەدات زیانیان پێبگەیەنێ و تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە. بە کورتی: "ژیانی مرۆڤ لەم دۆخەی سروشتدا تەنیا و هەژارە، بۆگەن و ئاژەڵی و کورتخایەنە".

بێگومان لە دۆخی سروشتدا یاسای سروشتی هەیە، بۆ نموونە ئاشتیخوازی، مرۆڤپەروەری، سوپاس و مەمنوونی. بەڵام ئەم یاسایانە بۆ هۆبس تەنها دیاردەن و بەناچاری وەك سەرەنجامی پێکەوەژیان هاتوونەتە ئاراوە، هاوکات هەوڵن بۆ "بۆ مسۆگەرکردنی ژیانی خۆ"، چونکە هەموو یەکێك ئەقڵی هەیە و دەزانێ، کە نواندنی هەڵوێستی بەم چەشنە بۆ خۆهێشتنەوە پێویستە.

هۆبس بە هیپۆتێز پێکەوەژیانی مرۆڤی سەردەم لە دەرەوەی دەسەڵاتێکی نێوەندی دادەڕێژێ، واتا دەیخاتە نێو دۆخێکی سروشتی یان نادەوڵەتییەوە. ئەوەی لەم دۆخەدا سەرورەرە، برێتییە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە خاوەنداری و دەسەڵاتەوە. هۆبس نەك تەنها سامان و زانین وەك دەسەڵات، بەڵکو تەنانەت شەرەفمەندیش وەك بەخشینی دەسەڵات دادەنێ، ئەویش چونکە دراوی کەسانی

دیکەیە. سۆزەکانی مرۆڤ بریتین لە داواکاریی کەم یان زۆر بەهێز بۆ دەسەڵات و سامان، زانین و شەرەفمەندی. کەواتە ئێمە لێرەدا پەیوەندیی کۆمەڵایەتیمان هەیە، چونکە ئەم تێگەیشتانەی دەسەڵات بەندن بە مرۆڤەوە لەنێو رێکخراوێکی کۆمەڵایەتیدا و هاوکات نیشانەن بۆ نەمانی شیمانەی رێگری لە جەنگی یەك دژ بە یەك، گەر هاتوو دەسەڵاتێکی نێوەندی نەبێ.

مرۆڤی هۆبس، وەك گورگی مرۆڤ، لە سروشتێکی درندە دەچێ، کە تەنها رەمەکی دەسەڵات پاڵهێزی کردارەکانێتی، کە وەکو گورگ چ بۆ خۆی و چ بۆ هاومرۆڤەکانی دژکارێکی ترسناکە. مرۆڤ ئەوە ئەنجام دەدات، کە بۆ خۆی گەرەکێتی. بۆیە مرۆڤ خاوەنی ئازادییە، ببێ بە دژبەری رێنوما کۆمەڵایەتییەکان.

بەڵام ئەم مرۆڤە خاوەنی شیمانەیەکە بۆ خۆرزگارکردن لە نەگبەتیەکانی دۆخی جەنگ: دامەزراندنی دەوڵەت. پێزانینی دووچاربوونی هەمووان بەو دۆخەوە دەبێ بە هۆیەك، کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ بۆ نەهێشتنی لایەنە نالەبارەکانی دۆخی سروشت. ئەقڵ پاڵنەری سەرەکییە بۆ نواندنی ئەم هەڵویستە. هەروەها — بە زمانی هۆبس – ژمارەیەك "سۆز"ی مرۆڤی هەن، کە پاڵنەرن بۆ هەوڵی چەسپاندنی ئاشتی، بۆ نموونە ترس لە مردن، خواستی گەیشتن بە پێداویستییەکانی ژیانێکی بەختیار، هەروەها هیوای کۆتاییهێنان بەو دۆخەی جەنگ. چونکە ئەوە دەستوورێکی ئەقڵە، کە فەرمان دەدات: هەتا ئەو رادەیەی هیوای ئاشتی هەبێ، دەبێ هەموو یەکێك هەوڵی بۆ بدات، بەڵام گەر هیوای ئاشتی برا، ئەوسا هەموو یەکێك دەتوانێ هەموو دەسوێژێکی جەنگ پەیدا بکات و بەکاری بهێنێ. بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکانی دۆخی جەنگ لە حەوسەڵەی مرۆڤدا نامێنن، ئەوا مرۆڤان بەناچاری بڕیار بۆ ئاشتی دەدەن. سەرباری ئەمەیش رێککەوتنی مرۆڤان بۆ رزگاربوون لە نەکبەتییەکانی دۆخی



جەنگ بەس نییە، چونکە لە روانگەی هۆبس تەنها کاتێك ئاشتی و ئاسایش لەنێوان مرۆڤاندا دەچەسپێ، گەر هەموو یەکێك واز لە داواکاریی "هەبوونی ماف بۆ هەموو شتێك" بهێنێ و ئەو مافەی بە دەسەڵاتێکی باڵا "بگەیەنێ". کەواتە تاکە رێگەیەکی رزگاری برێتییە لە "دروستکردنی" دەسەڵاتدارییەك، کە هەموو ئەندامێکی نێو کەسەدەوڵەت بەرێی سڵەماندنەوە و سزادان ببەستێتەوە — چونکە، وەك هۆبس دەبێژێ، "پەیمان بەبێ شمشێر وشەی پووچە".

دوای وازهێنانی مرۆڤ لە هەبوونی ماف بۆ هەموو شتێك، پاشان بەخشینی بە سۆڤەرێنێك، دەوڵەت دادەمەزرێ! سۆڤەرێن دەشێ مرۆڤێك بێ یان لە چەند مرۆڤێك پێکهاتبێ. بەڵام سۆڤەرێن تەنها ئەو کاتە بە هەقیقی هەیە، گەر خۆی بە شێوەیەکی ئەبسولوت (رەها = لێحیابۆوە) بەسەر کۆمەڵگاوە ببینێتەوە، هاوکات بەهێزی دەسەڵاتە رەهاکەی یاسا دابنێ و مافی ئەندامان دیاری بکات، خەڵات بەسەر ئەو ئەندامانەدا ببەخشێتەوە کە شایستەیین، هەروەها لەپاڵ ئەمانەدا سەرجەم شەرەف و کەرامەت بە ئەوەوە بەندن. چونکە هەموو ئەندامێك ویستی خۆی دەخاتە ژێر رکێفی ویستی سۆڤەرێنەوە، ئەمەش بە شێوەیەك، کە سۆڤەرێن وەکو جەستەیەك کۆی ویستەکان لەنێو خۆیدا یەك دەخات. بەرێی ئەو زەبرەوە، کە لەنێو دەسەڵاتەکەیدا بەدی دەکرێ، بۆی دەلوێ هاووڵاتییان بۆ یەکێتی و پێکەوەگونجان ناچار بکات، بەبێ ئەوەی خۆی شیاوی سزادان بێ. ئەم پەیوەندییە دەبێ لە پێناوی چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشدا بەردەوام بێ، دژایەتیکردنی سۆڤەرێن نەشیاوە و هاوکات هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت تەنها مافی ئەوە. بەڵام دەبێ پەیوەست بەم کێشەیەی سۆڤەرێن لە لای هۆبس لایەنێك جەخت لێبکرێ، ئەویش تاکو سۆڤەرێنەکەی هۆبس وەك دێسپۆت پێشبینی نەکرێ.

سۆڤەرێن دەبێ لە بەرژەوەندیی هاووڵاتیاندا کردار بنوێنێ. سۆڤەرێن گەرەکە ژێردەستەکانی خۆی بپارێزێ. گەر سۆڤەرێن هەڵوێستێکی پێچەوانەی پارێزگاریی هاووڵاتییان وەربگرێ، ئەوا "ئەو سیقەیە ناهێڵێ"، کە هاووڵاتییەکان پێیان داوە و ئەمەیش هاوکات شکاندنی "یاسای سروشتییە". (٣) یەکەم ئەرکی سۆڤەرێن چەسپاندنی ئاشتی و ئاساییشە لەنێو دەوڵەتدا.

ئەرکێکی دیکەی یەکجار گرنگی سۆڤەرێن ئەوەیە، کە کێشەی خاوەنداریی لە "بەرژەوەندیی هاووڵاتییەکان"دا چارەسەر بکات. داواکارییە هەر سروشتییەکانی مرۆڤ لە پێناوی مانەوەی خۆیدان، بۆ نموونە خۆراك، ئاو، شوێنی گوزەران و هتاد. گەر ئەم پێداویستییە کرۆکیانەی مرۆڤ پەیوەست بە دۆخی سروشتە هیپۆتێزییەکەی هۆبسەوە وەربگرین، ئەوا "شێوەیەکی خاوەنداریی تایبەتی لە دۆخی سروشتدا" دەبینین. بەڵام ئەوە ئەرکێکی سەرەکیی سۆڤەرێنە، کە کەڵەکەکردنی بێمافی موڵك بووەستێنێ و "زەوی" لە پێناوی چەسپاندنی ئاشتی و ئاساییشدا بەسەر هاووڵاتییەکاندا دابەش بکات. گەر سۆڤەرێن گرنگیی بەم بنەمایە نەدات، ئەوا بە پێچەوانەی ویستی ژێردەستەکانەوە هەڵوێست دەنوێنێ، واتا ئەو ژێردەستانەی کە ئاشتی و ئاساییشیان بە سۆڤەرێن "سپاردووە". سۆڤەرێن دەبێ هەمیشە بەئاگا بێ لەو هەقیقەتە، کە "هیچ ژێردەستەیەك نابێ کەمیی لەو شمەکانەدا هەبێ، کە بۆ مانەوەی پێویستن". (٤)



### ١-٢- جۆن لۆك

لۆك (١٦٣٢-١٧٠٤) بە هیپۆتێز لە کێشەی دەسەڵاتی سیاسی نزیك دەکەوێتەوە: گەر بمانەوێ لە دەسەڵاتی سیاسی تێبگەین و لە سەرچاوەوە ڕوونی بکەینەوە، ئەوا دەبێ لێبهزرێین، کە ئاخۆ مرۆڤی سروشت لە سەرەتاوە لە چ دۆخێکدا ژیابێ. لۆك بۆ ئەم مەبەستە چ دەسەڵاتداری و چ ژیانی کۆمەڵایەتیی سەردەم هەڵدەداتەوە، لێرەشەوە لە ڕەوتی گەڕانەوەیدا بۆ دۆخی سروشت بە گورگی مرۆڤ ناگات، بەڵکو بە مرۆڤی ئازاد و ژیاو لەنێو دۆخی ئازادیی ڕەهادا. یاسای سروشتی تاکە سنوورێکە، کە بۆ ئەم دۆخە کێشرابێ.

هەموو مرۆڤێکی دۆخی سروشت، لە ڕوانگەی لۆك، خاوەنی موڵکی خۆیەتی و هاوکات بە ویستی هیچ کەسێکی دیکەوە بەند نییە. بەڵام دۆخی سروشت هاوکات دۆخی یەکسانییە، چونکە دەسەڵات و زەبر نێوخۆیین و هیچ مرۆڤێك موڵکی زۆرتری لە یەکێکی دی نییە. مرۆڤایەتی وەك سەرجەم بەرهەمی کردگارێکە، خزمەتکاری خوایەکی سۆڤەرێنە و تەنها لەسەر فەرمان و ڕێنومای ئەو بۆ نێو جیهان نێرراوە، بۆیە مرۆڤ نە ژیانێکی بێجڵەو بەڕێوە دەبات و نە ئازادە ژیانی خۆی یان هینی یەکێکی دی تێکبشکێنێ. لە دۆخی سروشتدا یاسایەکی سروشتی هەیە، کە برێتییە لە ئەقڵ و خوا بە مرۆڤی بەخشیوە، هەتا لەسەر ڕێنوماکانی بەڕێوە بڕوات و زیان بە هیچ کەسێك نەگەیەنێ.

بە بڕوای لۆك لە دۆخی سروشتدا "خاوەنداریی تایبەتی" هەیە. خوا زەوی و بەرهەمەکانی بە مرۆڤ بەخشیوە، هەتا بۆ گوزەرانی خۆی بەکاریان بهێنێ، بەبێ ئەوەی مافی موڵکداری لەسەر شتێك بەرزبکاتەوە. بەڵام مرۆڤ مافی هەیە بۆ ئەوەی بە موڵکگریی "کەسی خۆی" هەستێ، بۆیە کاری لەش و بەرهەمی دەستەکانی هینی ئەون. کەواتە ئەم پەیوەندییە بۆخۆگریی موڵك بەدەر ناکات،

چونکه هەموو یەکێك ڕەوایە بۆ هێشتنەوەی ژیانی خۆی و وەرگرتنی بەرهەمی کارەکەی. ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە سروشتیان دەسەنێ، دەبن بە موڵکی ئەو وەك خاوەندار، چونکە کاری ئەو ئێستا بەو موڵکە تێکەڵ بووە و لێرەشەوە کەمێك زیادی کردووە: بەرهەمەکەی لە دۆخی سەرچاوەیی دوور خستۆتەوە و ئەمەیش مافی گشتی بۆ ئەو بەرهەمە بەدەر دەکات. بەڵام لۆك سنوورێك بۆ بۆخۆگریی موڵك دادەنێ: مرۆڤ خاوەنگری ڕێژەیەکی ئەوتۆ بەرهەم دەبێ، کە بەشی ژیانی بکات.

بەڵام بۆ لۆك بەرهەمی زەوی برێتی نییە لە بابەتی سەرەکیی خاوەنداریی، بەڵکو زەوییەکە خۆیەی وەك پاڵهێزی هەموو شتێك. مرۆڤێك پارچە زەوییەکی چەند بەرین بۆ کشتیاری خۆش بکات و هەتا چ ڕادەیەك بتوانێ سوود لە بەرهەمەکەی وەربگرێ، ئەو مرۆڤە هێندە موڵکی دەبێ. چونکە خوا نەی ویستووە جیهان بۆ هەمیشە موڵکی گشتی بێ، بەڵکو خوا جیهانی بە مرۆڤی چالاك و ئاقڵ بەخشیوە، هەتا بۆ سوودی خۆی بەکاری بهێنێ. بۆیە گەر کەسێك ویستی بە چاندن هەستێ و هیچ زەوییەکی جگە لە پارچەیەك موڵکی کەسێکی دی بۆ نەمابۆوە، ئەوا ئەو کەسە بێموڵکە هیچ هۆیەکی نییە گلەیی بکات، چونکە خاوەندار زەوییەکەی بە کاری خۆی خۆشکردووە، کە ئیتر ئەو کەسە پێویست ناکات خۆی بەم لایەنەوە خەریك بکات.

لەو ڕوانگەیەوە، کە خوا زەوی بە مرۆڤ دەبەخشێ تاکو بۆ سوودی خۆی بەکاری بهێنێ، سەرەنجامێك دەکەوێتەوە و ئەوەیە، کە مرۆڤ تاکڕەوانە بە خاوەنگریی "سنووردار" هەڵدەستێ. بەڵام دوای ئەوەی پارە وەك دەسوێژی گۆڕینەوە دێتە نێوانەوە، ئیتر مافێکی "بێسنوور" بۆ خاوەنگری جێی خاوەنگریی سنووردار دەگرێتەوە. پارە دەستووری ئاقلانەی خاوەنداری، کە فەرمان دەدات، هەموو یەکێك پێویستە بەقەد پێداویستییەکانی خۆی هەبێ،



هەڵدەوەشێتەوە. هۆی ئەم هەڵوەشاندنەوەیە لەوەدایە، کە داواکارییەکانی مرۆڤ بۆ موڵکی زۆرتر هەمیشە پتر پەرە دەسێنن و لێرەشەوە نرخی نێوخۆیی شتەکان دەگۆڕن. بۆیە سەرەنجام هەمووان لەسەر پارچەیەك میتالی زەرد ڕێك دەکەون، کە نە دەوەرێ و نە بۆگەن دەکات، هەروەها دەشێ نرخی پارچەیەك گۆشتی گەورەی هەبێ.

زێڕ و زیو دەبن بە دەسوێژێك، کە بە یاریدەی مرۆڤ دەتوانێ بە موڵکی زۆرتر بگات، بە واتایەکی دی، دەستکەوتی بەرهەمەکەی بە پارە بگۆڕێتەوە و وەك سەرمایە دای بنێ. بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕوانگەی لۆك پەرەپێدانی بێسنووری موڵك مافی هەمووانە و هاوکات لە پێناوی بەختیاریی گشتیدایە، ئەوا لۆك داوا دەکات، بە گۆڕینی دەستکەوت بۆ پارە و دانانی وەك سەرمایە خاوەنگرییەکی بێسنووری زەوی بەگەڕ بخرێ. گەر کەسێك بە پارچە موڵکێکی زۆر بەرین گەیشتبێ، ئەوا ئەو کەسە بەو خاوەنگرییەی هیچی لە موڵکی گشتیی کەم نەکردۆتەوە، بە پێچەوانەوە پەرەی پێداوە، چونکە خاوەنداریی تایبەتی ڕێژەی بەرهەم بەرز دەکاتەوە و ئەمەش بۆ سوودی هەمووانە.

دۆخی سروشت لە لای لۆك بەنێو دوو قۆناغدا تێدەپەڕێ و ئیتر لە میانەیەکدا مافی بێسنوور و دیارینەکراو جێی مافی سنووردار و دیاریکراوی خاوەنداری دەگرێتەوە. هۆی ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ داهێنانی پارە. ئابووریی پارە هەمیشە پتر ڕەمەکی موڵکخوازیی مرۆڤ بێدار دەکاتەوە و دۆخی ئاساییش بۆ "دۆخی جەنگ" وەردەگۆڕێ. لێرەوە زەرووڕەی دەوڵەت چێ دەبێ، کە بێگومان وەك لای هۆبس دەوڵەتی گەرەنتیدەری ئاساییشی گشتی نییە، بەڵکو برێتییە لە دەوڵەتی پارێزەری خاوەنداری.

پێکەوەیانی مرۆڤ لەسەر ڕێنومای ئەقڵ دۆخی سروشت پێکدەهێنێ. پەڕینەوەی مرۆڤ بۆ نێو ژیانی کۆمەڵگا بەسەر دۆخی جەنگدا تێدەپەڕێ و

بریتییە لە دۆخی کوشتار و دوژمنایەتی. لە دۆخێکی بەم چەشنەدا نەشیاوە کەس بتوانێ بانگەوازی کەسێك یان هێزێکی دادگەر بکات. نەبوونی دامەزراوێکی چاودێر "مافی ڕاگەیاندنی جەنگ بە هەموو مرۆڤێك لە دژی هێرشبەرێك دەدات".

نەبوونی دادگەرێکی ڕەسمی مرۆڤ دەخاتە دۆخی سروشتەوە. نواندنی ناڕەوای زەبر دژی مرۆڤی دی دۆخی جەنگ چێ دەکات، بەڵام لێرەدا ئەوە هیچ گرنگ نیە، کە ئاخۆ دادگەرێك هەبێ یان نەبێ.

هەنگاوی مرۆڤ بۆ نێو کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی نەهێشتنی کێشە و نەگبەتییەکانی دۆخی جەنگ. هەر ئەوەندەی ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ ڕێککەوتن، ئیتر لێرەوە کۆمەڵگایەکی سیاسی پێکدەهێنن و هەر یەکەیان دەبێ بە ئەندامی. لۆك ئەم لەشە سیاسییە بە جەستەی فیزیکی دەچوێنێ. لەبەر ئەوەی هەموو جەستەیەك لە بزووتنـدا یەك ئاڕاستەی هەیە، ئەوا لەشی سیاسی بەزەرووره ڕووەو ئەو شوێنە دەبزوێ، کە هێزی گەورەتری "نێو ئەو لەشە خۆی" دەیبزوێنێ. ئەمەش بریتییە لە پەیمانی زۆرایەتی و مەرجی پەیمانی دەوڵەتە. بۆیە دەبێ هەموو یەکێك بڕیاری زۆرایەتی وەربگرێ.

هاووڵاتییەکان دوای بەستنی پەیمانی دەوڵەت مافی خۆیان بە ئۆرگانە سیاسیەکانی کۆمەڵگا "دەسپێرن". لۆك بەرانبەر وشەی سپاردن پەیوەندی بڕوا (سیقە) لە نێوان ژێردەستەکان و هەردوو زەبری سیاسیدا، واتا یاسادانەر (لێجیسلاتیف) و بەجێگەیەنەردا (ئێکسەکوتیڤ)، دیاری دەکات. بەڵام دەسەڵاتی یاسادانەر تاکە دەسەڵاتێکی سۆڤەرێنە لەنێو دەوڵەتدا. لۆك ئەم ئۆرگانە دەداتە دەستی ئەو کەسانە، کە تەنانەت یاسادانەرن، بەڵام بە هەمان شێوەی هەموو هاووڵاتییەك لەژێر ڕکێفی یاساکاندان. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەتە،



کە هێزی یاسادانەر دەسەڵاتی لە "گەل" وەردەگرێ و گەر دەسەڵاتەکەی بەخراپی بەکارهێنا، ئەوا گەل هەموو کات ڕەوایە دای بگرێ.

ئامانجەکانی دەوڵەت لەپاڵ پاراستنی خاوەنداریدا بریتین لە ئاسایش، هەروەها ئاشتی و بەختیاریی گەل. بەڵام گەل لە لای لۆك لە دوو بەش پێکدێ، کە بریتین لە خاوەندار و کرێکار. کەواتە ئێمە لە لای لۆك دوو تێگەیشتنی جیاوازی هاووڵاتیمان هەیە و لێرەشدا بۆ ئەو تەنها خاوەنداران گرنگن. هەر یەکەی ئەم دوو چینە مافی تایبەتمەند و پلەی جیاوازی ئەقڵی هەیە. لە ڕوانگەی لۆك کرێکاران بێتوانان بۆ نواندنی هەڵوێستی سیاسیی ئاقڵانە، چونکە کرێکار "دەست لەنێو دەم دەژی".

## ٢- تەریبی ڕوسۆ بۆ تۆماس هۆبس و جۆن لۆك

گەر مرۆڤدیدییەکەی ڕوسۆ لەتەك هەمان تێگەیشتنی هۆبس و لۆکدا بخەینە بەراوردەوە، ئەوا دەتوانین جیاوازییە بنەماییەکانیان سەبارەت بە تێگەیشتنی "کۆمەڵی سیاسی" بەڕوونی دیارد بهێنین. گرنگترین پاساوی ڕوسۆ دژی تیۆرییەکانی هۆبس و لۆك لە کایەی فەلسەفەی زماندایە. یەکەم زمانی مرۆڤ لە ڕوانگەی ڕوسۆ بریتییە لە "هاواری سروشت" و مرۆڤ بەو هاوارە تکای یارمەتیی لە هاوجۆرەکەی دەکات. لەبەر ئەوەی مرۆڤی دۆخی سروشت جاری زمانی نییە، ئەوا مەحاڵە بتوانێ گۆڕان بە هزرین بدات یان کۆمەڵگایەك دابمەزرێنێ. ئەو مرۆڤە وەحشییانە "دەبوو شارەزاییان لە مێژووی سروشت و مێتافیزیکدا هەبێ"، تاکو بتوانن لە "واتای گشتیی تێگەیشتەکان تێبگەن"، واتا ئەو تێگەیشتانەی کە "لە سەرەتاییترین هێما لینگویستییەکاندا هەن". چونکە زمان تەنها هزرین و پێشبینی نیشان نادات، بەڵکو زمان هاوکات بە دەربڕین

هەڵدەستێ و لێرەشەوە بەشێکی جەوهەریی ئەو "پێشبینی و هزرینانە" دەفۆرمێنێ، کە "خۆیان پایاگایەکی (...) سەربەخۆیان نییە". [٥]

کەواتە مرۆڤ بەبێ زمان و کۆمەڵگا ناتوانێ مافی خاوەنداری بسەپێنێ. ئەم تێڕوانینەی ڕوسۆ دژی تێڕوانینەکەی هۆبس و لۆك دەوەستێتەوە، کە لە دۆخە سروشتییە هیپۆتێزییەکەیاندا مافی خاوەنداری دیاری دەکەن. هۆبس و لۆك لە بنەڕەتدا لەتەك سەرجەم فەیلەسوفانی پێش خۆیان و سەردەمانی جیاوازی خۆیاندا یەك لایەنی بنەمایی هاوبەشیان هەیە: "مێژوو" ناناسن، بەڵکو هەردووکیان دۆخێکی سروشتیی یەکایەتی دیاری دەکەن. لێهزرینی مێژوویی، ئەمەیش دەبێ دابین بکرێ، بۆ یەکەم جار لەتەك ڕوسۆدا سەر هەڵدەدات. ڕوسۆ هەر لەم بنەمایەوە ڕەخنە لە هۆبس و لۆك دەگرێ و گریمانە هەڵەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە.

گریمانە هەڵەکانی هۆبس و لۆك، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، دەگەڕێنەوە بۆ تێڕوانینی هەڵەیان سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ. هۆبس مرۆڤ ناو دەنێ "گورگی مرۆڤ"، کە وەك سروشتێکی دڕندە تەنها دوای دەنگی ڕەمەکە سروشتبەخشەکانی دەکەوێ و لە ناخیدا بەتایبەتی ڕەمەکی خۆهێشتنەوە و منخوازیی سەروەرن. هەروەها هۆبس و لۆك هەردووکیان هەر لە سەرەتاوە "ئەقڵ"، وەك یاسایەکی خوابەخش، دەدەنە پاڵ مرۆڤ. ڕوسۆ ڕەخنەییانە ڕوو دەکاتە هەردووکیان و دەبێژێ، ئەم مۆرکانە، کە هۆبس و لۆك داویاننەتە پاڵ مرۆڤی سروشت، هینی مرۆڤی نێو کۆمەڵگان. ئەمە ئەو هۆ سەرەکییە پێکدەهێنێ، کە بۆچی هەردووکیان لە لێکۆڵینەوەکانیاندا بەهەڵەداچوون: ئەمان باوەڕ دەکەن مرۆڤی دۆخی سروشتیان بۆ ژێر لێکۆڵینەوە هێنابێ، کەچی لێرەدا تەنها لە مرۆڤی نێو کۆمەڵگا کۆڵیونەتەوە.



هۆبس، لە ڕوانگەی ڕوسۆ، ئەو هەقیقەتەی نەبینیوە، کە پەیوەندییەکانی موڵکداری هۆی سەرەکیی جەنگی یەك دژ بە یەك بوون. لەبەر ئەوەی مرۆڤی دۆخی سروشت تەنیا و دابڕاو ژیاوە، هەروەها لەپاڵ ڕەمەکی خۆخۆشویستندا ڕەمەکی بەزەیی هەبووە، ئەوا هیچ هۆیەکی نەبووە بۆ ئەوەی لەتەك هاوجۆرەکەیدا بکەوێتە ناکۆکییەوە. هۆبس بەهۆی پەیوەستبوونییەوە بە کۆمەڵگای سەردەمەوە نەیتوانیوە ئەم ڕەمەکی بەزەییە لە لای مرۆڤ ببینێ. هۆبس مرۆڤی سروشتی هەر لە سەرەتاوە وەك گورگ داناوە، بەڵام ئەم مرۆڤە گورگە لە ڕاستیدا لەتەك چەسپاندنی خاوەنداریی تایبەتیدا سەری هەڵداوە.

مرۆڤان لە ڕوانگەی لۆك تەنها بۆ پاراستنی پەیوەندییەکانی خاوەنداری لە دۆخی سروشتەوە بۆ نێو دۆخی دەوڵەت یان ڕووەو کۆمەڵگای سیاسی دەپەڕێنەوە. ڕوسۆ دژی ئەم تێڕوانینەی لۆك دەبێژێ، کە خودی پەیوەندییەکانی خاوەنداری پاڵهێزێکیان بۆ تێکدانی سروشتی مرۆڤان پێکهێناوە، چونکە خۆویستییەکەیان بەڕێی ئەو پەیوەندییانەوە پەرەی سەندووە و لێرەشەوە بۆ نێو دۆخی جەنگ خزاون. زەوییەکان بەڕێی بۆخۆگریی بەردەوامی تاکان و پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتوانەوە کەم بوونەتەوە، بەڵام ئەوە تەماحی دەوڵەمەندەکان بووە، کە پاڵی پێوە ناون لەم کاتانە بەدواوە بەبێ ماف زەوی داگیر بکەن. ئەمە هەروەها هەژارە بێموڵکەکانی ناچار کردووە بکەونە تاڵانی. بەم شێوەیە دەوڵەمەند و هەژار لەم کاتانە بەدواوە بوون بە دیلی سۆزە بێجڵەوەکانیان.

ڕوسۆ پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك فێڵێکی دەوڵەمەندەکان لە هەژارە لەژمارەنەهاتووەکان دەبینێ. دەوڵەمەندەکان بەڕێی ئەو فێڵەوە توانیویانە نایەکسانی لە نێوان مرۆڤاندا بچەسپێنن. تیۆرییە سیاسییەکانی هۆبس و لۆك (هەروەها پوفندۆرف) لەم ڕوانگەیەی ڕوسۆوە لە خزمەتی ئەوەدان، کە ڕەوایەتی

بە نایەکسانیی سیاسی لە نێوان مرۆڤاندا بدەن. ڕوسۆ ڕەخنەکەی تیژتر دەکاتەوە: ئاوڕدانەوەی هۆبس و لۆك لە مرۆڤی سروشت ئامانجێکی هەبووە، کە بریتییە لە ڕزگارکردنی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگای سەردەم.

بێگومان مرۆڤدیدییەکانی هەر سێ فەیلەسوف هاوکات بەزەروورە ئەو تیۆرییە سیاسییانە دەهێنن، کە لە سەرەوە بەووردی نیشان دران. بەڵام بۆ پاڵ ئەم فاکتەرە خۆتێگەیشتنی فەلسەفییان پڕواتایە و دیاردهێنانی لێرەدا گرنگیی هەیە. هۆبس و لۆك دانەری سیستەمن، بەڵام ڕوسۆ ئەو "نووسەر"ە ناسیستەماتیکەیە (هەتا ڕادەیەك "کۆنترا سۆسیال"ی لێدەرچێ)، کە "دژبێژیی" بەرهەمەکەی ئەوی تەنیوە. ڕوسۆ مرۆڤی هەستە، هەروەها داهێنەرانە و بە ڕەوانبێژی دێتە دارشتن. بەڵام هۆبس کایەکانی فەلسەفە سووك و ئاسان بەم چەشنە دیاری دەکات: "ئەوەیان، کە لەتەك فیگورەکاندا خەریکە، ناوی ئەندازەیە؛ ئەوەیان، کە لەتەك بزووتندا خەریکە، ناوی فیزیکە؛ ئەوەیان، کە لەتەك مافی سروشتدا خەریکە، ناوی مۆرالە. هەموویان پێکەوە فەلسەفە پێك دەهێنن" [٦] مۆرال لە لای هۆبس ئەو مۆرکانەی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، کە پەیوەندییان بە پێکەوەژیانی مرۆڤان لە ئاشتی و ئاساییشدا هەیە، ئەم پێکەوەژیانەش تەنها لەنێو دەوڵەتێکی بەهێزدا دەشێ. هۆبس پێشبینی ناکات، کە مرۆڤ بتوانێ بەبێ زەبری شمشێری سۆڤەرێنێك پێکەوەژیانێکی بەرگەگیراو بەرێوە بەرێ، بۆیە سۆڤەرێن بەرەهایی لە دەرەوەی لەشە سیاسییەکەدا دادەنێ. ئەمە تاکە ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی هەڵپە ڕەمەکییەکانی مرۆڤ لە سنووڕێکدا ڕابگیرێن و منخوازەکان بۆ پێکەوەژیان ناچار بکرێن. بێگومان لێرەدا دەرفەتمان هەیە، ساغکردنەوەیەك سەبارەت بە هەقیقەتی سۆڤەرێن دابین بکەین، ئەمەیش لە بەراورد لەتەك تێگەشتی ڕوسۆدا، بێگومان هەروەها لۆکدا، پڕواتایە. ئەم دەسەڵاتە دەبێ پێشتر وەك قەوارەیەك هەبێ، بۆ ئەوەی مرۆڤانی دۆخی جەنگ



دەسەڵاتەکەی نەك تەنها وەربگرن، بەڵکو وەك قەوارەی دەسەڵات گەورەتری بکەن. تەنها بەم شێوەیە بۆ ئەو وەك سۆڤەرێن دەلوێ، کە سەرجەم شەرەف و کەرامەت، سەرجەم ویست و دەسەڵات لەنێو دەسەڵاتی خۆیدا یەك بخات، پاشان لێرەوە جڵەوی گورگی مرۆڤ بگرێ یان بە سزادان جەنگی نێوخۆی تاکان کپ بکات.

جۆن لۆك بە پێچەوانەوە لە ئەنترۆپۆلۆژییەکەیەوە بە سەرەنجامێکی تەواو جیاواز دەگات. لەبەر ئەوەی هۆی جەنگی نێو مرۆڤان دەرەکییە، واتا بۆ "پارە" دەگەڕێتەوە، ئەوا ئەو خاوەنئەقڵانە دەتوانن بە چارەسەرێکی گونجاو بگەن و کۆتایی بە دۆخی جەنگ بهێنن. مرۆڤی سروشت وەك بەندەی خوایەکی سۆڤەرێن لە سروشتییەوە چاکە، بەڵام ئابووریی پارە هەمیشە پتر ڕەمەکی موڵکخوازیی ئەو بێدار دەکاتەوە و لێرەشەوە دۆخی سروشت بۆ دۆخی جەنگ وەردەگۆڕێ. بەڵام مرۆڤان بۆ پاراستنی موڵکەکانیان و خۆڕزگارکردن لە نەگبەتییەکانی دۆخی جەنگ ناچار دەبن لەشێکی سیاسی دابمەزرێنن و هاوکات سۆڤەرێنێك وەك هێزی یاسادانەر دیاری بکەن. لۆك دەسەڵاتی سۆڤەرێن وەك هۆبس لە دەرەوەی لەشە سیاسییەکەدا دانانێ، بەڵکو دەی هێنێتە نێوەندی لەشە سیاسییەکەوە. سۆڤەرێن تەنها دەسەڵاتی یاسادانەرە و لە کۆمەڵێکی پسپۆر پێکدێ، بەڵام هاوکات خۆیشی لەژێر ڕکێفی یاساکاندایە. دەوڵەمەندەکان، بە واتایەکی دی نوینەرانی خاوەنداریی تایبەتی، ئەو کۆمەڵە پسپۆرە ڕادەسپێرن، بۆ ئەوەی وەك هێزی یاسادانەر ڕەوایەتی بە پەیوەندییە هەبووەکان بدات و هاوکات بەرێی دادگاکانییەوە دەروازەی سکاڵا بۆ هەموو هاووڵاتییەك ئاوەڵا بکات. ئەمە تاکە ڕێگەیەکە بۆ پاراستنی مافی خاوەنداری و لێرەشەوە چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایش لەنێو کۆمەڵگادا.

ڕوسۆ بە پێچەوانەی هۆبس و لۆك پێشبینی دەكات، مرۆڤانی پەیمانبەستوو بتوانن، خۆیان وەك قەوارە، دەسەڵاتی سۆڤەرێن پێك بهێنن. لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە دا، كە ئەوەی ڕوسۆ لە نوێنەرانی كلاسیكیی مافی سروشت جیا دەكاتەوە، برێتییە لە "مێژوویەتیی هزر"ی ئەو. مرۆڤی سروشت، كە لە سەرچاوەوە چاك و بۆخۆبەسە، هەروەها لەپاڵ ڕەمەكی خۆخۆشویستندا ڕەمەكی بەزەیی هەیە و لێوەی سەرجەم ڕەوشتەكانی هەڵدەقوڵێن، بە كورتی ئەم مرۆڤە تەنانەت لە ڕەوتی بەكۆمەڵایەتیبووندا بۆگەن دەكات، بەڵام ڕوسۆ شیمانەیەك بۆ چاكبوونەوەی دەبینێ. مەرجی ئەم چاكبوونەوەیەی مرۆڤی خۆنامۆبوو برێتییە لە لێگیتیماسیۆن (ڕوایەتیدان)ی دەسەڵات و سەروەربوونی یاسا، بەڵام بە چەشنێك، كە دەبێ جێگەی مرۆڤ لە دیاریكردنی پێكەوەژیانی نێومرۆڤیدا بگرێتەوە. ڕوسۆ هاوكات لەم گۆڕانەدا شیمانەی ئاوەڵابوونی مرۆڤ دەبینێ، ئەم ئاوەڵابوونەش بۆ ئەو واتای سەرهەڵدانی "هاووڵاتی" دەگەیەنێ، كە لە ناخی هەر ئەندامێكی لەتەك هەمووان پەیمانبەستوودا شكۆفە دەكات. سەرهەڵدانی هاووڵاتی لە مرۆڤەوە بەرهەمی ویستی گشتییە نەك بەرهەمی سەروەرێكی سۆڤەرێن یان پارتێكی سیاسی بێ. كۆمەڵگایەكی سیاسی، كە لەژێر ڕكێفی سەروەرێكدا بێ، وەك لای هۆبس، بۆ ڕوسۆ "كۆمەڵگا" نییە، بەڵكو تەنها "كۆكراوەیەكە"، كە لە سەروەرێك و كۆیلەی لەژمارەنەهاتوو پێكدێ. كۆمەڵگای سیاسی لە ڕوانگەی ئەو كاتێك هەیە، گەر ئەندامەكانی بە ویستی ئازادی خۆیان یەك بگرن و لەشێكی سیاسی دروست بكەن. بەڵام هەر ئەوەندەی ئەم كۆمەڵگا خۆویستووە گفتی هۆشرایەڵی بە سەروەرێك یان دامەزراوێك بدات، ئیتر مۆركەكەی خۆی وەك كۆمەڵگا دەدۆڕێنێ و هەڵدەوەشێتەوە. كەواتە ئێمە لێرەدا وەك لای لۆك دوو چینی جیاوازمان بە پلەی جیاوازی ئەقڵەوە نییە، بەڵكو "گەل"ێك، یان "كۆمەڵگا"یەك، كە هەر یەكە لە ئەندامانی كەمێك موڵكی هەیە



و هیچ ئەندامێك فرە موڵكی نییە. بەڵام ئەم كێشەیە بۆ ڕوسۆ كەمتر لەو هەقیقەتە بایەخدارە، كە مرۆڤ مرۆڤی دی بە كۆیلەی خۆی بكات. بۆیە كۆمارەكەی ڕوسۆ تەنها نێوەندی پێكەوەژیان و چەسپاندنی بەختیاری نییە، بەڵكو هاوكات پاڵنەرێكە ڕووەو كۆتاییهێنان بە "نامۆبوونی مرۆڤ" و گێڕانەوەی بۆ نزیكیی لە سروشت، واتا نزیكی لە خودی خۆی.

## بەشی شەشەم:
## ڕوسۆ و شۆڕشی فەڕەنسی

گەر لە ڕۆڵی تیۆرییە سیاسییەکەی ڕوسۆ لەنێو گۆڕانەکانی ڕوودانگەدا بڕوانین، ئەوا دەبینین، کە ئیدێکانی ئەو، بەتایبەتی ئیدێی کۆمار و سۆڤەرێنێتیی گەل، بریێتی بوون لەو نموونە پێشهبووانە، کە لەپاڵ ئیدێکانی دیکەی فەیلەسوفانی تیۆریی دەوڵەتدا، کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لەنێو ڕودانگەی سیاسیدا نواند. کەواتە ڕوسۆ تاکە فەیلەسوفێکی تیۆریی سیاسی نەبوو، کە کاریگەریی لەسەر شۆڕشگێڕانی فەڕەنسا هەبوو. فولتێر و مۆنتێسکیو، کە سەر بە نەوەی کۆنی نوینەرانی "کۆمەلگای هاوولاتی" بوون، هەروەها، لەنێو نەوەی نوێی ڕۆشنگەرانی فەڕەنسیدا، دەرکەرانی "ئەنسیکلۆپێدی"، دیدەرۆ و



دالۆمبێرت، ڕۆڵێکی بەرچاویان نواند. ئەمانە کەسانێك بوون، کە بە ئاشکرا دژی ڕێکخراوی فیۆدالی کۆمەلگا و دەسەلاتی ئایینییەکان وەستابوونەوە.

فەڕەنسای پێش شۆڕش دەسەلاتدارییەکی ڕەهاگەرایی هەبوو، واتا دەسەلاتداریی ڕەها لە دەستی پاشادا بوو و ژێردەستەکان مافیان نەبوو لە دەسەلاتداریدا بەشداریی بکەن. هاوکات کۆمەلگای فەڕەنسی بەسەر سێ ستاندی جیاوازدا بەش کرابوو: ستاندی یەکەم تایبەتمەند بوو بە پیاوانی ئایین، ستاندی دووەم هینی بەگزادەکان بوو، ستاندی سێیەم لە گەل پێکهاتبوو. ستاندی یەکەم و دووەم لە هەموو شێوەیەکی باجدان ئازاد کرابوون، جگە لەمە تەنها ستاندی دووەم مافی هەبوو بۆ ئەوەی پایەگا ئەفسەرییەکانی نێو سوپا وەربگرێ. بەلام ستاندی سێیەم، کە نەوەدوهەشت دەر سەدی دانیشتوانی فەڕەنسای پێکدەهێنا، بەسەر شانییەوە سەرجەم باری باجدانی هەلگرتبوو. بێگومان ئەم ستاندە تەنها لە جوتیاران و پیشەگەران و کرێکارانی ڕۆژانە پێکنەهاتبوو، بەڵکو هاوکات لەو کەسانەش، کە خاوندار یان فابریکەدار بوون، بەلام بەهۆی ڕەچەڵەکییانەوە هەرگیز هەمان پایەگا و ڕێزی کۆمەلایەتیی بەگزادەکانیان پێ نەدەدرا.

لەم ڕوانگەیەوە دەبێ بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڕەنسی چەند فاکتەرێك ڕەچاو بکەین: نەك تەنها ئیفلاسی دەوڵەت و دێکادێنسی بەگزادەیی، هەروەها ستاندگەرایی و تەنینەوەی هەژاری، پاڵهێزی شۆڕش بوون، بەڵکو هاوکات بزووتنەوەی ڕۆشنگەری لە فەڕەنسا بریێتی بوو لە زەمینەی هزریی شۆڕش. ڕەخنەی قووڵمەغزای هزرمەندان لە بەدگەرییەکانی دەسەلاتداران، ئاسانکردنەوەی زۆر بنەمای فەلسەفی و ڕاگەیاندنیان وەك دروشمی سیاسی، بناغەکانی کۆمەڵگای فیۆدالییان لەرزۆك کرد. ڤۆلتێر دەنگی هەڵدەبڕی: "بینای کۆنی گەندەڵی بڕمێنن!"، "پیاوانی بەدڕەفتاری ئایینی بپلیشێننەوە!". ڤۆلتێر هاوکات داوای

لێبـــووردوویی، ئـــازادیی وشـــە و ڕۆژنامـــەی دەکـــرد. مۆنتێـــسکیو ئـــەو ڕوانگەیەی هەبوو، کە پێویستە دەسەڵاتداری بەسەر دەسەڵاتی یاسادانەر، دەسەڵاتی دادگـایی و بەجێگەیەنـەردا سـێبەش بکـرێ. هـەروەها گەرچـی "ئەنسیکلۆپێدی" لە بنەڕەتدا واتای "کۆکردنەوەی زانستەکان" دەگەیەنێ، بـەڵام ئیـدێکانی نێـو "ئەنـسیکلۆپێدی" لەمـە تێپـەڕیان دەکـرد، چـونکە کارەکتـــەرێکی خـــەباتگێڕییان لـــە دژی پێـــشبڕیار، لـــە دژی بۆچـــوون و ڕێکخراوی فیوّدالیی کۆمـەڵگا وەرگرتبوو. مرۆڤ گەرەك بوو تەنها پشت بە ئـەقڵ و هـزرە خۆییـەکانی ببەسـتێ، هـەروەها ڕۆشـنگەران داوای مـافی خۆچـارەنووس و ئـازادیی کەسـییان دەکـرد. ڕوسـۆ دەی گـوت: "مـرۆڤ بەئازادی دێتە جیهانەوە، بەڵام لە هەموو لایەك لە زنجیر نراوە".

لە فەڕەنسای پێش شۆڕشدا بەتایبەتی سەپاندی باج بەسەر گەلدا لە حەوسەڵەی زۆرینەی دانیشتواندا نەمابوو. باج، هەروەها نوێنەرایەتیکردنی (ڕێپرەزەنتاسیۆنی) گەل، لە ڕوانگەی ڕوسۆ برێتی بوون لە دوو بەڵا، کە تووشی دەوڵەت هاتبوون. هەردووکیان بە بڕوای ئەو بەڵا بوون، چونکە دەبوون بە هۆی تێکشکاندنی "یەکسانی" و هەستی "برایەتی". یەکەم باج هۆیەك بوو بۆ ئەوەی کە "یەکسانی" لە نێوان هاووڵاتیاندا نەمێنێ، چونکە دەوڵەت باجی جیاوازی لە گەل دەسەند، تاکو موچەی سوپا و نوێنەرانی گەل لە پەرلەماندا دابین بکات، هەر بەم ڕێیەشەوە نایەکسانیی لەنێو گەلدا دەهێنایە ئاراوە. دووەم نوێنەرایەتیکردن، لە ڕوانگەی ئەو، بەربەست بوو لە بەردەم گەلدا، چونکە بەم ڕێیەوە هەموو شیمانەیەك لە گەل سەندرابۆوە بۆ ئەوەی بتوانێ "فرمانە گشتییەکانی" خۆی بەجێبگەیەنێ. لەبەر ئەم هۆیە نوێنەرایەتیکردن پاڵهێزێك بوو بۆ نەهێشتنی "برایەتی". ئێمە ئەم سێ



تێگەیشتەی ئازادی و یەکسانی و برایەتی درەنگتر وەك دروشمی شۆڕشی فەڕەنسی دەبینینەوە.

بێگومان ڕوسۆ، لەپاڵ ئەوەدا کە نوێنەرێکی مافەکانی مرۆڤ بوو، هاوکات داوای مافی دەنگدانی بۆ گەلی سادە دەکرد. لە ڕوانگەی ئەو تەنها کاتێك ڕەوایەتی بە دەوڵەت دەدرێ، گەر دەوڵەت وەك پەیمانی مرۆڤان لە پێناوی پاراستنی ئازادییە کەسییەکاندا دابمەزرێ. تەنها گەلی سۆڤەرێن، کە لە هاووڵاتییانی یەکسان پێکدێ، سەرچاوەی دەسەڵاتە. ئەمە ڕاستەوخۆ هەڵوێستێکی دژبەر بوو بەرانبەر دەسەڵاتداریی شانشینیی. ڕوسۆ ئەو ئیدێیەی هێنایە نێوانەوە، کە بەو پێیە پێویستە هەڵگرانی ویستی گشتی ئەو جێیە بگرنەوە، کە پێشتر بۆ پاشا تەرخان کرابوو.

داواکارییەکی دیکەی ڕوسۆ ئەوەیە، کە کێ هۆشرایەڵی ویستی گشتی نەبێ، دەبێ لە لایەن هەمووانەوە بۆ ئەو هۆشرایەڵییە ناچار بکرێ. مرۆڤ بەڕێی پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە تەنها ئازادییە کەسییەکەی دەدۆڕێنێ، بەڵام دوای ئەوە لەنێو پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بە ئازادیی هاووڵاتێتی شاد دەبێ. ئیدێی سۆڤەرێنێتیی گەل و ویستی گشتی، هەروەها ئیدیالی پەیمانی کۆمەڵایەتی، کە بەڕێیەوە هەر هاووڵاتییەك کەسی خۆی و موڵکەکەی دەپارێزێ، لەو نموونە پێشدانراوانەن، کە پاشان لە شۆڕشدا لە لای ڕۆبسپیا و سان ژەست بە لوتکەی کاریگەرییان دەگەن.

ساڵی ١٧٩٣ دەستوورێکی دیموکراتی بۆ فەڕەنسا دادەنرێ، بەڵام ئەو دەستوورە بەهۆی ئەو جەنگەوە، کە شانشینەکانی ئەوروپا لە دژی فەڕەنسا ڕایدەگەیەنن، ناخرێتە گەڕ، بە پێچەوانەوە گۆڕانەکە بەهۆی دۆخی جەنگەوە ڕووەو "دەسەڵاتی تێرۆر"ی یاکۆبییەکان ئاڕاستە دەگرێ. سەرەتا گرنگترین ڕیفۆرمی یاکۆبییەکانی ڕۆبسپیا و سان ژەست، دوای پاکتاوی پارتەکانی دیکە، برێتی دەبێ

له ڕاگەیاندنی "باڵاترین سروشت و نەمریی دەروون"، کە بنەماکەی داییزمی ڕوسۆیە و ئەم داییزمە لە دژبەرییەکی ئاشکرادایە لەتەك ئایینی دیانیدا (بڕوانە "پاشکۆ"، ئیمیل، بەشی چوارەم). لەم ڕوانگەیەوە داوا دەکرێ، کە کۆمەڵگا گەرەکە لەسەر بناغەی "ڕەوشت" دابمەزرێ (کە تێگەیشتێکی کرۆکیی پەیمانە کۆمەڵایەتییەکەی ڕوسۆیە)، نەمریی دەروونیش واتای "داواکارییەکی مۆراڵی" دەگەیەنێ و لێوەی زەرووڕەی باڵاترین سروشت سەر هەڵدەدات.

ڕۆبسپیا، کە سەرەتا لەنێو سەرجەم داواکارییە دیموکراتییەکاندا دەنگ هەڵدەبڕێ، لە ڕەوتی شۆڕشدا گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا دێ، کە هەمیشە پتر جیاوازی لە نێوان "سیتۆیا" (هاووڵاتی) و "بۆرژوا"دا بکات، جیاوازییەك، کە ئیدێکەی بۆ ڕوسۆ دەگەڕێتەوە. ستۆیاکان ئەو کەسانە بوون، کە زوو ڕەزامەند دەبوون و داوای سامانی زۆریان نەدەکرد، هەروەها ژیانیان مسۆگەر بوو و کاریان بە کەسانی دیکە دەدا. ڕۆبسپیا هاوکات وا باوەڕ دەکات، کە خاوەنداری مافێکی دەرنەدراوی مرۆڤە، بەڵام هاوکات دەبێژێ، کە نابێ مافی خاوەنداریی هێندە بڕ بکات، کە ببێ بەهۆی زیانی کەسانی دیکە (١). کەواتە ڕۆبسپیا کۆمەڵگایەك دەخوازێ، کە نابێ هیچ کەس هەژار و هیچ کەس فرە موڵکی هەبێ. ئەمە بێگومان ئیدیالی ڕوسۆ بوو، هەر لەم ئیدیالەشەوە جیاوازیی لە نێوان "سیتۆیا" و "بۆرژوا"دا دەکرد، واتا ئەو بۆرژوایەی، کە بە پێچەوانەی هاووڵاتییانی نیشتمانپەروەر و گەلخواز تەنها دوای بەرژەوەندییە کەسییەکانی خۆی دەکەوێ.

بێگومان پرسیارێکی کرۆکی لێرەدا ئەوەیە، کە هەتا چەند ڕوسۆ، هەروەها فەیلەسوفانی دیکەی ڕۆشنگەر، گەرەکی بەرپرسیارکردنن بۆ ڕەوتی گۆڕانەکانی ڕودانگە. وەك لە سەرەوە بینیمان، ڕوسۆ خۆی لە بنەڕەتدا ئاوها باوەڕی دەکرد، کە شۆڕشی خوێناوی پێی ناکرێ ئەو گەلە بۆگەنکردووانە ڕزگار بکات و چاك بکاتەوە، کە خاوەنی هەر فۆرمێکی دەسەڵاتداری بوو بن یان لە دامەزراندنی



سیڤیلیزاسیۆندا بەشدارییان کردبێ. هەر پەیوەست بەم کێشەیەوە ئەو خۆی لە نامەیەکدا بۆ خانمی ڤارتنسلێبن دەنووسێ، کە "ئازادیی سەرجەم مرۆڤایەتی هەرگیز ڕەوایەتی بەوە نادات، کە خوێنی یەك تاکە مرۆڤ بڕێژرێ (٢). ئەو هاوکات هیوادار بوو، بە گەف و ڕەخنەکانی بتوانێ بێدارییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای سەردەم بهێنێتە ئاراوە، کە ئیتر ڕێگە لە ڕاپەڕینێکی خوێناوی بگیرێ. هەر پەیوەست بەمەوە لە "ئێمیل"دا دەنووسێ: "بەڵام ئێوە پشت بە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی دەبەستن، بەبێ ئەوەی بزانن ئەو ڕێکخراوە بەناچاری ڕووبەڕووی شۆڕش دەبێتەوە و نایهێڵێ. پاشان منداڵەکانتان دەکەونە نێو ڕێکخراوێکەوە، کە هەرگیز نەتان بینیوە و ناشتوانن ڕێ لە هاتنی بگرن (...). ئێمە لە تەنگژە و سەردەمی شۆڕش نزیك دەکەوینەوە! بە بڕوای من مەحاڵە شانشینە مەزنەکانی ئەوروپا بتوانن درێژە بە تەمەنیان بدەن" (بڕوانە "پاشکۆ"، ئێمیل، بەشی سێیەم).

کەواتە لەکوێدا ڕەگی کاریگەرییەکەی ڕوسۆ لەسەر گۆڕانە شۆڕشگێڕییەکان خۆی دەبینێتەوە؟ ڕوسۆ لە لایەك بەجەختی داوای ئەوە دەکات، کە گەرەکە مرۆڤ لەنێو چۆنبوونی خۆیدا وەربگیرێ، چونکە تەنها لەسەر ئەم شێوەیە شیمانەی سەرهەڵدانی پەیمانی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. بەڵام ئەو لە لایەکی دیکەوە تێڕوانینێکی بنەمایی سەبارەت بەوە هەیە، کە "سروشتی مرۆڤ شیاوی گۆڕینە" و ئەوەیش ئەرکی لێجیسلاتوێرە، کە هاووڵاتییانی پەیمانبەستوو بە یاریدەی پەروەردە ڕووەو سروشتێتی خودی خۆیان بگەڕێنێتەوە. کەواتە ئەرکی لێجیسلاتوێر ئەوەیە، کە جەوهەری مرۆڤ هەڵبگێڕێتەوە، تاکو چیدی خۆی بە سەرجەمێك نەزانێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە خۆی بە کەرتی سەرجەمێکی گەورەتر بزانێ و هەر لەنێو ئەم سەرجەمەشدا هەست بکات و هەڵوێست بنوێنێ. بەڵام ئەم لایەنەی هزری ڕوسۆ، واتا شیمانەی گۆڕینی سروشتی مرۆڤ،

له كرۆكیدا توانستی بزوێنەرانەی شۆڕشگێڕیی هەڵدەگرێ. هەردوو بنەماكە، واتا وەرگرتنی مرۆڤ لەنێو چۆنبوونی خۆیدا لە لایەك، هەروەها داواكاریی بۆ گۆڕینی سروشتی مرۆڤ لە لایەكی دی، بریتین لە دژبێژییەكی بناغەیی لەنێو "پەیمانی كۆمەڵایەتی"دا، كە دەرفەت بۆ ڕاڤەی جیاواز دەڕەخسێنێ، بەبێ ئەوەی ئێمە بتوانین ڕوسۆ بۆ ئەو ڕاڤانە بەرپرسیار بكەین. ئیدێكان دەرفەت بە ڕاڤەی هەمەلایەنی و جیاواز دەدەن، ئینجا ئەوانە كەسانی كردارنوێنی نێو جیهانی مێژوویین، كە ئەو ڕاڤانە پەیوەست بە مەبەستە سیاسییەكانی خۆیانەوە ئەنجام دەدەن.

# ئێمیل

## یان

## دەربارەی پەروەردە

(کورتکراوەتەوە)

١

هەموو شتێك بەچاكی لەنێو سروشتدا پێدەگات، بەڵام هەموو شتێك لەژێر دەستی مرۆڤدا بەدجۆر دەبێ. مرۆڤ شتەكان وەردەگۆڕێ، چونكە ڕێزی مەزنی و بەدجۆری دەگرێ. هیچی لەو شێوەیەدا ناوێ، كە سروشت دروستی كردووە، تەنانەت مرۆڤیشی وەك خۆی ناوێ.

ڕووەك بەڕێی كولتووروەوە ڕێك دەخرێ، مرۆڤ بەڕێی پەروەردەوە؛ ئەم كارە لە خۆیدا نالەبارە، بەڵام نالەبارتر ئەوە دەبوو، گەر پەروەردە ڕووی نەدایە. ئێمە بەلاوازی دێینە جیهانەوە و پێویستیمان بە هێز هەیە، ئێمە بەڕووتی دەزایێنرێین و پێویستیمان بە لالێكردنەوەی كەسانی دیكە هەیە، ئێمە بەبێ ئەقڵ دێینە نێو لێرەبوون و پێویستیمان بە ئەقڵ هەیە. ئەوەی لەكاتی هاتنماندا بۆ نێو جیهان نیمانە و پێویستیمان پێیەتی، بەڕێی پەروەردەوە پێمان دەدرێ.

هەموو یەكێك لە ئێمە سێ مامۆستای هەیە. گۆڕانی توانست و ئۆرگانەكانمان برێتییە لە پەروەردەی سروشت. فێربوونی بەكارهێنانی ئەم گۆڕانە برێتییە لە پەروەردەی مرۆڤ. پەرەسەندنی ئەزموونمان بەسەر ئەو بابەتانەدا، كە كارمان تێدەكەن، برێتییە لە پەروەردەی شت. پەروەردەی سروشت سەربەخۆیە لە ئێمە، ئەم سەربەخۆییە هەتا ڕادەیەك پەروەردەی



شتەكانیش دەگرێتەوە. ئێمە بەڵام بەڕاستی توانامان بەسەر پەروەردەی مرۆڤدا دەشكێتەوە – بێگومان لە دۆخێكی ئیدیالدا.

ئامانجی پەروەردە برێتییە لە ئامانجی سروشت. بۆ پەروەردەیەكی كامڵ پێكەوەگەریی هەر سێ شێوازەكە پێویستە. بۆیە ئەو شێوازەی ئێمە توانامان بەسەریدا ناشكێتەوە، دەبێ دیاریكەری ئاڕاستەی دوو شێوازەكەی دی بێ.

سروشت بەواتای ڕاهێنان. پەروەردە ڕاهێنانە و لێرەدا هەموو شتێك ئاڕاستەی توانستە سەرچاوەییەكانی مرۆڤ دەكرێ. بەڵام ئەم هەوڵە كاتێك دەشێ، گەر سێ شێوازەكەی پەروەردە لە یەكتری جودا بن. چونكە پەروەردكار منداڵ بۆ كەسانی دی پێناگەیەنێ، بەڵكو تەنها بۆ خودی خۆی وەك مرۆڤ پێی دەگەیەنێ.

مرۆڤی سروشت سەرجەمێكە بۆ خۆی، برێتییە لە یەكی ژمارەیی نەشكاو و تەنها پەیوەندیی لەتەك خۆی یان لەتەك تاكی مرۆڤدا هەیە. مرۆڤی كۆمەڵگا تەنها كەرتێكە، كە نرخەكەی بە ژێرەوە بەندە و ئەو نرخەی پەیوەند بە سەرجەمەوە، واتا بە قەوارەی كۆمەڵایەتییەوە، دیاری دەكرێ. بەڵام دامەزراوی كۆمەڵایەتیی چاك ئەوەیە، كە هەتا بۆی بكرێ سروشتێتی لە مرۆڤ بكاتەوە، لێرەبوونی بۆ خۆی لێ بسێنێ، كە ئیتر ئەو تاكە چیدی خۆی بە سەرجەمێك نەزانێ، بەڵكو خۆی بە كەرتی یەكێتییەكی كۆمەڵایەتی بزانێ و تەنها لەنێو ئەم سەرجەمە نوێیەدا هەست بكات.

ئەو مرۆڤەی دەیەوێ لە كۆمەڵگای هاووڵاتیدا هەستە سروشتییەكانی خۆی بپارێزێ، نازانێ چیی دەوێ، هەمیشە لە نەسازییەك لەتەك خۆیدا دەژی و لە نێوان ئەرك و مەیلەكانیدا دەبزوێ، كە ئیتر نە مرۆڤ و نە هاووڵاتی دەبێ، نە دەتوانێ بۆ خۆی و نە بۆ كەسانی دی ببێ.

منداڵ سەرەتا كۆرپەی سروشتە. پەروەردكار تەنها دوای ڕێنوماكانی ئەم مامۆستا سەرچاوەییە دەكەوێ و ناهێڵێ كاریگەرییەكەی تێك بدرێ. مرۆڤان

لەنێو ڕێکخراوی سروشتدا یەکسانن بە یەك، ئەرکە هاوبەشەکەیان بریتییە لە مرۆڤێتی. بەڵام لە کۆمەڵگای هاووڵاتیدا، کە جێگە و پایەگاکان دابەش کراون، دەبێ هەموو منداڵێك تەنها بۆ خۆی پەروەردە بکرێ. گەر ئەم مەبەستە بەچاکی بەدی بهێنرێ، ئەوسا منداڵ پایەگا کۆمەڵایەتییەکەی بەچاکی دەنوێنێ.

ژیان هونەرێکی مەزنە و مرۆڤ دەبێ فێری ببێ. بەڵام ژیان واتای هەناسەدان نابەخشێ. ژیان بەواتای هەڵوێستوەرگرتن، ئەمەیش بەواتای سوودوەرگرتن لە ئۆرگانەکانمان، لە زێنز و توانستەکانمان، کە هەموو پێکەوە هەستی لێرەبوونمان پێدەبەخشن. ئەو مرۆڤە نەژیاوە، کە زۆرترین ساڵ بەسەر دەبات، بەڵکو ئەو مرۆڤە ژیاوە، کە بە قووڵترین شێوە هەستی بە ژیان کردووە.

گریمان منداڵێك بە هێز و قەوارەی گەنجێکەوە دێتە نێو ژیانەوە. ئەم مرۆڤەمنداڵە گەوجێکی ڕاستەقینە دەبێ. بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤ لاواز و بێتوانا دێتە جیهانەوە، ئەوا دەنگە سەرەتاییەکانی بریتین لە نووزە و گریان. منداڵ هەست بە پێداویستییەکانی دەکات و بۆی ساتار ناکرێن. بۆیە بەگریان بۆ یارمەتی دەپاڕێتەوە. گەر برسیی بوو یان تینوو، دەگری؛ گەر سەرمای بوو یان گەرما، دەگری؛ گەر ویستی بنوێ و سەغڵەت بکرێ، دەگری؛ گەر ویستی بجووڵێ و ببەسترێتەوە، دەگری. منداڵ تەنها یەك شێوازی ئاخافتن دەزانێ، چونکە تەنها یەك جۆر هەستی ناڕەحەتیی هەیە. ئەو هێشتا نازانێ جیاوازی لە نێوان ئەو شتانەدا بکات، کە کاریگەریی لەسەر ئۆرگانە زێنزییەکانی دەنوێنن. بۆیە ئەو بۆ هەموو ناڕەحەتییەك یەك هەستی هەیە: ئازار. لەم فرمێسکانەوە، کە زۆر کەم ڕەچاو دەکرێن، یەکەم پەیوەندیی مرۆڤ لەتەك شوێنەواردا چەکەرە دەکات، لەم تەمەنەدا یەکەم ئەڵقەی زنجیرێکی چڕ جۆش دەدرێ و لێوەی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی دادەمەزرێنرێ.



یەکەم فرمێسکەکانی منداڵ بریتین لە تکا. گەر گرنگییان پێ نەدرێ، دەبن بە فەرمان. منداڵ سەرەتا تکای یارمەتی دەکات، پاشان دەی کات بە مەرج. بەم شێوەیە لە لاوازییەکەیەوە، کە لە لای ئەو هەستی بەندبوون چێ دەکات، هزری دەسەڵات و فەرمان سەر هەڵدەدات. بەڵام ئەو هزرە بە هۆی پێداویستییەکانی منداڵەوە دروست نەبووە، بەڵکو بەهۆی هەڵوێستی ئێمەوە، بۆیە کاریگەرییەکی دەروونیی لەسەر ئەو دەبێ و هۆکەی لەنێو سروشتدا نییە. ئەرکی پەروەردکار بریتییە لە دۆزینەوەی واتا نهێنییەکانی دواکاریی منداڵ بەزوویی، پێویستە ڕایبهێنێ، کە نە فەرمان بەسەر مرۆڤ و نە بەسەر شتەکاندا بدات، چونکە ئەمان لە فەرمانەکەی تێناگەن.

٢

ئێستا دەگەین بە دووەم بەردی بناغەی ژیان. دوای ئەوەی منداڵ فێر دەبێ، خۆی بە وشە دەربڕێ، کەمتر دەگری. ئەم گۆڕانە بەرەنجامێکی سروشتییە: زمانی دووەم جێگەی زمانی یەکەم دەگرێتەوە. چونکە دەبێ لەبەر چ هۆیەك منداڵ ئازارەکانی خۆی بە گریان دەربڕێ، گەر بتوانێ بە وشە بدوێ؟ یان ئەوەتا ئازارەکەی هێندە بەتینە، کە بە وشە دەرنابڕرێ. گەر ئێمیل پێی گوتم ئازاری هەیە، یەکسەر دەزانم ئازارەکەی بەتینە.

دەبێ ئەم شێوازە بەربەرییەی پەروەردەی ئەمرۆ بە چی دابنرێ، کە ئامادەی ئایندەیەکی دوور بە قوربانی دەکات و منداڵ بە زنجیر دەبەستێتەوە، تاکو بەختیارییەکی نەبینراوی بۆ مسۆگەر بکات، بەختیارییەك کە دەشێ هەرگیز پێی شاد نەبێ! بەم شێوەیە ئەم تەمەنەی شادمانی لەژێر فرمێسك و بەخێوکردن، لەژێر هەڕەشە و کۆیلەتیدا بەسەر دەبات. منداڵی بێچارە ئازار

دەدرێ و دەڵێن ئەمە گوایە بۆ خۆشیی ئەوە. ئەی مرۆڤ! مرۆڤ بە! ئەمە یەکەم فرمانی تۆیە! منداڵت خۆشبوێ! ڕێ بە یارییەکانی بدە، یارمەتیی ئاوەڵابوونی شادمانی و ڕەمەکەکانی بدە! کێ هەیە هەندێك جار تاسەی گەڕانەوەی بۆ ئەم تەمەنە نەکردبێ، کە تێیدا لێوی منداڵ تەنها بزە و دەروونی تەنها شادی دەناسێ؟

مرۆڤ! ژیانت لەنێو منتدا بژێنە و هەرگیز بێبەخت نابێت؛ لەنێو ئەو سنوورەدا بمێنەرەوە، کە سروشت لە ڕیزی جۆرەکاندا بۆی داناویت؛ دژی یاسای زەرووره مەوەستە و هێزت بەفیڕۆ مەدە. ئاسمان ئەو هێزەی پێبەخشیویت هەتا درێژە بە تەمەنت بدەیت و لێرەبوونت بپارێزیت. بێگومان بە، کە ئازادی و دەسەڵاتت لە سنووری هێزە سروشتییەکانت تێناپەڕن. هەموو هەوڵێکی دی برێتییە لە کۆیلەتی و چەواشەکردن. تەنانەت توانای فەرماندان کۆیلەتییە، گەر هاتوو بە ڕای گشتییەوە بەند بوو. چونکە تۆ ئەو کاتە بە نرخاندنی ئەو کەسانەوە بەندیت، کە تۆ بەهۆی تێڕوانینەکانتەوە دەسەڵاتیان بەسەردا دەنوێنیت. هەر ئەوەندەی هەڵوێستی خۆیان گۆڕی، تۆیش ناچار دەبیت هەڵوێستت بگۆڕیت.

ئەم تێڕوانینە گرنگە و هەوڵێکە بۆ چارەسەری نەسازییەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی. ئێمە دوو شێوەی بەندبوون بەدی دەکەین: یەکەمیان برێتییە لە بەندبوون بە شتە بێگیانەکانەوە و سروشتییە، بەڵام دووەمیان برێتییە لە بەندبوون بە مرۆڤەوە و کۆمەڵایەتییە. لەبەر ئەوەی یەکەم شێوەی بەندبوون هیچ پەیوەندییەکی بە مۆرالەوە نییە، ئەوا کار ناکاتە سەر ئازادیی مرۆڤ و مایەی گرفت نییە. بەڵام شێوەی دووەم پەیوەندیی بە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و هۆی سەرجەم گرفتەکانی مرۆڤە، ئەمەیش بە چەشنێك، کە ئیتر سەروەر و کۆیلە یەکتری بۆگەن دەکەن. چاکترین دەسوێژ بۆ



نەهێشتنی چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و چاککردنەوەی کۆمەڵ ئەوەیە، کە یاسا جێگەی مرۆڤ بگرێتەوە و ویستی گشتی بەدی بهێنرێ، کە ئیتر هەموو ویستێکی تایبەتی لە هێزە زیادەکانی ڕووت بکرێتەوە. گەر یاساکانی گەلان بە هەمان شێوەی یاساکانی سروشت شیاوی شکاندنەوە نەبن، واتا وەك ئەو یاسایانەی کە هەرگیز لە هێزی مرۆڤەوە سەر هەڵنادەن، ئەوسا بەندبوون بە مرۆڤەوە بۆ بەندبوون بە شتەکانەوە دەگەڕێتەوە. لە کۆماردا هەموو سوودمەندییەکانی باری سروشت لەتەك ئەوانەی کۆمەڵگای هاووڵاتیدا یەك دەگرنەوە.

کەواتە چاکترە منداڵ لە بەندبوونی سروشتیدا بهێڵرێتەوە. ئێوە ئەو کاتە دوای یاسای سروشت کەوتوون. بەتایبەتی ئەوەتان لەیادنەچێ، کە ئێوە نابێ بە هیچ شێوەیەك منداڵ فێری ڕێزی ئاقڵانە بکەن، چونکە ئەو ڕێزە لە کاتی پێویستدا بۆی دەبێ بە شێوازێکی جادوویی و بەڕێیەوە هەوڵ دەدات شوێنەوارەکەی بخاتە ژێر ڕکێفی ویستییەوە یان ڕاستەوخۆ خواستەکانی بەدی بهێنێ. ئەم جۆرە پەروەردەیەی ڕێزگری لە لای دەوڵەمەندەکان لەبڕ نایەت، کە پاشان منداڵەکانیان دەبن بە خاوەنی زۆر زاراوەی فێڵزانانە و دەردی دەسەڵات پاڵیان پێوە دەنێ بۆ ئەوەی هاومرۆڤەکانیان بکەن بە کۆیلە. من بێگومانم، کە ئێمیل قسەڕەق دەبێ وەك لەوەی فێری ڕێزی فیزدار ببێ.

لۆك دەیویست منداڵ لەسەر بنەمای ئەقڵ پەروەردە بکرێ. ئەمە ئەمڕۆ لە لای ئێمە بووە بە مۆدە. بەڵام ئەم شێوازە بە بڕوای من سەرکەوتوو نییە. هیچ شتێك لەو منداڵانە گەوجتر نییە، کە بە زۆر ئاقڵ کراون. ئەقڵ لەنێو سەرجەم توانستەکانی مرۆڤدا، کە بێگومان لە هەموویان پێکدێ، بەگرانتر و درەنگتر دەگۆڕرێ. ئەقڵ برێتییە لە بەرهەمی وەستایانەی پەروەردەیەکی چاك و بەم ڕێیەوە هەوڵ دەدرێ، مرۆڤێکی ئەقڵدار بهێنرێتە گۆڕێ. کەچی زۆر کەس دەیانەوێ بەهۆی ئەقڵ خۆیەوە بەم ئاستە بگەن، بەبێ ئەوەی بزانن لە دوا

پلەوە سەرچاوەیان گرتووە و لە منداڵەکەیان ئامرازێك دروست دەکەن. گەر منداڵ ئەقڵی هەبێ، ئەوا پێویستیی بە پەروەردە نابێ. لاساریی منداڵ بەرهەمی سروشت نییە، بەڵکو بەرهەمی بەخێوکردنە، کە ئیتر یان ناچاری هۆشرایەڵی بووە یان توانیویێتی فەرمان بدات.

ڕێزی منداڵ بگرن و نە بە چاك و نە بە خراپ بڕیار بەسەریدا مەدەن. دیاردە شازەکان دوای دەرکەوتنیان دەزانرێن و چارەسەر دەکرێن، نەك بە سەپاندنی شێوازی تایبەتی. ڕێگە بە سروشت بدەن هەڵوێستەکەی خۆی بنوێنێ و ڕۆڵی ئەو وەرمەگرن بە مەبەستی ئەوەی ڕێ لە کاریگەرییەکانی بگرن. ئێوە دەڵێن نرخی کات دەزانن و ناتانەوێ بیدۆڕێنن، بەڵام مرۆڤ کات دەدۆڕێنێ، گەر بەخراپی بەکاری هێنا. منداڵێکی بەخێوکراو زۆر کەمتر ئەقڵی هەیە لە منداڵێك، کە هەرگیز فێر نەکرابێ.

فێربوونی منداڵ بەئاسانی یەکێکە لە هۆکانی بۆگەنکردنی. ئەم ئاسانییە بەڵگەیەکە بۆ ئەوە، کە ئەو هیچ فێر نابێ. مێشکی خاوێنی منداڵ وەك ئاوێنەیەك هەموو ئەو شتانە دەپەرچێنێ، کە دەخرێنە بەردەمی، بەبێ ئەوەی هیچ لەنێو خۆیدا گل بداتەوە. منداڵ وشەکان لە لای خۆی دەهێڵێتەوە، بەڵام ئیدێکان، کە تەنها بیستەرانی لێیان تێدەگەن، دەپەرچێنێ.

یادوەری و هزرین دوو توانستی جوودان لە یەك، بەڵام هەردووکیان پێکەوە دەگۆڕرێن. منداڵ پێش گەیشتنی بە تەمەنی ئەقڵ تێڕوانینی هەیە، بەبێ ئەوەی تێگەیشتی هەبێ. لە نێوان ئەم دووانەدا جیاوازی هەیە: تێڕوانین برێتییە لە دەروێنەی ئیزۆلەکراوی بابەتە فیزیکییەکان (ئەزموونییەکان)، کە بەهۆی پەیوەندییەوە دێتە ئاراوە. بۆ نموونە وێنەیەك تەنها بۆ خۆی وەك وێنە لەنێو هۆشدایە و لە ساتی ئامادەدا گیراوە. بەڵام مەرجی تێگەیشت برێتییە لە هەبوونی تێگەیشتی دی. گەر مرۆڤ تێڕوانینی هەبوو، ئەوا تەنها لێدەڕوانێ،



بەڵام گەر تێگەیشتێکی هەبوو، ئەوسا بە "بەراورد" هەڵدەستێ. زێنزەکانی مرۆڤ تەواو پاسیڤن، بەڵام تێگەشتەکانی لە پرنسیپێکی چالاکەوە دێن، کە "دەسەنگێنێ".

لەبەر ئەوەی منداڵ ناتوانێ بسەنگێنێ، ئەوا یادوەریی ڕاستەقینەی نییە. منداڵ لە لای خۆی ڕەنگ و فیگور و هەستە زێنزییەکانی دەهێڵێتەوە، بەڵام بەدەگمەن پێرسەپتکردن و بەدەگمەنتر پەیوەندیی پێرسەپتکردنەکان لە لای خۆی دەهێڵێتەوە. هەندێك کەس دەڵێن، منداڵ دەتوانێ کەمێك لە بناغە سەرەتاییەکانی ئەندازە فێر ببێ. ئەمە ڕاست نییە. منداڵ هەرگیز ناتوانێ بیردۆزێکی ماتماتیکی، کە لە لایەن کەسانی دیکەوە شیتەڵ کراوە، لە لایەنی خۆیەوە شیتەڵ بکات و لە هۆشیدا بیهێڵێتەوە. گەر بە وردی ڕەچاوی مێتۆدی ئەم ماتماتیستە گچکەیە بکەن، دەبینین، کە ئەو تەنها وێنەی فیگور و بیردۆزەکەی وەرگرتووە. بە کەمترین گۆڕان تێیدا هەموو شتێکی لێ تێکدەچێ. گەر باوەڕ ناکەن، فەرموون فیگورەکە هەڵبگێڕنەوە و ئەوسا بە چاوی خۆتان دەیبینن. سەرجەم توانستی منداڵ لە تۆماری زێنزیدایە، بەبێ ئەوەی ئەو تۆمارە بە هزرینی بگات. تەنانەت یادوەریی ئەو بەدەگمەن لە توانستەکانی دیکەی کاملترە، چونکە ئەو لە گەنجێتیدا هەمیشە لە نوێوە ئەو شتانە فێر دەبێتەوە، کە لە منداڵیدا تەنها وشەکەیانی دەزانی. من بێگومان ناڵێم، منداڵ هیچ شێوەیەکی هزرینی نییە، بە پێچەوانەوە؛ بەڵام ئەو تەنها سەبارەت بەو شتانە دەهزرێ، کە دەیان ناسێ و لەتەك بەرژەوەندییە ساتییەکانیدا دەگونجێن.

لەبەر ئەوەی وشە زانست نییە، ئەوا خوێندن بۆ منداڵ گونجاو نییە. چونکە تۆماری هەستە زێنزییەکانی ئەو هزرین نین. ئیتر بۆچی کەتەلۆگێکی نەخشە و پلان بخزێنرێتە نێو مێشکییەوە، کە بۆ ئەو هیچ واتایەکی نییە؟ چ وەهمیەتێك بە هۆشی دەدرێ، گەر ئەو وشانەی لە لای ئەو "واتا"یان نییە، بە

زانست دابنرێن؟ بە یەکەم وشە، کە تۆماری دەکات، بە یەکەم شت، کە بەهۆی کەسانی دیکەوە ئەزموونی دەکات، توانستی سەنگاندن دەدۆڕێنێ. سروشت خاوێنیی بە مێشکی منداڵ نەبەخشیوە، هەتا بە ناوی پاشا و ژمارە، بە ئەستێرەزانی و جیۆگرافی پڕ بکرێتەوە، بەڵکو ئەو خاوێنییەی پێ بەخشیوە، هەتا بە یارمەتیی ئیدێکانی، کە تێیان دەگات و بەکەڵکی دێن، هەروەها بەختیاریی خۆی تێیاندا دەبینێتەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان بتوانێ لە ئەرکەکانی تێبگات و لە ژیانیدا گونجاو بە ناوەرۆك و توانستی خۆی هەڵوێست وەربگرێ.

بەڵام من بێگومانم، کە ئێمیل پێش تەمەنی دە ساڵی فێری خوێندنەوە و نووسین بووە. ئێمیل ئەم توانستەی هەیە، چونکە من نەترساوم لەوەی، کە ئاخۆ ئەو لە تەمەنی پازدەساڵیدا فێر ببێ و لەبەر ئەم هۆیە پەلەی لێ بکەم. من تەنانەت پێم خۆشە، ئەو نەتوانێ بخوێنێتەوە وەك لەوەی دانایی پێ بفرۆشرێ.

دوو جۆر مرۆڤ بەردەوام لەشیان لە ڕاهێناندایە و زۆر کەم سەبارەت بە کولتووریدانی دەروونیان لێدەهزرێن: جوتیار و وەحشی. جوتیار هەڵەشە و جرپن و ساکارە، بەڵام وەحشی، کە دەمێکە بە هۆشە سروشتییەکەی زانراوە، بەهۆی هۆشی خاوێنییەوە خاوەنی سروشتێتییە. هیچ کەسێك وەك جوتیار شت بەگران فێر نابێ، هیچ کەسێکیش لە وەحشی وریاتر نییە. ئەم جیاوازییە لە کوێوە دێ؟

جوتیار هەموو ڕۆژێك بەو کارانە هەڵدەستێ، کە پێی سپێرراون؛ ئەنجامدانیانی لە باوکی خۆی بینیوە یان لە منداڵییەوە فێریان بووە. بەم شێوەیە کارەکان لەنێو چێوەیەکی ڕۆتینیدان. ژیانی ئەو نزیکەی ڕەوتێکی ئۆتۆماتیکیی وەرگرتووە، چونکە بەردەوام بە هەمان کار هەڵدەستێ. هۆشرایەڵی و خوو لەنێو ئەم ژیانەدا جێگەی تێگەیشتن دەگرنەوە. بەڵام وەحشی جیاوازە: بە هیچ شوێنێکەوە بەند نییە، هاوکات ڕێنومای بەسەردا نەسەپێنراوە و تەنها



دوای یاسای ویستی خۆی دەکەوێ. بۆیە دەبێ هەموو کردارێکی خۆی لە ژیاندا بسەنگێنێ: لە شوێنی خۆی ناجوڵێ، یەك هەنگاو هەڵنانێ، پێش ئەوەی سەرەنجامەکەی نەبینێ. هەروەها هەتا چەند لەش لە ڕاهێناندا بێ، هۆش ئەوەندە پێدەگات. هێز و تێگەیشتن پێکەوە گەشە دەکەن و هەر یەکەیان بەهۆی ئەویدیکەیانەوە بەهێزتر دەبێ.

فەرموون پەروەردکارە زیرەکەکان، منداڵی کاممان لە وەحشییەکە یان لە جوتیارەکە دەچێ؟ منداڵی ئێوە بەبێ داواکاری هیچ ناکات. ناوێرێ بخوات، گەر برسیی بوو، پێبکەنێ، گەر شادمان بوو، بگری، گەر خەمبار بوو. ئیتر هێندە ناخایەنێ بەپێی دەستووورە سەپاوەکانتان هەناسە دەدات. ئەو سەبارەت بە چی بهزرێ، کاتێك ئێوە بۆ ئەویش دەهزرێن؟ بەڵام ئێمیلی من، یان ڕاستتر ببێژم، ئێمیلی سروشت، ڕاهاتووە بە کارەکانی خۆی هەستێ و هەرگیز داوای یارمەتی لە هیچ کەسێك ناکات. بۆیە هەموو ئەو شتانە دەسەنگێنێ، تێدەگات و دەنرخێنێ، کە ڕووبەڕووی دەبنەوە. ئێمیل خەریکی چەنەبازی نابێ، بەڵکو کردار دەنوێنێ. ئەو هیچ شتێك دەربارەی ڕووداوەکانی جیهانی مەزن نازانێ، بەڵام بەچاکی هەموو ئەو کارانە ئەنجام دەدات، کە بە بڕوای خۆی ڕاست و دروستن. ئیتر لێرەدا ناچارە لە زۆر شت بڕوانێ و کاریگەرییەکانیان بناسێ. بەم شێوەیە لەم تەمەنە زووەیدا ئەزموون کۆدەکاتەوە، بەڵام وانەکانی لە سروشت وەردەگرێ نەك لە مرۆڤ. ئێمیل خۆی فێر دەکات، چونکە کەس بەخێوی ناکات.

## ٣

هێزەکانی منداڵ لە تەمەنی دوازدە یان سیازدەساڵییدا خێراتر لە پێداویستیەکانی گەشە دەکەن. تاك لەم قۆناغەدا پتر توانستی هەیە وەك لە هێز. ئەم تەمەنە لەنێو سەرجەم ژیاندا بەنرخترین کاتە، کە تەنها جارێك دێ و کورتخایەنە، بۆیە پێویستە بەچاکی بەکاربهێنرێ.

هۆشی مرۆڤ سنووری هەیە و ناتوانێ هەموو شتێك بزانێ، بۆیە ناچارە ئەلتەرناتیڤێك لە نێوان بابەتەکانی فێربووندا هەڵببژێرێ. بەڵام مرۆڤی تێگەیشتوو هەوڵ بۆ زانینێك دەدات، کە بەڕاستی ببێ بە مایەی شادمانبوونی. کێشەکە بۆ ئەو لەوەدا نییە، کە بزانێ شتێك چییە، بەڵکو لەوەدایە، کە ئاخۆ ئەو شتە سوودمەند بێ بۆی.

منداڵ سەرەتا بزێوە، بەڵام درەنگتر نوێخوازە (فزوولییە). گەر ئەم نوێخوازییەی بەچاکی پێش بخرێ، دەبێ بە پاڵهێزی گۆڕان بۆ ئەم تەمەنەی ئێستا. ئێمە دەبێ لەم تەمەنەدا هێشتا هەر جیاوازی لە نێوان مەیلی سروشتی و ترادیسیۆنیدا بکەین: زێنزەکان دەبێ ڕابەری چالاکییەکانی هۆش بن. نابێ هیچ کتێبێك بە منداڵ بدرێ جگە لە کتێبی جیهان، هیچ وانەیەکی پێ ناگوترێتەوە جگە لە ڕاستیەکان.

زەمین دوورگەی ڕەگەزی مرۆڤە. خۆر تاکە ئۆبژێکتێکە، کە بەتایبەتی سەرنجی چاوی مرۆڤ ڕادەکێشێ. هەر بۆیە فەلسەفەی هەموو گەلە وەحشییەکان برێتییە لە دابەشکردنی ئەندێشەیی زەمین و خوای خۆر. وریایی کۆرپەکەتان ئاڕاستەی دیاردەکانی سروشت بکەن. بۆ ئەوەی حەزی زانینی بێدار بکەنەوە، هەوڵ مەدەن حەزەکانی ساتار بکەن. پرسیاری لێ بکەن، کە لەگەڵ توانستەکانیدا بگونجێ، پاشان وەڵامەکەی بۆ خۆی جێ بهێڵن. مەرج نییە منداڵ



فێری زانستی سروشتی بکرێ، با ئەو خۆی بیدۆزێتەوە. کەچی ئێوە کاتێك دەتانەوێ منداڵەکەتان فێری جیۆگرافی بکەن، دەچن گلۆبوس و نەخشەی وڵاتانی بۆ دەکڕن! بۆ ئەم مەبەستە شتی ئاوها پێویست نییە. ئەم دەروێنانە چ سوودێکیان هەیە؟ بۆچی لە سەرەتاوە بابەتەکەی نیشان نادەن، هەتا لایەنی کەم بزانێ ئێوە لەچی دەدوێن؟ بۆ نموونە:

ئێوارەیەکی فێنك پەروەردکار و کۆرپەکەی دەڕۆن بۆ پیاسە. پاشان شوێنێکی گونجاو بۆ مەبەستەکەیان دەدۆزنەوە. لەو شوێنەوە لەنێو ئاسۆی خاوێندا لە ئاوابوونی خۆر دەڕوانن، هەروەها ئەو شتانە دەبینن، کە لەنێو تیشکەکانی ئاوابووندا دەرکەوتوون. ڕۆژی داهاتوو، بەیانی زوو لە کاتی هەڵاتنی خۆردا، بۆ هەمان شوێن دەڕۆنەوە. خۆر لە دوورەوە بە تیشکە ئاگرینەکانییەوە هەڵدێ، هەمیشە پتر دەگەشێتەوە و لەوە دەچێ، کە سەرجەمی ڕۆژهەڵات لەنێو بڵێسەدا چاوەڕوانی ئەو ئەستێرەیە بێ. مرۆڤ هەموو ساتێك باوەڕ دەکات، هەڵاتنی ببینێ – هەتا ئیتر دەیبینێ. پنتێکی بریسکەدار هەڵدێ و ئەو ناوە دەگرێتەوە. پەچەی تاریکی لادراوە و دیار نەماوە، مرۆڤ لە ناوچەکەی خۆی دەڕوانێ و هەست بە جوانبوونی دەکات. سەوزایی بەدرێژایی شەو هێزی نوێی کۆکردۆتەوە، ئێستاش بەتیشکی خۆر زێڕین دەبێ و لەژێر درەوشەی شەونمدا بە چاوی مرۆڤی دەبەخشێ. مەلەکان بە کۆڕ پێشوازی لە دایکی ژیان دەکەن، ئاوازی بەیانیانیان ناسك و شیرینترە لە هینی ئێوارانیان. مرۆڤ هەست بە بێداریی شادی دەکات و زێنزەکانی بە هەستی فێنکی مەست بوون و ئەم هەستەی هەتا نێو دەروونی دەتەنێتەوە. هیچ کەسێك ناتوانێ بەرهەڵستی ئەم ساتانەی مەستبوون بکات.

ئێستاش مامۆستای هۆشسام دەیەوێ ئەم دیاردانە بۆ منداڵەکەی ڕوون بکاتەوە. ئەمە ئەوپەڕی گەوجێتییە! بەزمی سروشت تەنها لەناخی مرۆڤی

کامڵدا ژیان وەردەگرێ. بۆ بینینی ئەو بەزمە هەستکردن پێویستە. منداڵ تۆماری شتەکان دەگرێ نەك پەیوەندییەکانیان. منداڵ هارمۆنیی ئەو ئاهەنگە نابیستێ، پێویستیی بە ئەزموونێکە و جارێ نەی کردووە، پێویستیی بە هەستێکە و جارێ پێرسەپتی نەکردووە. منداڵ بەدووی ئەم ئەزموونەدا دەتوانێ تۆمارە زێنزییەکانی خۆی بچێژێ، تۆمارێك کە لە هاوکاتیی هەستە زێنزییەکاندا بەدی دەهێنرێ. ئەم قۆناغە جارێ دوورە لە هەست و زێنزی جوانی.

مامۆستا دوای ئەم ئەزموونە کەمێك بێدەنگ دەبێ، هەر وەك لێبهزرێ، ئینجا ڕوو دەکاتە منداڵەکەی: "من سەبارەت بەوە دەهزرێم، کە دوێنێ خۆر لەو بەرەوە ئاوا بوو و ئەمڕۆ لێرەوە هەڵات". پاشان بێدەنگ دەبێ. گەر منداڵەکەی پرسیاری لێکرد، وەڵامی ناداتەوە و باسەکە دەگۆڕێ. وەڵامی ئەم پرسیارە بۆ خۆی جێ بهێڵن و بێگومان بن لێی دەهزرێ. بۆ ئەوەی منداڵێك وریا بێ و ڕاستییەك کاری تێ بکات، دەبێ چەند ڕۆژێك ناخی هەژێنراو بێ، پێش ئەوەی ڕاستییەکەی بۆ ڕوون بکرێتەوە. بۆ ئەوەی وریاتربێ، ئەوا مامۆستا دەتوانێ پاش چەند ڕۆژێك پرسیارەکەی هەڵبگێڕێتەوە. گەر منداڵەکەی نەزانێ خۆر چۆن لە ئاوابوونەوە هەڵدێ، ئەوا خۆ بێگومان دەزانێ، چۆن لە هەڵاتنەوە ئاوا دەبێ. ئەمیان بە چاوی خۆی دەبینێ و چاوەکانی فێریان کردووە. کەواتە یەکەم پرسیاری بەرێی دووەم پرسیارەوە بۆ ڕوون بکەنەوە. ئەمە نموونەیەك بوو لەسەر وانەی کۆسمۆگرافی.

تێگەیشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هێدی هێدی لە هۆشی منداڵدا سەر هەڵدەدەن، تەنانەت پێش ئەوەی بوو بێ بە ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵگا. من ئێمیل دەبەم بۆ زۆر نێوەندی کۆمەڵایەتی، هەتا هەست بە زەرورەی ئاڵوگۆڕ بکات و بۆ خۆی سوودی لێ هەڵبهێنجێ. دوای ئەوەی زانی "ژیان" چییە، فێری دەکەم چۆن دەستگیری بکات.



بەڵام ئێوە پشت بە ڕێکخراوی ئامادەی کۆمەڵگا دەبەستن، بەبێ ئەوەی بزانن ئەو ڕێکخراوە بە ناچاری ڕووبەڕووی شۆڕش دەبێتەوە و نایهێڵێ. پاشان منداڵەکانتان دەکەونە نێو ڕێکخراوێکەوە، کە هەرگیز نەتان بینیوە و ناشتوانن ڕێ لە هاتنی بگرن. ئەو دەمە دەوڵەمەند هەژار دەکەوێ و پاشا دەبێ بە ژێردەستە. ئێمە لە تەنگژە و سەردەمی شۆڕش نزیك دەکەوینەوە! بە بڕوای من مەحاڵە شانشینە مەزنەکانی ئەوروپا بتوانن درێژە بە تەمەنیان بدەن. هەموویان گەیشتوون بە قۆناغی گەشاوەیی، هەر دەوڵەتێکیش بەم گەشاوەییە گەشت، ئیتر ڕووەو بۆگەنبوونی، ڕووەو ڕمانی خۆی دەڕوات. ئینجا ئەو کەسە بەختیارە، کە ماڵئاوایی لە ستاندەکەی بکات، یان ستاندەکەی ماڵئاوایی لێ بکات و ئەویش سەرەڕای هەموو مسیبەتێك وەك مرۆڤ بمێنێتەوە.

هەر کەسێك بگرین، مرۆڤ بێ یان هاووڵاتی، ناتوانێ توانستێکی جودا لە خۆی بهێنێتە نێو کۆمەڵگاوە. ئەو کەسە دزە، کە بە ڕابواردن هەڵدەستێ و سامانی خۆی خەرج ناکات. خانەنشینێك، کە دەوڵەت بۆ تەمەڵییەکەی مووچەی دەداتێ، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ جەردەدا نییە. مرۆڤی دەرەوەی کۆمەڵگا قەرزاری هیچ کەس نییە و مافی ژیانێکی هەیە، کە خۆی دەیەوێ. بەڵام کارکردن لەنێو کۆمەڵگادا فرمانێکی پێویستی هەموانە، هینی دەوڵەمەند و هەژار، بەهێز و لاواز.

پیشەی دەستی لەنێو کاسپییەکاندا چاکترین بناغەی گوزەرانە و پەیوەندییەکی نزیك لەتەك باری سروشتدا چێ دەکاتەوە. پیشەگەر بەندە بە کارەکەیەوە و بەقەد کۆیلەتیی جوتیار ئازادە. جوتیار بەندە بە کشتیارییەوە و دەسکەوتی لەژێر ڕکێفی کەسانی دیکەدایە، دەشێ ڕۆژی هەزار جار لەنێو کێڵگەکەیدا ڕسوا بکرێ و بشکێنرێ. بەڵام گەر پیشەگەرێك جنێوی پێدرا، یەکسەر چارۆکەکەی دەپێچێتەوە و هەردوو دەستی لەگەڵ خۆیدا دەبات.

بێگومان کشتیاری یەکەم پیشەی مرۆڤە و پتر مایەی شەرەفە، بریتییە لە سوودمەنترین و لەبەر ئەم هۆیەش مەزنترین پیشە. بەڵام من بە ئێمیل نالێم: خەریکی کاری نێو کێڵگە بە! ئەو خۆی زوو فێری ئەم کارە بووە و هەروەها هەموو کاتێك دەتوانێ پێی هەستێ. من بە ئێمیل دەڵێم: گەر ئەم میراتەی باوانت بدۆڕێنیت، یان گەر نەت بوو، چی دەکەیت؟ فێری پیشەی دەستی ببە!

٤

چارەکێکی ژیان تێپەڕی، بەبێ ئەوەی بزانین بەکاری بهێنین. دوا بەشی ژیان تێدەپەڕێ و ناتوانین بیچێژین. دوو چارەکی نێوانیان، کە بۆمان دەمێننەوە، بە خەو و کار و ئازار بەسەریان دەبەین. ژیان کورتە، بەڵام نەك لەبەر کورتخایەنیی کاتەکەی، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەم کاتە کەمەدا بە دەگمەن بۆمان دەلوێ بی چێژین. دەشێ شوێنکاتیی نێوان زایین و مردن زۆر گەورە بێ، بەڵام گەر بە تەواوی بەدینەهێنرا، ئەوا لێرەبوون کورتخایەنە.

مرۆڤ جارێك بۆ لێرەبوون دەزایێنرێ و جارێك بۆ ژیان: وەك سروشتێکی جۆری و ڕەگەزی. لاوازیی مرۆڤ هۆی بەکۆمەڵایەتیبوونێتی، پاشان سۆیی هاوبەش دڵی مرۆڤ بۆ مرۆڤپەروەری ئاوەڵا دەکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕوانین لە بەختیارێك هەستی بەخیلی دەهێنێتە ئاراوە نەك هینی خۆشەویستی، یان کێ بێبەختێك خەتابار ناکات، کاتێك ژیانی لە ئازاردا دەبینێ؟!

ئێمیل دەزانێ، کە مرۆڤ لە سروشتەوە چاکە. لە ناخی خۆیەوە هەست بەم چاکییە دەکات و لێرەشەوە لە هاومرۆڤەکانی دەڕوانێ. ئێمیل دەبێ ببینێ، کە چۆن کۆمەڵگا مرۆڤ خراپ و بۆگەن دەکات، دەبێ لە بوختانەکانیاندا سەرچاوەی گرفتی مرۆڤ ببینێ. ئێمیل ڕێزی هەموو تاکێك دەگرێ، بەڵام بە بێڕێزی لە



کۆمەڵگا دەڕوانێ. ئێمیل فێر دەبێ، چۆن مرۆڤان هەموو نزیکەی هەمان ماسك هەڵدەگرن، بەڵام فێری ئەوەش دەبێ، کە ڕووخساری جوانتر لە ماسك هەیە.

ئەم مێتۆدە لە پراکسیسدا ئاسان نییە. چونکە گەر لە تەمەنێکی زوودا فێری چاودێریی خەڵکان بوو، ئەوسا دووچاری گاڵتەجاڕی دەبێ. بۆیە مرۆڤی لە دوورەوە نیشان دەدەم، کە هەروەك ڕووداوەکان لەسەر شانۆیەك ببینێ. ئیستا کاتی فێربوونی مێژووە. ئێمیل بەهۆی مێژووەوە فێر دەبێ، لەنێو دڵی مرۆڤدا بخوێنێتەوە و وەکو بینەر لێی بڕوانێ، بەبێ ئەوەی جارێ گرنگیپێدانی خۆیی هەبێ، یان بەبێ ئەوەی جارێ وەك ئەوانی دی خەتابار بێ. بەڵام جارێ لە فەلسەفە بەدووری دەگرم.

فەیلەسوفەکان مرۆڤ باش ناناسن. ئەوان تەنها بەڕێی فەلسەفەوە لە مرۆڤ دەڕوانن. وەحشییەك چاکتر لە فەیلەسوفێك دەماننرخێنێ. فەیلەسوف هەست بە گرفتەکانی دەکات، پاشان خۆی بەسەر گرفتەکانی ئێمەدا خاڵی دەکاتەوە و بە خۆی دەڵێ: ئێمە هەموو خراپین. بەڵام وەحشییەکە بەساردی لێمان دەڕوانێ و ڕاستەوخۆ پێمان دەڵێ: ئێوە هەموو گەمژەن. ڕاست دەڵێ. ئێمیلی من ئەو وەحشیەیە، بەڵام بە جیاوازییەکەوە، ئەویش ئەوەیە، کە ئەو لێهزریوە، ئیدێی جیاوازی سەنگاندووە، هەڵەکانمانی لە مینایەکی نزیکەوە بینیوە و سەنگاندنەکانی لە ئەزموونەوە دەردەبڕێ.

لۆك دەیەوێ، منداڵ بە فێرکردنی "گیان" (هۆش) پەروەردە بکرێ و پاشان لێرەوە بۆ فێربوونی جەستە بپەڕێتەوە. بەڵام ئەمە خەرافیاتە نەك مێتۆدی ئەقڵ یان سروشت. ئەم مێتۆدە لەوە دەچێ، کە مرۆڤ چاوی خۆی بنوقێنێ هەتا فێری بینین ببێ. مرۆڤ دەبێ ماوەیەکی درێژ دەربارەی جەستە بخوێنێ، هەتا بتوانێ تێگەیشتێکی ڕاست لەسەر گیان گۆڕان پێبدات و مەزەنەی لێرەبوونی بکات. تاکە (ئیندیڤیدە) جەستەییەکان تەنیا شتێکن، کە بە

شێوەیەکی زێنزی پێرسەپت دەکرێن. ئێمە دوای ئەم پێرسەپتکردنە دەتوانین تێگەیشتێکی ڕاستەوخۆمان دەربارەیان هەبێ، چونکە ئەم زێنزانە یەکەم ئامرازی زانینمانن. وشەی هۆش بۆ کەسێك بێواتایە، کە گۆڕانی بە تێڕوانینێکی خۆیی دەربارەی هۆش نەدابێ.  هۆش بۆ گەل و منداڵ برێتییە لە جەستە. ئایا ئەوان مەزەنەی خێو ناکەن، کە دەقیژێنن، دەدوێن و لە خەڵك دەدەن؟ کەواتە ئەو خێوانەی قۆڵ و زمانیان هەیە، لە جەستە دەچن. هەموو گەلەکانی سەرزەمین، جگە لە جوو، خوای جەستەییان دروست دەکرد. ئێمەش بە هۆی تێگەیشتەکانی گیان و سیانەتی (ترینیتێ) هەتا ڕادەیەکی زۆر ئەنترۆپۆمۆرفیستین. ئێمە لە منداڵییەوە فێر دەکرێین، خوا لە هەموو شوێنێکە، بەڵام هاوکات لەو بڕوایەداین، کە هەوا لە هەموو شوێنێکە، لایەنی کەم لەنێو ئەتمۆسفێردا.

هەستی کاریگەریی مرۆڤ لەسەر لەشی دی، مرۆڤی گەیاندە ئەو باوەڕە، کە ئەو لەشانەش بە پێچەوانەوە کاریگەرییان لەسەر ئەو هەیە. بۆیە دەروونی بە هەموو ئینديڤيدەکان بەخشی. لەبەر ئەوەی هەستی بە لاوازیی خۆی بەرانبەر بە جیهان کرد و هاوکات سنووری هێزی ئینديڤيدەکانی نەدەزانی، ئەوا خوای لە شێوەی جەستەدا لێدروستکردن. پاشان گەردوونی بە خوای هەستکەر تەنی: ئەستێرەکان، با، چیا، ڕووبار، درەخت، شار، خانوو، هەموو یەکێك لە ئەمانە دەروونی خۆی هەبوو یان خوا و ژیانی خۆی هەبوو.  پۆلیتاییزم بوو بە یەکەم ئایینی مرۆڤ و بتپەرستیش بە یەکەم ئادەتی ئایینی ئەو. پاشان هۆش لە ڕەوتی گۆڕانەکانیدا، کە بەردەوام گشتێتی بە تێگەیشتەکان دەدا، گەیشت بە توانایەکی ئەوتۆ، ئێستا پشت بە هۆیەکی یەکەمین ببەستێ و سەرجەم سیستەمی شتەکان لەیەك تاکە تێگەیشتدا یەك بخات. بەم شێوەیە بڕوای بە یەك خوای تاك و تەنیا



هێنا، ئینجا واتایەکی بە زوبستانس (جەوهەر) دا. بەڵام ئەم واتایە گەورەترین ئەبستراکتاندنە.

مرۆڤ گەیشت بە تێگەیشتی جەوهەر و بۆ ئەوەی بڕوا بە تاکە جەوهەرێك بهێنێ، مۆرکی پێکەوەنەگونجاوی خستە پاڵ، بۆ نموونە کشان و هزرین، لێرەشدا وای دانا، کە یەکێکیان نەشیاوی کەرتبوونە و ئەویدیکەیان بەپێی جەوهەری شیاوی کەرتبوونە. بەڵام هۆشی مرۆڤێکی گەنج، کە جارێ لەتەك چالاکییە زێنزییە سەرەتاییەکانی خۆیدا خەریکە و تەنها لەو شتانە تێدەگات، کە لێکەوتیان دەکات، چۆن دەتوانێ بە تێگەیشتی مۆرکەکانی خوایەتی بگات، بۆ نموونە کردگاری، نەهێڵەری، گشتنرخ و ئەزەلی؟ واتا تێگەیشتی ئەو مۆرکانەی خوایەتی، کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە مرۆڤ بە چەواشەکەر و پڕنهێنییان دادەنێ، بەڵام گەلی سادە هیچ نهێنییەکیان تێدا بەدیناکات، چونکە تێیاناگات؟ لەبەر ئەم هۆیە هەر منداڵێك بڕوای بە خوا کرد، ئەوا ئەو منداڵە بتپەرستە.

لێرەوە دەبینم، چۆن خوێنەرێکی زۆر هۆشیان لە هەڵوێستی من وڕماوە، چونکە دەبینن، کە منداڵەکەمم بەنێو یەکەم قۆناغی ژیانیدا ڕابەری کرد و بە هیچ شێوەیەك لەگەڵیدا دەربارەی ئایین نەدووام. تەمەنی گەیشت بە پازدەساڵان و ئەو هێشتا نەی دەزانی دەروونی هەیە. ڕەنگە جارێ تەمەنی هەژدەساڵی کاتی زانینی ئەم ڕاستییە نەبێ. چونکە گەر پێش کاتی زەرووری بەمەی زانی، ئەوا مەترسییەك دێتە ئاراوە، کە چەواشە ببێ و هەرگیز نەیزانێ.

بەڵام ئێستا بە دۆگمێکەوە دێن بۆ لام و پێم دەڵێن: "مرۆڤ دەبێ بڕوای بە خوا هەبێ، هەتا ڕزگاری بکات". ئەم دۆگمە برێتییە لە پرنسیپێکی تینوو بە خوێن و هۆی سەرجەم ئەو بۆچوونە ڕووکەشانەیە، کە ئەقڵی مرۆڤ دەخنکێنن، چونکە ڕایدەهێنن خۆی بە وشەی پووچ تێر بکات.

* * *

(کاتێك من هاتمە نێو جیهانەوە، سەر بە کلێسەیەك بووم، کە بڕیاری هەموو شتێکی دەدا و گومان مەحاڵ بوو. پێیان گوتم: بڕوا بە هەموو شتێك بهێنە. بەم شێوەیە ڕێیان لێگرتم، کە هیچ نەبێ بڕوام بە شتێك هەبێ. ئیتر دۆش دامام و نەم زانی خۆم لە کوێدا بگیرسێنمەوە. چووم ڕاوێژی فەیلەسوفەکانم کرد و تێڕوانینە جیاوازەکانیانم تاقیکردەوە، بەڵام گەیشتم بە باوەڕێك، کە هۆی جیاوازی لە تێڕوانینی مرۆڤدا بۆ کورتهێنانی هۆشی دەگەڕێتەوە. ئێمە سنووری ئەم مەکینەیەی نەشیاوی پێوانە نازانین و ناتوانین فونکسیۆنەکانی بپێوین، نە دەربارەی یاسا سەرەتاییەکانی و نە دوا ئامانجی دەزانین. ئێمە تەنانەت خۆمان ناناسین، تەنانەت دەربارەی سروشتمان و پرنسیپی چالاکیمان نازانین. بە دەگمەن دەزانین کە ئاخۆ مرۆڤ سروشتێکی سادە یان ئاوێتە بێ. نهێنییەکی زۆری نەشیاوی پشکنین لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوین و هەموویان لەوبەر کایە ئەمپیرییەکانەوەن. ئێمە باوەڕ دەکەین ئەقڵمان هەیە و بە یاریدەی دەتوانین ئەو نهێنییانە بپشکنین، کەچی ئێمە لە ڕاستیدا تەنها هێزی وێنامان هەیە. هەموو یەکێك ڕێگەکەی بەنێو ئەم جیهانە ئەندێشەییەی وێنادا، کە خۆی بە ڕاستی دەزانێ، خۆش دەکات، بەڵام هیچ کەس نازانێ، ئاخۆ ئەو ڕێگەیەی بەرەو ئامانجی دەبات یان نای بات. سەرەڕای ئەمە دەمانەوێ هەنگاو بۆ نێو هەموو کایەکانی دی بنێین و بییان زانین، چونکە ئێمە ناتوانین لە نەزانیدا دەربارەی ئەو شتانە بمێنینەوە کە نایان زانین.

هەستم کرد فەیلەسوفەکان نەك تەنها نەیان توانی وەڵامی گومانەکانم بدەنەوە، بەڵکو تەنانەت پەرەیان پێدان. بۆیە بڕیارم دا ڕێبەرێکی دی هەڵبژێرم و بە خۆمم گوت: ئێستا دەمەوێ ڕاوێژ بە ڕووناکیی نێو ناخم بکەم. ئەم کەمتر لە ئەوان چەواشەم دەکات. بەڵام ئایا من کێم؟ من چ مافێکم بۆ بڕیاردان بەسەر شتەکاندا هەیە؟ ئەی چ شتێك بڕیار بەسەر سەنگاندنەکانی



مندا دەدات؟ ئایا شتەکان بەرەنجامی پێرسەپتکردنەکانی منن؟ کەواتە دەبێ سەرەتا ڕوانینم ئاراستەی خۆم بکەم، هەتا ئەو ئامرازە بناسم، کە دەمەوێ بەکاری بهێنم و ئینجا ببینم، هەتا چەند دەتوانم پشت بە بەکارهێنانی ببەستم.

من هەم و زێنزی جیاوازم هەیە و ئەم زێنزانەم کارم تێدەکەن. ئەمە یەکەم ڕاستییە و لێرە هێمن دەبمەوە. بەڵام ئایا من هەستێکی تایبەتیم بۆ لێرەبوونم هەیە، یان من بەهۆی پێرسەپتکردنە زێنزییەکانمەوە هەست بە لێرەبوونم دەکەم؟ ئەمە یەکەم گومانی منە و ئێستا بۆم وەڵام نادرێتەوە. چونکە من بەردەوام لە لایەن پێرسەپتی جیاوازەوە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە کاتی یادهێنانەوەدا، کارم تێدەکرێ. کەواتە: ئایا هەستی منی خۆم شتێکی هەبووە لە دەرەوەی پێرسەپتکردنەکانم و دەشێ سەربەخۆ لە ئەوان لێرەبوونی هەبێ؟

پێرسەپتکردنەکانم لەنێو ناخمدا دێنە ئاراوە، چونکە دەبنە هۆی ئەوەی هەست بە لێرەبوونم بکەم، بەڵام هۆی هێنەرەئارایان لە دەرەوەیە، چونکە ئەو پێرسەپتکردنانەم تەنانەت لە دژی ویستی خۆشم کارم تێدەکەن و هەبوونیان یان نەبوونیان لەنێو مندا بە منەوە بەند نییە. ئێستا تێدەگەم، کە پێرسەپتکردنی نێو ناخی من، هەوەها هۆ و بابەتەکەی، کە لە دەرەوەن، هەمان شت نین.

کەواتە من بە تەنیا لێرەبوونم نییە و ئۆبژێکتی پێرسەپتکردنەکانم بەرانبەر من هەیە. من هەموو ئەو شتانە ناو دەنێم ئەستوو، کە لە دەرەوە کار دەکەنە سەر زێنزەکانم، بەڵام کەرتە تاکەکانی ئەستوو ناو دەنێم جەستە.

ئێستا سەبارەت بە لێرەبوونی گەردوون بە هەمان شێوەی لێرەبوونی خۆم بێگومانم. دوای ئەمە دەربارەی ئۆبژێکتی زێنزەکانم دەهزرێم. ئێستا کتوپڕ لە

ناخمدا توانستێك بۆ بەراوردی ئەو ئۆبژێکتانە دەبینمەوە و سامانێکی چالاکی ناخیمم لە لا ئاشکرا دەبێ، کە پێشتر هیچم دەربارەی نەدەزانی.

پێرسەپتکردن بەواتای هەستگیری، بەراورد بەواتای سەنگاندن. هەستگیری و سەنگاندن دوو شتی جیاوازن. من ئۆبژێکتی جودا لەیەك بەهۆی هەستگیرییەوە وەردەگرم، بەڵام بەو شێوەیەی کە چۆن ئەو ئۆبژێکتانە لەنێو سروشتدا هەن. بەڵام من بەرێی بەراوردەوە ئەو ئۆبژێکتانە دەبزوێنم، هەر وەکو بڵێین، لە شوێنی خۆیان لایان دەبەم، ئینجا دەیان خەمە پاڵ یەك، هەتا بڕیاری جیاوازی یان یەکسانییان، بەگشتی بڕیاری هەموو پەیوەندییەکان، بدەم.

بەڵام هەستگیریی دوو بابەت بە جارێك واتای هەستگیریی یەکسانی یان جیاوازییان نییە؛ هەستگیریی چەند بابەتێکی جودا واتای ژماردنیان نییە. من دەتوانم لە ساتێکدا تێگەیشتێکم دەربارەی گۆچانێکی گەورە یان بچووك هەبێ، بەبێ ئەوەی بەراوردیان بکەم. من بە هەمان شێوە دەتوانم لە دەستم بڕوانم، بەبێ ئەوەی پەنجەکانم بژمێرم. تێگەیشتەکانی بەراورد، وەك گەورەتر، بچووکتر، یان تێگەیشتەکانی ژمارە، وەك یەك، دوو، هتد، برێتی نین لە پێرسەپتکردن، جا گەرچی هۆشی من بە یاریدەی هەستەکانم دروستیان دەکات.

مرۆڤ دەتوانێ لەم توانستەی هۆشی من، کە هەستەکانم لە یەکتری نزیك دەخاتەوە و لە نێوانیاندا بەراورد دادەنێ، بە ویستی خۆی ئەم یان ئەو ناو بنێ، بۆ نموونە ئاگامەندی، هزرین یان پەرچاندن. بەڵام لێرەدا شتێك بەبێ شیاوی گومان ڕاست دەمێنێتەوە: ئەو توانستە لەنێو مندایە نەك لەنێو شتەکاندا و منیش بەو چالاکییە هەستاوم. من بێگومان سەروەر نیم بەسەر هەستمدا، بەڵام سەروەرم بەسەر ئۆبژێکتی هەستمدا.

کەواتە فەیلەسوفەکان چی دەڵێن با بیڵێن. من مافی هزرین بە خۆم دەدەم. من دەزانم، ڕاستی لەنێو شتەکاندایە نەك لەنێو هۆشی منی



سەنگێنەریاندا، هەروەها ئەوەش دەزانم، کە من چەند کەم لەکاتی سەنگاندندا بە شتەکانەوە بنێم، ئەوەندەش زۆر لە ڕاستییەوە نزیکم.

دوای بێگومانبوونم لەسەر من ی خۆم لە دەرەوە دەڕوانم. کتوپڕ دەبینم بۆ نێو گەردوونێکی مەزن فڕێدراوم، هەر وەك ئیتر لەنێو بێدوایەکیی سروشتەکاندا بزر بوو بم. نە دەزانم ئەو سروشتانە چین، نە پەیوەندییانم لەتەك خۆمدا بۆ ڕوون دەکرێتەوە. ئێستا لێیان دەڕوانم و دەمەوێ لێیان تێبگەم.

هەموو شتێك، کە من بەهۆی زێنزەکانمەوە پێرسەپتی دەکەم، برێتییە لە ئەستوو. بۆیە هەموو مۆرکە جەوهەرییەکانی ئەستوو لە زێنزە جیاوازەکانمەوە هەڵدەهێنجم. من هەندێك جار ئەستوو لە بزووتن و هەندێك جاری دی لە سرەوتندا دەبینم. لێرەوە دەگەم بە سەرەنجامێك، کە نە بزووتن و نە سرەوتن جەوهەری ئەستوو پێکدەهێنن. لەبەر ئەوەی بزووتن سەرەنجامی هۆیەکە، ئەوا نادیارەکەی هیچی دیکە نییە جگە لە سرەوتن. کەواتە گەر شتێك کار نەکاتە سەر ئەستوو، ئەوا ئەو لە خۆیەوە نابزوێ. لێرەدا لایەنێکی دی ڕوون دەبێتەوە: لەبەر ئەوەی ئەستوو بەرانبەر بزووتن و سرەوتن بێلایەنە، ئەوا دۆخە سروشتییەکەی برێتییە لە بەردەوامیدان بە سرەوتن.

لەنێو جەستەکاندا دوو شێوەی بزووتن هەیە: بزووتنی پێدراو و سپۆنتان. هۆی بزوێنەر لە بزووتنی یەکەمدا لە دەرەوەی جەستەکەدایە، بەڵام هۆی بزوێنەر لە حاڵەتی دووەمدا لەنێو خۆیدایە، برێتییە لە بزووتنێکی چێبوو لە وزەی خۆوە. مەبەستم لەوە نییە، کە سەئاتێك لە خۆیەوە دەبزوێ. گەر لە دەرەوە هێزێك کاری تێ نەکات، ئەو هەرگیز خۆی قورمیش ناکات. من هەروەها نە لەنێو شلەکاندا وزەیەکی خۆیی دەبینم، نە لەو ئاگرەشدا، کە کردوونی بە شلە.

گەردوون لە ئەستووی پەرش و بێژین پێکهاتووە و جیاوازە لە یەکێتی و ڕێکخراوی و هەستی جەستەیەکی زیندوو. بەڵام ئەم گەردوونە بە پێی دەستوور لە بزووتنێکی یاسایی و هاوڕیتمیدایە، بەبێ ئەوەی خاوەنی ئەو ئازادییە بێ، کە لە بزووتنی سپۆنتانی مرۆڤ و ئاژەڵدا دەبینرێ. بۆیە گەردوون ئاژەڵێکی گەورە نییە و بزووتنی بەندە بە هۆیەکی دەرەکییەوە، کە من ناتوانم هەستی پێبکەم. بەڵام بڕوای نێو ناخم هەستی ئەو هۆیە دەشێنێ و ئەمەش تەنانەت بە شێوەیەك، کە نەتوانم بەبێ هزرین سەبارەت بەو هێزە بزوێنەرە لە بزووتنی خۆر بڕوانم.

ئایا ئەم یاسایانە بەرەو پێشم دەبەن؟ لەبەرئەوەی یاساکان لێرەبوونیان نییە، ئەوا توخم نین و دەبێ ڕوونکردنەوەیەکی دیکەیان هەبێ. ئەزموون و ڕوانین تەنها یاساکانی بزووتنمان پێدەناسێنن، بەڵام ئەم یاسایانە سەرەنجام ڕوون دەکەنەوە نەك هۆ، بۆیە بەس نین بۆ تێگەیشتن لە سیستەمی جیهان و ڕەوتی گەردوون. دێکارت ئاسمان و زەمین لە شەشپاڵو دروست دەکات، بەڵام تەنها بەهۆی بزووتنی سووڕاوەوە (ڕۆتاسیۆن) توانی ئەم شەشپاڵووانە و هێزی سەنتریفوگال بخاتە گەڕ. نیوتن یاسای ڕاکێشهێز (گراڤیتاسیۆن)ی دۆزییەوە، بەڵام گەردوون بەهۆی ڕاکێشهێزەوە دەبێ بە قەوارەیەکی نەبزۆك: بۆ پاڵ ڕاکێشهێز دەبێ پاڵهێز بێ و هێڵی کەوانەیی بۆ جەستەکانی ئاسمان بکێشێ.

هۆ سەرەتاییەکانی بزووتن لەنێو ئەستوودا نین. ئەستوو بزووتنەکە وەردەگرێ و دەیداتەوە، بەڵام دروستی ناکات. من هەتا چەند سەبارەت بە ئەکسیۆن و ڕێئەکسیۆنی هێزەکانی سروشت لێبهزرێم، زانستم هێندە پتر ڕۆشن دەبێ و لە سەرەنجامەوە بۆ سەرەنجام بە "ویستێك" وەك یەکەم هۆ دەگەم. چونکە گەر مرۆڤ گریمان بکات، کە هۆیەکان کارتێکەرییەکی بەردەوامیان هەیە، ئەوسا گریمانی هیچیانی نەکردووە. بە کورتی، شتێك، کە بە بزووتنی دی



بەرنەخرا بێ، ئەو شتە لە کردارێکی سپۆنتان و ویستدارەوە دێ: جەستە بێژینەکان تەنها بەهۆی بزووتن-ەوە چالاکییان هەیە و بەبێ ویستیش کرداری ڕاستەقینە ناشێ. ئەمە باڵاترین پرنسیپی منە. کەواتە بڕوا (ئیمان) دەهێنم، کە ویستێك گەردوون دەبزوێنێ و سروشت دەژێنێ. ئەمە یەکەم دۆگمی منە، یان یەکەم ڕێنومای ئیمانمە.

بەڵام چۆن ویستێك دەتوانێ کرداری فیزیکی و جەستەیی بشێنێ؟ من ئەمە نازانم، من تەنها لە ناخمدا هەست دەکەم، کە ئەو ویستە کردارەکە دەشێنێ. گەر من ویستی کردارێکم هەبوو، پێی هەڵدەستم؛ گەر بمەوێ لەشم ببزوێنم، ئەوا لەشم دەبزوێ. من ویست بەهۆی کردارەکانییەوە دەناسم نەك بەهۆی سروشتییەوە، ئەم ویستەش بۆ من هۆیەکی بزوێنەرە.

گەر ئەستووی بزواو بەرەو ویستێکم بەرێ، ئەوا ئەستووی بزواو لەسەر یاسای تایبەتی بەرەو هۆشێکم دەبات. ئەمە دووەم ڕێنومای ئیمانمە. کردار و بەراورد و بڕیار هەڵوێستی سروشتێکی چالاك و هۆشمەندن. کەواتە ئەم سروشتە هەیە. گەر لێم بپرسن: "لە کوێ دەی بینیت؟"، وەڵامیان دەدەمەوە: من نەك تەنها لە جیهانە سووڕاوەکان و ئەستێرەی تیشکدەردا دەی بینم، بەڵکو هەروەها لە ناخی خۆمدا؛ من لەو مەڕەدا دەیبینم، کە دەلەوەڕێ، لەو مەلەدا، کە دەفڕێ، لەو بەردەدا، کە بەردەبێتەوە، لەو کاغەزەدا، کە با دەیفڕێنێ.

بۆیە بڕوا دەهێنم، کە ویستێکی مەزن و دانا دەسەڵاتداریی گەردوون دەکات. من ئەم سروشتە، کە دەیەوێ و دەتوانێ، ئەم شتە لە-خۆدا-چاکە، کە گەردوون دەبزوێنێ و شتەکان ڕێك دەخات، ناو دەنێم خوا، هەروەها مۆرکەکانی هۆشمەندی و هێز و ویستی بۆ تەرخان دەکەم، پاشان تێگەیشتی چاکە، کە بەرەنجامی زەروورییی ئەو مۆرکانەیە. بەڵام هەر ئەوەندەی بمەوێ بزانم خوا لە

کوێیە، خوا چییە و جەوهەری لە چی پێکدێ، یەکسەر لێم دوور دەکەوێتەوە و هۆشی شڵەژاوم ناتوانێ دەربارەی هیچ بهزرێ.

دوای دیاریکردنی مۆرکەکانی خوایەتی بۆ لای خۆم دەگەڕێمەوە و دەمەوێ بزانم، چ جێگەیەك لەنێو ڕێکخراوی شتەکاندا وەردەگرم. من بەبێ گومان لەنێو هەموو جۆرەکاندا بەرزترین جێگەم هەیە. کەواتە ڕاستە، کە مرۆڤ پاشای سەرزەمینە. من دەتوانم لە گەردوون بڕوانم، چاکەم خۆش بوێ و پێی هەستم؛ من، کە بەرگری لە هیچ سیستەمێك ناکەم و مرۆڤێکی ڕاستگۆ و ساکارم؛ من، کە جگە لە خوا هیچی باشتر لە هاوجۆرەکەم نابینم و گەر لەنێو جۆرەکاندا بڕیارێکی ئازاد بدەم، هیچی چاکتر جگە لەوەی کە مرۆڤ بم هەڵنابژێرم. ئەم پایەگایە سەرەنجامی هەڵبژاردنەکەی من نییە، بەڵکو لە ناخمدا هەستێکی سوپاسمەندم بەرانبەر کردگارم یان ستایشی خوایەکی چاکم هەیە.

ئێستا دەمەوێ جێگەی خۆم وەك تاك لەنێو هاوجۆرەکەمدا بناسم و بۆ ئەم مەبەستە لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەڕوانم. بەڵام چی دەبینم؟ ئەم پەرش و بڵاوییە چییە؟ کوا ئەو ڕێکخراوەی پێشتر پێرسەپتم کرد؟ وێنەی سروشت هاوسەنگی و هارمۆنیی نیشان دام، کەچی وێنەی مرۆڤایەتی هیچی دی نییە جگە لە شێواوی. ئاژەڵ بەختیارە، بەڵام پاشاکەی بۆگەنی کردووە! ئەی دانایی، کوان یاساکانت؟ ئەی کردگار، کوا سەروەریت؟ من لەسەر زەمین تەنها خراپە دەبینم!

لێهزرینم سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ گەیاندمی بە دۆزینەوەی دوو بنەمای جیاواز. یەکێکیان مرۆڤی هەڵزنان بۆ توێژینەوەی ڕاستییە ئەزەلییەکان، بۆ خۆشویستنی دادپەروەری و مۆراڵی چاك، بردی بۆ کایەکانی جیهانی زەین، ڕووەو ئەو جیهانەی کە ڕوانین لێی مەزنیی ئەو دانایە پێکدەهێنێ، بەڵام بنەماکەی دی دای زنان بۆ نێو خۆی، خستییە ژێر ڕکێفی زێنز و سۆزەکانییەوە



و بە ڕێی ئەمانەوە هەموو ئەو سنوورانەی بڕی، کە بەڕێی هەستگیریی بنەمای یەکەمەوە پێیان گەیشتبوو. بەهۆی ئەم دوو ئاڕاستەیەوە ئازار دەچێژم و بەخۆم دەڵێم: نەخێر، مرۆڤ یەك نییە! من دەمەوێ و نامەوێ، هەست بە کۆیلەتی دەکەم و هاوکات بە ئازادی؛ من چاکە دەناسم و خۆشم دەوێ، کەچی خراپە دەکەم؛ من چالاکم، کاتێك دەنگی ئەقڵ دەبیستم، بەڵام بێلایەنم، کاتێك سۆزەکانم دەم هەژێنن.

کرداری مرۆڤ لە ڕاستیدا بەهۆی ئازادییەکەیەوە لە دەرەوەی سیستەمی ڕێکخراوی خوادایە. خوا دوورە لە مرۆڤ. بێگومان کرداری خراپی مرۆڤی ناوێ، بەڵام ڕێی لێ ناگرێ نەیکات. خوا مرۆڤی ئازاد دروست کردووە، نەك بۆ ئەوەی خراپە، بەڵکو بۆ ئەوەی چاکە هەڵببژێرێ. تەنانەت کاتێك مرۆڤ چاکە بۆ خاتری چاکە دەکات، تەنها لە پێناوی بەختیاریی خۆیدایە، چونکە هیچ شتێك وەك کرداری ئاکاریی شادییەکی ئاوها باڵا بە خۆ نابەخشێ، لە ڕاستیشدا هەموو مرۆڤێکی خراپ نابەختیارە. پاداشتی کرداری ئاکاریی بریتییە لە خۆرەزامەندی، کە باڵاترین بەختیارییە. ئێمە لەسەر زەمین دەژین، هەتا شایانی ئەم پیرۆزییە بین و پێی بگەین.

ئەی مرۆڤ! لەم لا و لا بە دووی سەرچاوەی بەڵاکانتدا مەگەڕێ! تۆ خۆت سەرچاوەیانیت. لەنێو پلانی گەردووندا بەڵا نییە. بەڵا لەنێو ناڕێکخراویی ژیاندایە. من لە سیستەمی گەردووندا ڕێکخراوێك دەبینم، کە هەرگیز خۆی حەشار نادات. بەڵا بریتییە لە هەستی ئەو مرۆڤە، کە لە ئازاردا دەژی، ئەمەش هەستێکی دروستکراوە و سروشتی نییە.

گەر لە هەموو شوێنێك هەموو شتێك چاك بێ، ئەوا دادپەروەری نابێ. چاکبوون بریتییە لە سەرەنجامێکی زەروریی خۆخۆشویستن، کە لەنێو هەموو سروشتێکی هەستکەردا هەیە. خۆشەویستی بۆ ڕێکخستن، کە ڕێکخستن

دەهێنێتە گۆڕێ، بە واتای چاکە، هەروەها خۆشەویستی بۆ ڕێکخستن، کە ڕێکخستن ڕادەگرێ، بە واتای دادپەروەری.

من هەرگیز نالێم چاکەکان پاداشت دەدرێنەوە. دەبێ مرۆڤێکی چاك چاوەڕوانی چ پاداشتێك بکات جگە لە لێرەبوونی ئێرەی بەپێی سروشتی؟ من دەڵێم ئەو بەختیار دەبێ، چونکە سەرچاوەی دادپەروەری هەستی پێ بەخشیوە و بۆ ئەوەی دروست نەکردووە هەتا لە نەگبەتیدا بژی. من ئەو پرسیارەش ناکەم، کە ئاخۆ سزای خراپەکان هەتا ئەزەل بەردەوام بێ. من چ پەیوەندییەکم بە مسیبەتی خراپەکانەوە هەیە؟ گەر بالاترین دادپەروەری سزایان بدات، ئەوا لەسەر زەمین دەی کات. ئیتر بۆچی لە ژیانێکی دیکەدا بۆ دۆزەخ بگەڕێم؟ دۆزەخ لێرەیە لەنێو دڵی خراپەکاندا.

من بەم شێوەیە لە خوا دەڕوانم. خوایەك هەیە، ئەمەش بۆ من بەسە. چەند کەم لێی تێبگەم، ئەوەندە پتر لێی دەپاڕێمەوە. خۆم لە بەردەمیدا ڕسوا دەکەم و پێی دەڵێم: سروشتی ئەزەلی! من هەم لەبەر ئەوەی تۆ هەیت! زیکری بەردەوامم بۆ تۆ واتای هەڵزنانمە بۆ سەرچاوەی خۆم! هەستکردن بە مەزنیت، سەرسامبوونی هۆشم و دەرکی لاوازیم دەهێنێتە ئاراوە!

بەلام ئێستا لێدەهزرێم، کە چ دەستوورێك بکەم بە ڕێنوما، هەتا بە تایبەتبوونی سەر زەمینم شاد ببم. سەرلەنوێ لە نێو دڵمدا بۆ بنەماکانی ژیانم دەگەڕێم، ئەو بنەمایانەی کە سروشت بە خاوی نیشاندوونی. من تەنها پێویستیم بە ڕاوێژی خۆم هەیە.

چاکترین هۆکار ویژدانە، کە بریتییە لە دەنگی دەروون، بە پێچەوانەی سۆزەکانم، کە دەنگی جەستەمن. کەواتە مۆرالپەروەری لە ناخی مرۆڤدایە. مرۆڤ وەکو دی بە کرداری مەزن، یان بە خۆبەخشینی پڕسۆز بە دەروونی مەزن، هۆشسام نەدەبوو. گەر کەسێك لەسەر شەقامێك کردارێکی دادناپەروەرانە ببینێ،



ڕاستەوخۆ هەڵچوون ناخی دەتەنێ و ئەمەیش بۆ بەرگری لە چەوساوەکە پاڵی پێوە دەنێ. ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ بەزەییمان بە بێبەختەکاندا دێتەوە. بەقووڵی لەنێو دەروونماندا پرنسیپی دادپەروەری و مۆرال هەیە و بە یاریدەی کرداره ئاکارییەکانی خۆمان و کەسانی دیکە دەسەنگێنین، کە ئاخۆ چاك بن یان خراپ. من ئەم پرنسیپە ناو دەنێم ویژدان.

لێرەبوون بە واتای هەستکردن. ئێمە پێش هۆشداربوونمان زێنزاوی بووین و پێش هزر هەستمان هەبوو. بوونمان هەر هۆیەکی هەبێ، هۆیەك هەیە، کە هەوڵی بۆ هێشتنەوەی مرۆڤ داوە و هەستێکی گونجاو بە سروشتی پێبەخشیوە. ئەم هەستانە توانستین و لە لای تاك بریتین لە خۆخۆشویستن، هەروەها ترسی ئازار و مردن و خواستی تەندروستی. بەلام گەر مرۆڤ لە سروشتەوە تۆوی ئامادەیی بەکۆمەلایەتیبوونی هەلگرتبێ، ئەوا ئاشکرایە کە تەنها بەهۆی توانستی دیکەوە پێی دەگات و هەموو ئەم توانستانە ڕوو دەکەنە هاوجۆرەکەی. چونکە گەر مرۆڤ تەنها گرنگیی بە پێداویستییە زێنزییەکانی خۆی بدایە، ئەوسا لەجیاتی نزیککەوتنەوە لە هاوجۆرەکەی لێی دوور دەکەوتەوە. لەم سیستەمە مۆرالییەوە، واتا لەم پەیوەندییە جووتەنییەوە کە لە نێوان خۆ و هاوجۆردا هەیە، پاڵهێزی ویژدان سەر هەڵدەدات. ناسینی چاکە واتای خۆشەویستی نابەخشێ، بریتییە لە زانین و توانستی نییە. بەلام گەر ئەقڵ دەرفەتی بە مرۆڤ دا بۆ ئەوەی چاکە بناسێ، پاشان دوای ئەمە ویژدان پاڵی پێوە دەنێ ئەو چاکەیەی خۆشی بوێ – ئەم هەستە توانستییە).

* * *

ئێمیل نەهاتۆتە جیهانەوە هەتا بەتەنیا بژی. ئێستا تەمەنی بیستساڵانە و ئەندامی کۆمەڵگایە، بۆیە دەبێ بە ئەرکەکانی خۆی هەستێ. ئێمیل تایبەتە بۆ ژیان لەتەك مرۆڤاندا و دەبێ بییان ناسێ. هەتا ئەم تەمەنە مرۆڤی بەگشتی ناسیوە، ئێستا کاتی ناسینیانە وەك کەسی تاك. ئەو کەسەی لە دەرەوەی جیهانی مەزن بە ڕەوشتەکانی دەگات، بەدرێژایی ژیانی هەڵوێستێکی شێواو و هەڵەشەی دەبێ و هەر هەوڵێك بۆ چاککردنی ڕەفتارە نائاساییەکانی بدات، ئەوەندەی تر دەبێ بە شتێکی سەیر و سەمەرە.

ئێمیل نرخێکی ئەوتۆ بۆ سەنگاندن و بوختانەکانی مرۆڤ دانانێ، بەڵام ئەو، بە پێچەوانەی شێوازە پووچەکانی ڕێزگرتنی ئەوان، خاوەنی مرۆڤپەروەرییەکی لاکەرەوەیە لە مرۆڤ. گەرچی ڕێزیان ناگرێ، بەڵام بە کەمڕێزی لێیان ناڕوانێ و بەزەیی پێیاندا دێتەوە. ئەوان لە ئاستی چاکێتیی "بۆچوون"دان و ڕەزامەندن پێی، بۆیە ئێمیل ناتوانێ هەستیان بۆ چاکەی ڕاستەقینە بێدار بکاتەوە و لەبەر ئەم هۆیە وازیان لێ دەهێنێ. کەواتە کاتێك مەراییان ناکات، ئەوا نە دانوستاندنیان لەگەڵدا دەکات و نە بەرپەرچیان دەداتەوە. بێگومان ئێمیل بۆچوونی خۆی هەموو کات دەردەبڕێ و دژی هیچ کەسێك ناوەستێتەوە، چونکە کوڕێکی ئازادیخوازە و کراوەیی بە مافی هەمووان دەزانێ.

ئێمیل کەمگۆیە و بە لایەوە گرنگ نییە خەڵکان لەگەڵی بدوێن یان نا، بۆیە تەنها دەربارەی شتی ئاقڵانە دەدوێ – دەبێ چیدی ئێمیل بۆ وتووێژ ببزوێنێ! ئێمیل کوڕێکی ڕۆشنبیرە و چەنەباز نییە. چەنەبازی یان بریتییە لە دەردی نیشاندانی هۆشزەنگینی، یان لە بڕوایەکی گەمژانەوە دێ، کە گوایە کەسانی دی نرخێکی مەزن بۆ دەربڕینەکان دادەنێن. بێگومان مرۆڤی فیزدار هەمیشە واتایەك بۆ زانینی خۆی دادەنێ و بۆ هەموو کەسێکی دەگێڕێتەوە. بەڵام مرۆڤی ڕۆشنبیر هێندە ئاسان زانینی خۆی بڵاو ناکاتەوە، چونکە ئەو



مرۆڤە زۆر دەزانێ و لەبەر ئەم هۆیە دەربڕینی درێژخایەن دەبێ. ئەمە وای لێ دەکات، کە لە مافی کەسانی دیکە بۆ ئاخافتن بەئاگا بێ. بەگشتی: ئەو کەسانەی زۆربڵێن، کەم دەزانن، ئەو کەسانەی کەمدوون، زۆر دەزانن.

ئێمیل سەرەڕای ئەمانە خۆی لەتەك هاومرۆڤەکانیدا دەگونجێنێ، بەڵام نەك لە هەستی فرەخوازییەوە بۆ ڕوانین لە کرداری کەسانی دی، یان بییەوێ ئازادییەکەی نیشان بدات، بەڵکو هەتا دەرنەکەوێ و ڕێ لە خۆدەرخستن بگرێ. گەرچی ئێمیل سەرەتا دەربارەی خوو و نەرێتی کۆمەڵگا هیچ نازانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەرمن و ترسنۆك نییە. کاتێك ئەو خۆی ناباتە پێشەوە، ئەوا ئەم هەڵوێستەی لە شەرمنییەوە نەهاتووە، بەڵکو لە ئەوێوە هاتووە، کە دەیەوێ بەچاکی بڕوانێ و هاوکات نەبینرێ. جا خەڵکان چۆن دەربارەی ئەو بهزرێن، یان تەنانەت گەر ببێ بە مایەی پێکەنین، ئەو هیچ باکی نابێ.

هیچ شتێك بە ویژدانتر نییە لە پشتبەستن بە ڕێکخراوی سروشت و ڕێکخراوی چاکی کۆمەڵگا. بەڵام بۆ ئێمیل هەردەم ڕێکخراوی سروشت گرنگترە، بۆیە ڕێزی پیرێك زیاتر لە هاوتەمەنێکی یان تەنانەت لە سەروەرێك دەگرێ. ئەو بەم شێوەیە پیاوێکی خۆشەویست دەبێ و لە هەموو شوێنێك ستایش دەکرێ، بەبێ ئەوەی هۆکەی بزانێ. هەرگیز شانازی بە ڕۆشنبیرییەکەیەوە ناکات، بەڵام ڕۆشنبیران وەك دادگەری کێشەکانیان سەیری دەکەن، ئەویش چونکە ئێمیل پێزانینێکی ڕوون و مامناوەندیی هەیە، هەروەها بڕیارەکانی ڕاستگۆ و ساغن.

دوای ئەوەی ئێمیل لەنێو کۆمەڵگادا مرۆڤی لەسەر بناغەی نەرێت ناسی، دەرفەتێکی زۆری بۆ هزرین سەبارەت بەو شتانە دەبێ، کە چێژ و شادی بە مرۆڤ دەبەخشن. ئێستا کاتی فێربوونی ئێستیتیکە.

پێویست نییە مرۆڤ خۆی هێندە بە پێناسەی چێژەوە خەریك بکات. چێژ بریتییە لە توانستێك بۆ سەنگاندنی ئەو شتانەی کە مرۆڤ حەزی لێیانە یان

حەزی لێیان نییە. مرۆڤ لە سروشتەوە چێژی هەیە، بەڵام ئاستی گۆڕانی چێژ لە لای هەمووان یەکسان نییە. هەروەها هۆی تایبەتی بۆ گۆڕانی چێژ هەیە. قەوارەی چێژ بەندە بە توانستی هەستگیرییەوە. کولتوور و شێوازی مرۆڤێك بەندن بەو نێوەندانەوە، کە ئەو تێیاندا ژیاوە. مرۆڤ دەبێ سەرەتا لە نێوەندی جیاوازی کۆمەڵایەتیدا بژی، بۆ ئەوەی بە توانای بەراورد بگات. مرۆڤ دەبێ پاشان بەتایبەتی لەو نێوەندانەدا بژی، کە نرخێکی زۆر بۆ ڕابواردن و شادی دادەنێن. چونکە لەنێو بازرگانەکاندا تەنها سوود گرنگە نەك شادی. سێیەم مرۆڤ پێویستیی بەو نێوەندانە دەبێ، کە جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان تێیاندا هێندە گەورە نین، کە ئیتر بۆچوون بە ئاشکرا دەرنەبڕێ و شادیش تەنها بۆ کەشخەیەتی بێ. لە ڕاستیدا مۆدە چێژی مرۆڤ دەپووکێنێتەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە، کە مۆدەخوازن، بەدووی شتی حەزەکانیاندا ناگەڕێن، بەڵکو بەدووی شتی دەرکەوتوودا.

من بێگومان سەرەتا چەند هەنگاوێك دەنێم، تاکو ئێمیل بە چێژێکی خاوێن بگات. لەکاتی هیلاکیی گەڕانەکانماندا گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەم و تەنها لەو شتانە دەدوێم، کە ئەو بەڕاستی حەزیان لێ دەکات. ئێستا کاتی فێربوونی ئەدەبە. من ئێمیل فێری شیکاریی ستیل و هونەری ڕەوانبێژی دەکەم، یان شێوازی هونەریی نووسین. فێرکردنی زمان بۆ خاتری زمان گرنگ نییە، بەڵام فێربوونی زمانی جیاواز دەبێ بە پاڵهێزێك بۆ فێربوونی ڕێزمانی گشتی: گەر کەسێك بییەوێ بەچاکی زمانی فەرەنسی بزانێ، دەبێ فێری لاتینی ببێ، پاشان هەردووکیان لەتەك یەکتریدا بەراورد بکات، هەتا لێرەوە فێری یاساکانی هونەری ڕەوانبێژی ببێ.

چێژ برێتییە لە هونەرێك بۆ فێربوونی وردەکاری. خەمی گۆڕاندان بە چێژگری بێسوود نییە، چونکە چێژی ژیان بەندە بە تەوەنێکی چڕی پێکهاتوو



لەو وردەکاریانە. ئێمە بەهۆی ئەمانەوە فێر دەبین، ژیان بەو سامانە بڕازێنینەوە، کە بۆ ئێمە شیاوی پێگەیشتنە. مەبەستم لە سامانی مۆرالی نییە، کە بە کارەکتەرێکی ڕاستەقینەوە بەندە، بەڵکو مەبەستم لە سامانی زێنزییە، لە ڕابواردنی پەتی.

زەمین بە سامانی لەبڕنەهاتوو پۆشراوە. من بۆ سامانی حەزەکانم دەگەڕێم و ئینجا لێدەهزرێم، ئاخۆ کامیان بسەندم. سەرەتا ڕابواردن و ئازادی دەسەندم، ئینجا گەر پێویست بوو، ئەوا تەندروستیش. بەڵام مرۆڤ کاتێك بە خاوەنی ئەم شتانە دەبێ، گەر ژیانێکی میانەڕەو بەڕێوەبەرێ. کەواتە من وەك مرۆڤێکی چێژگر میانەڕەو دەژیم. هەتا بشێ هەوڵ دەدەم لە سروشت نزیك بم و خۆم بدەمە دەست چێژی زێنزە سروشتبەخشەکانم. ڕۆژهەڵاتییەکان چاك دەزانن ڕاببوێرن، کەچی ئەوان لە خانووبەرە و ڕازاندنەوەدا ساکارن. ئەوان ژیان بە گەشتێك تێدەگەن و ماڵەکەیان وەك شوێنی نووستن دەبینن. ئەم شێوازە کار ناکاتە سەر ئێمە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خۆمان بە شێوەیەك دادەکوتین، هەروەك بمانەوێ ژیانێکی ئەزەلی بەسەر بەرین. ئایا ئەم جیهانە کۆشکێکی ڕازاوە نییە؟ ئایا گەر دەوڵەمەندەکان بییانەوێ ڕابوێرن، خاوەنی هەموو شتێك نابن؟

بۆ ئەوەی لەنێو مرۆڤاندا ئازاد بم، خۆم ساکار دەپۆشم. من بەم شێوەیە دەتوانم جێگەی خۆم لەنێو هەموو ستاندەکانی کۆمەڵدا بکەمەوە. من پێویستیم بە کۆمەڵگایە نەك بە سەرا، پێویستیم بە هاوڕێیە نەك بە بەرژەوەندچی! ئیتر من ئەو کاتە مەرایی میوانەکانم ناکەم، بەڵکو خزمەتیان دەکەم.

## ٥

ئێمیل ئێستا پیاوێکی کامڵە و پێویستیی بە هاوسەرە. ناوی ئەم هاوسەرەی سۆفییە.

ژن دەبێ بەرانبەر مێردەکەی ناسك بێ. هێزی ژن لە ئیغراکانیایەتی و بە یارمەتییان پیاو بۆ بەکارهێنانی هێزی خۆی ناچار دەکات. چاکترین شێواز بۆ بزواندنی هێزی پیاو ئەوەیە، کە ژن بەرەنگاری ببێتەوە و هەستی زەرووریێتی ئەم هێزەی لە لا بێدار بکاتەوە. ئەوسا ئیتر حەز و خۆشەویستی یەکانگیر دەبن.

مێینە و نێرینە لە هەموو ڕوویەکەوە وەکو یەکتری دروست بوون و تەنها لە ڕووی گێنیتالەوە جیاوازییان هەیە. بەڵام گێنیتالەکانیان سەرەڕای ئەمە بە شێوەیەکی ئەوتۆ دروست بوون، کە بۆ نێو یەکتری بگونجێن. ئەندامی پیاو لەکاتی سێکسکردندا ڕۆڵی چالاك و بەهێز وەردەگرێ، بەڵام ئەندامی ژن ڕۆڵی ناسك و وەرگر. لەبەر ئەم هۆیە دەبێ کەرتێکیان بییەوێ و بتوانێ، بەڵام ئەویدیکەیان کەمێك ڕووبەڕوی ببێتەوە. لێرەوە سەرەنجامێك دەکەوێتەوە، واتا ژن دروست بووە هەتا بەدڵی پیاو بێ، بەڵام پیاو بەهۆی هێزییەوە بەدڵی ژن دەبێ. ئەمە یاسای خۆشەویستی نییە، بەڵکو یاسای سروشتە و کۆن ترە لە یاسای یەکەم.

بوون هەمیشە چاکە، هیچ یاسایەکی گشتیش خراپ نییە. ڕەگەزی مێینە زۆرزانییەکی تایبەتیی هەیە و جێگەی هێزی نەبووی ئەو دەگرێتەوە. ژن بەبێ ئەم سیمایەی نەدەبوو بە هاوسەری پیاو، بەڵکو بە کۆیلەی. ژن بەهۆی ئەم لایەنە سەروەرەیەوە خۆی بە پیاو هاوتا دەکات.

تاکە ناوبانگی سۆفی و ئێمیل ئەوەیە، کە سۆفی ژنە و ئێمیل پیاوە. سۆفی کچی خێزانێکی بەڕێز و ڕێکوپێکە و خاوەنی دڵێکی ناسکە. گەرچی ڕوخسارێکی ئاسایی هەیە، بەڵام ئەو ڕوخسارەی جوانە و دەروونی ساکاری ئەو نیشان دەدات.



سۆفی حەزی لە جلی جوانە، بەڵام هێندە تاقەتی خۆڕازاندنەوەی نییە. ئەو هەمیشە ئاسایی دەنوێنێ و سەرەڕای ئەمە ئێلێگانتە، ئەویش چونکە سۆفی حەزی لە شتی دەرکەوتوو نییە، بەڵکو حەزی لەو شتانەیە کە لێی دێن.

سۆفی خاوەنی بەهرەی سروشتییە و نەی هێشتووە لەناو بچێ. بەڵام ئەو بۆی هەڵنەکەوتووە خۆی بەباشی پێبگەیەنێ، بۆیە بەتایبەتی دەنگی بۆ ئاوازی شیرین ڕاهێناوە. سۆفی بەپەرۆشەوە بە ئەرکی خۆی هەڵدەستێ و کاری نێو ماڵ بەڕێوە دەبات. هەروەها هۆشێکی سەرنجڕاکێشی هەیە، کە تەنانەت هێندە پێشکەوتوو و قووڵ نییە، بەڵام بەسە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە، کە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات، خۆشیان بوێ. هۆی ساکاریی هۆشی سۆفی لەوەدایە، کە ئەو خوێندەوار نییە و تەنها بەڕێی گفتوگۆوە لەتەك دایك و باوکیدا گۆڕانی بە هزری خۆی داوە.

سۆفی بڕوای بە ئایینێك هەیە، بەڵام ئایینێکی ئاقڵانە (ڕاسیۆنال) و ئاسان نەك دۆگم. سۆفی لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز خەریکی خواپەرستی نابێ، یان بە واتایەکی دی، لەبەر ئەوەی سۆفی وەك ڕاهێنانی ئایینی تەنها مۆرال دەناسێ، ئەوا ژیانی دەخاتە خزمەتی خوا و بە کاری چاکە هەڵدەستێ.

سۆفی ڕێزی ڕەوشت دەگرێ. خۆشەویستیی ڕەوشت بۆ ئەو بووە بە سۆز، چونکە دەزانێ هیچ شتێك لە ڕەوشت جوانتر نییە و ژنێکی بەڕەوشت یەکسانە بە فریشتە. ئەمە تاکە ڕێگەیەکی بەختیارییە. هەروەها بەختی سۆفی لەوەدایە، کە ئەو فەڕەنسی نییە و ئیتر ژنێکی سارد و فیزدار بێ و هەمیشە خۆی بە ڕابواردنەوە خەریك بکات.

من لەم نووسینەدا بڕیارم داوە هەموو شتێك ڕوون بکەمەوە و پاشان بۆ بڕیاری خوێنەری جێ بهێڵم، کە ئاخۆ ئەو چی لەم تێڕوانینانەی من وەردەگرێ. سەرەتا ویستم دەزگیرانەکەی ئێمیل لە منداڵییەوە پەروەردە بکەم و

هەردووکیان لەگەڵ یەکتریدا ڕابهێنم. بەڵام دوای لێهزرین گەیشتم بە سەرەنجامێك، کە دانانی دوو منداڵ بۆ یەکتری ناماقووڵییە و لێرەدا هەرگیز نازانرێ، ئاخۆ ئەو هەڵوێستە لەتەك ڕێکخراوی سروشتدا بگونجێ یان نا، ئەویش چونکە مرۆڤ نازانێ، کە ئاخۆ بەڕێی پەروەردەی هەردووکیانەوە پەیوەندییەکی گونجاو سەر هەڵدەدات یان پێچەوانەکەی. هەرگیز نابێ ئەوە لەیاد بکرێ، کە چ شتێك لە دۆخی سروشت و کۆمەڵایەتیدا سروشتییە. هەموو ژن و پیاوێك لە دۆخی یەکەمدا بۆ یەکتری دەگونجێن، چونکە هەردووکیان پریمیتیڤن. بەڵام هەردووکیان دەبێ لە دۆخی کۆمەڵایەتیدا بۆ لای یەکتری بهێنرێن، تاکو دەربارەی گونجان یان نەگونجانیان لەگەڵ یەکتریدا بزانن. کارەکتەری مرۆڤ بەهۆی دامەزراوی کۆمەڵایەتییەوە دەفۆرمێنرێ، کە ئیتر هەموو هۆشێك فۆرمی خۆیی و تایبەتی وەردەگرێ.

ئالەبارییەك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە ستاندی کۆمەڵایەتی لەکاتی فۆرماندنی کارەکتەردا ڕۆڵێکی گرنگ بۆ جێکردنی جیاوازی لە نێوانیاندا دەگێڕێ. دوو ڕێکخراو (ستاند) بە هیچ شێوەیەك لە یەکتری ناچن و لەبەر ئەم هۆیە سەرەنجامێك دەخەنەوە: هەتا چەند مرۆڤ جیاوازیی پایەگا کۆمەڵایەتییەکان بەگرنگ بزانێ، ئەوەندەش جیاوازیی کارەکتەر لەیاد دەکات. دەوڵەمەند و هەژار چەند زۆر بن، ژن و مێرد ئەوەندە کەم دەبن. سەردار و کۆیلە لەنێو یەك خێزاندا پێکەوە دەژین، کەچی هەر یەکەیان بەندە بە ستاندەکەی خۆیەوە.

من نەم ویست لە منداڵییەوە هاوسەرێك بۆ ئێمیل دیاری بکەم. من ویستم ئێمیل ئەو ژنە بناسێ، کە لە گەڵیدا دەگونجێ. ئەمە بڕیاری من نییە. سروشت ئاوهای بڕیارداوە. ئەرکی من دۆزینەوەی هەڵبژاردنەکەی سروشت بوو. کاتێك دەڵێم ئەرکی من، مەبەستم لە من نییە وەکو باوکێك، بەڵکو تەنها مەبەستم لە



ئەرکی منە. ئەو کوڕەکەییم لە لا جێ دەهێڵێ و ڕۆڵی باوکایەتییەکەی بۆ من چۆڵ دەکات. ئەو مافە بە من دەبەخشێ. بەڵام من باوکی ڕاستەقینەی ئێمیلم. من ئەوم پێگەیاندووە. من بە پەروەردەی ڕازی نەدەبووم ، گەر مافم نەبووایە بە بڕیاری خۆم، واتا بە بڕیاری خۆی، ژنی بۆ بهێنم. مرۆڤێك تەنها بەو شادمانییە بەختیار دەبێ، کە لەحیاتییەکە بۆ ئەو هەوڵەی داوێتی، تاکو مرۆڤێك بەو ئاستە بگەیەنێ، کە گەرەکە پێی ببێ.

# پەراوێزەکان

## سەرەتا

١) Cassirer, Ernst u.a.: Drei Vorschläge, Rousseau zu lesen. Fischer, Frankfurt a.M. 1989. S. 7
٢) Glaeser, Kurt, in: Holmsten, Georg: Jean-Jacques Rousseau, Rowohlt, Reinbeck 1985, S. 7
٣) Spaemann, Robert: Rousseau, Bürger ohne Vaterland, München 1980, S. 9
٤) Holmsten, Georg. a.a.O., S.9
٥) Cassirer, Ernst, a.a.O., S. 10
٦) Holmsten, Georg, a.a.O., S. 11

## بەشی یەکەم: ژیان و بەرهەم

٧) Rousseau, J.-J.: Die Bekenntnisse, Träumereien eines einsamen Spaziergängers, München 1978, S. 11
٨) Rousseau, J.-J., Schriften, Hrsg. Henning Ritter, 1. Band, S. 674
٩) Manfred, Albert: Drei Portraits aus der Epoche der Großen Französischen Revolution. Köln 1987. S.41
١٠) Rousseau, J.-J.: Die Bekenntnisse, a.a.O., S. 38
١١) Röhrs, Hermann: Rousseau, Visionen und Wirklichkeit, Heidelberg 1966, S.44
١٢) Rousseau, J.-J.: Die Bekenntnisse, a.a.O., S.196
١٣) Ebenda, S. 224
١٤) Manfred, Albert, a.a.O., S.57
١٥) Ebenda, S.69
١٦) Holmsten, Georg, a.a.O., S.64
١٧) Ebenda, S. 64



١٨) Starobinski, Jeau: Rousseau, eine Welt von Widerständen, München 1988, S.12
١٩) Ebenda, S. 11
٢٠) Ebenda, S.13
٢١) Ebenda, S.14
٢٢) Ebenda, S.59
٢٣) Ebenda, S. 61
٢٤) Wokler, Robert: Rousseau, Freiburg im Breisgau 1999, S.34
٢٥) Holmsten, Georg, a.a.O., S.69
٢٦) Ebenda, S. 70
٢٧) Ebenda, S.72
٢٨) Ebenda, S.75
٢٩) Ebenda, S.75
٣٠) Ebenda, S.76
٣١) Ebenda, S.76
٣٢) Ebenda, S.90
٣٣) بڕوانە:
Cassirer, Ernst, a.a.O., S.11
٣٤) Groethysen, Bernhard: Philosophie der Französischen Revolution, Frankfurt a.M. 1989, S.86
٣٥)Rousseau, J.-J.: Julie oder Die Neue Heloise, München 1978, S.76ff.
٣٦) Holmsten, Georg, a.a.O., S.100
٣٧) Ebenda, S.118
٣٨) Ebenda, S.132
٣٩) Ebenda, S.142
٤٠) Rousseau, J.-J.: Die Bekenntnisse, a.a.O., S.9
٤١) Starobinski, Jean, a.a.O., S.269
٤٢) Ebenda, S.274
٤٣) Ebenda, S.280
٤٤) Ebenda, S.269
٤٥) Holmsten, Georg, a.a.O., S.149
٥٠) Rousseau, Schriften, Hrsg. Hinning Ritter, a.a.O., S.639
٥١) Ebenda, S. 718

## بەشی دووەم: ئەنترۆپۆلۆژی

[١] Salomon-Bayet, Claire: J.-J. Rousseau, in: Geschichte der Philosophie, Bd.4, Hrsg.:Francois Chatelet, Frankfurt a.M. 1973, S. 171

[٢] Müller, Friedrich: Entfremdung. Zur anthropologischen Begründung der Staatstheorie bei Rousseau, Hegel, Marx, Berlin 1970. S.25

[٣] Salomon-Bayet, Claire, a.a.O., S.173

[٤] Vossler, Otto: Rousseaus Freiheitslehre, Göttingen 1963, S.71

[٥] Müller, Friedrich, a.a.O., S.26

[٦] Fetscher, Iring: Rousseaus politische Philosophie, Frankfurt a.M. 1980, S.37

[٧] Ebenda, S.34

[٨] Starobinski, Jean, a.a.O., S.36

[٩] Fetscher, Iring, a.a.O., S. 29

[١٠] Starobinski, Jean, a.a.O., S.36

[١١] Ebenda, S.37

[١٢] Fetscher, Iring, a.a.O., S.79

[١٣] Ebenda, S.80. Siehe auch: Rousseau, Schriften, Bd.1, S. 509

[١٤] Fetscher, Iring, a.a.O., S. 83

[١٥] Müller, Friedrich, a.a.O., S.32

## بەشی سێیەم: کۆماری ڕوسۆ

[١] Salomon-Bayet, Claire, a.a.O., S.159

[٢] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, S.59

[٣] Fetscher, Iring, a.a.O., S.103

[٤] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd. 1, a.a.O., S.73

[٥] Ebenda, S.74

[٦] Ebenda, S.75

[٧] Vossler, Otto, a.a.O., S.245

[٨] Ebenda, S.245

[٩] Ebenda, S.224

[١٠] Fetscher, Iring, a.a.O., S.84



[١١] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O., S.88

[١٢] Ebenda, S.15

[١٣] Ebenda, S.16

[١٤] Ebenda, S.16

[١٥] Ebenda, S.27

[١٦] Fetscher, Iring, a.a.O., S.136

[١٧] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O., S.97

[١٨] Ebenda, S.98

[١٩] Fetscher, Iring, a.a.O., S.141

[٢٠] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O., S.99

[٢١] Ebenda, S.99

[٢٢] Ebenda, S.99

[٢٣] Ebenda, S.101

[٢٤] Ebenda, S.100

[٢٥] Ebenda, S.103

[٢٦] Ebenda, S.103

[٢٧] Ebenda, S.103

[٢٨] Fetscher, Iring, S.149

[٢٩] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O., S.118

[٣٠] Ebenda, S.162f.

[٣١] Ebenda, S.163

[٣٢] Ebenda, S.163

[٣٣] Ebenda, S.163

[٣٤] Ebenda, S.119

[٣٥] Ebenda, S.38

[٣٦] Ebenda, S.22

[٣٧] Ebenda, S.32

[٣٨] Ebenda, S.41

[٣٩] Ebenda, S.105

[٤٠] Fetscher, Iring, a.a.O., S.172ff., Siehe auch: Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O., S.104ff.

[٤١] Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd.1, a.a.O, S. 200

[٤٢] Ebenda, S. 206

[٤٣] Ebenda, S. 206

[٤٤] Ebenda, S. 207

(٤٥) Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd. 1, a.a.O., S. 78
(٤٦) Müller, Friedrich, a.a.O., S. 32
(٤٧) Vossler, Otto, a.a.O., S. 219
(٤٨) Ebenda, S. 222
(٤٩) Fetscher, Iring, a.a.O., S. 96
(٥٠) Rousseau, J.-J., Politische Schriften, Bd. 1, a.a.O., S. 154
(٥١) Fetscher, Iring, a.a.O., S. 142
(٥٢) Ebenda, S. 148
(٥٣) Ebenda, S. 150
(٥٤) Vossler, Otto, a.a.O., S. 275
(٥٥) Ebenda, S. 276

## بەشی چوارەم: پەروەردەی سروشتی

(١) Böhm, Winfried: Geschichte der Pädagogik, München 2004, S. 67
(٢) Ebenda, S. 67
(٣) Ebenda, S. 68
(٤) Wokler, Robert, a.a.O., S. 134
(٥) Ebenda, S. 135
(٦) Ebenda, S. 135
(٧) Ebenda, S. 135 f.
(٨) Postmann, Neil: Das Verschwinden der Kindheit, Frankfurt a.M. 1983, S. 71
(٩) Ebenda, S. 72
(١٠) Koch, Jószef: Die Entfremdung und ihre Überwindung bei Jean-Jacques Rousseau und Erich Fromm. In: J. Claßen (Ed.), Erich Fromm und die Kritische Pädagogik, Weinheim und Basel 1991., S. 8

بڕوانە:

„www.erich-fromm.de/data/pdf/koch
(١١) Ebenda, S. 8

## بەشی پێنجەم: زانیننومای کلاسیکیی مافی سروشت لە نموونەی تۆماس هۆبس و جۆن لۆکدا



(١) Hirschberger, Johannes: Geschichte der Philosophie, Bd. 2, Frankfurt a.M., S. 194. Siehe auch:
Hobbes, Thomas, Vom Bürger, III, 31; 112
(٢) Hobbes, Thomas, Vom Bürger, Cap. 1, in: Hirschberger, Johannes, a.a.O., S. 195
(٣) Hobbes, Thomas, Leviathan XXIV, 192
(٤) Ebenda, XXIV, 191f.; siehe auch Tuck, Richard: Hobbes, Freiburg im Breisgau 1999, S. 113
(٥) Siehe: Wolker, Robert: Rousseau, a.a.O., S. 60
(٦) Hobbes, Thomas, Vom Bürger, Widmung, 60. Siehe Tuck, Richard, a.a.O., S. 84

## بەشی شەشەم: ڕوسۆ و شۆڕشی فەرەنسی

(١) Lasare, Auguste: Bilder aus der Französischen Revolution, Berlin 1989
(٢) Siehe Wokler, Robert, a.a.O., S. 109

# سەرچاوەکان

### ١- بەرهەمەکانی ڕوسۆ:


Rousseau, Jean-Jacques

- Schriften 1, Frankfurt a.M., 1988
- Schriften, Hrsg. Henning Ritter, 1. Band,
- Politische Schriften, Band 1, Paderborn 1977
- Sozialphilosophische und politische Schriften, München 1981
- Der Gesellschaftsvertrag, Frankfurt a.M., 1984
- Emile oder über die Erziehung, Stuttgar 1985
- Die Bekenntnisse. Träumereien eines einsamen Spaziergängers, München 1978
- Julie oder Die neue Heloise, München 1978


### ٢- بەرهەمی لاوەکی


- Böhm, Winfried: Geschichte der Pädagogik, München 2004
- Cassirer, Ernst u.a.: Drei Vorschläge, Rousseau zu lesen. Fischer, Frankfurt a.M.
- Coreth, Emerisch: Einleitung in die Philosophie der Neizeit, Band 1, Freiburg 1972
- Coreth, Emerisch / Schondorf, Harald: Philosophie des 17. und 18. Jahrhunderts, Stuttgart 1982
- Fetscher, Iring: Rousseaus politische Philosophie, Frankfurt a.M. 1980





- Groethysen, Bernhard: Philosophie der Französischen Revolution, Frankfurt a.M
- Hobbes, Thomas:
  - Leviathan, Hrsg. Irung Fetscher, Frankfurt a.M. 1976
  - vom Menschen, Hamburg 1959
  - vom Bürger,
- Hirschberger, Johannes: Geschichte der Philosophie, Band 1, Frankfurt a.M. (bei Zweitausendeins)
- Holmsten, Georg: Jean-Jacques Rousseau, Reinbeck 1985
- Johnson, Lonnie: Thomas Hobbes, Wien 1986
- Koch, Józef: Die Entfremdung und ihre Überwindung bei Jean-Jacques Rousseau und Erich Fromm. In: J. Claßen (Ed.), Erich Fromm und die Kritische Pädagogik, Weinheim und Basel 1991
- Lock, John:
- Über die Regierung, Stuttgart 1959
- Bürgerliche Gesellschaft und Staatsgewalt, Berlin 1986
- Manfred, Albert: Drei Portaits aus der Epoche der Großen Französischen Revolution. Köln 1987
- Müller, Friedrich: Entfremdumg. Zur anthropologischen Begründung der Staatstheorie bei Rousseau, Hegel, Marx. Berlin 1079
- Rod, Wolfgang (Hrsg), Die Philosophie der Neuzeit, Band 7, München 1978
- Röhrs, Hermann: Rousseau, Visionen und Wirklichkeit, Heidelberg 1966
- Salomon-Bayet, Claire: J.-J. Rousseau, in: Geschichte der Philosophie, Bd.4, Hrsg.:Francois Chatelet, Frankfurt a.M. 1973
- Seliger, Martin: John Locke, in: Pipers Handbuch der Politischen Ideen, Hrsg. Iring Fetscher u.a., München 1980
- Spaemann, Robert: Rousseau, Bürger ohne Vaterland, München 1980
- Specht, Reiner: John Locke, München 1989
- Starobinski, Jeau: Rousseau, eine Welt von Widerständen, München 1988

- Storich, Hans-Joachim: Weltgeschichte der Philosophie, Stuttgart 1985
- Tuck, Richrad: Hobbes, Freiburg im Breisgau 1999
- Vossler, Otto: Rousseaus Freiheitslehre, Göttingen 1963
- Willms, Bernhanrd: Die Politischen Ideen von Hobbes bis Ho Chi Minh, Stuttgart 1971
- Wokler, Robert: Rousseau, Freiburg im Breisgau 1999

## فەرهەنگۆك

تێبینی: واتای زۆرینەی واژەکان پەیوەست بەم نووسینەوە دیاری کراوە، بەڵام خۆیان لە واتای دیکەشدا بەکار دەهێنرێن. بۆ وشە گریکییەکان پیتی (گ) و بۆ وشە لاتینییەکان پیتی (ل) دانراون

ئاتێئیزم : (ل) بە ئەرەبی (ئەلحاد).

ئالتار: (ل) مینبەر لە کڵێسەی کریستیدا.

ئەبستراکت: (ل) بە ئەرەبی (مجرد). ئەبستراکتاندن بە واتای (تەجریدکردن)

ئەتمۆسفێر: (گ) بارستی هەوای دەوری زەوی

ئەریستۆکراسی (گ) دەسەڵاتداریی چەند کەسێکی بەگزادەیی

ئەستوو: ماتەری

ئۆبژێکت: (ل) بابەتی دانراو لە لایەن پێزانینی بکەرەوە.

ئەکسیۆن: (لا) لە وشەی چالاکییەوە نزیکە و بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زانستە سروشتییەکان. ئەکسیۆن چالاکی جەستەیە بەگشتی، یان برێتییە لە بزووتنی جەستەیی، هەروەها هەمیشە ڕوو دەکاتە شتی دەرەکی، کە ئەمیش ڕێئەکسیۆن دەنوێنێ، بۆ نموونە دڵەخورپە. ڕێئەکسیۆن واتای دژەبزووتن یان دژەچالاکی یان بەرپەچ یان گەڕانەوە دەگەیەنێ.

ئەمپیری: ئەزموونی



ئەنسیکلۆپێدی: (گ/لا) کۆکراوەی زانستەکان. لە پەیوەندیی نێو ئەم کتێبەدا ناوی ئەو گۆڤارەیە، کە دیدەرۆ و دالۆمبێرت دایانمەزراند.

ئەنترۆپۆمۆرفیزم: (گ) پێشبینییەکی ئایینییە، بە واتای لێچواندنی شێوە و ڕەفتاری مرۆڤ بە شتی نادیار. ئەنترۆپۆمۆرفیست کەسێکە، کە ئەو جۆرە پێشبینییەی هەیە.

ئەنترۆپۆلـۆژی: (گ) لە دوو ووشەی ئەنترپۆس (مرۆڤ)و لۆگۆس (زانین) پێکهاتووە، واتای "مرۆڤزانی" دەبەخشێ.

ئەنیمالی: (ل) ئاژەڵی، ڕەمەکی. بەندە بە زێنزەکانی مرۆڤەوە. ژیانی ئەنیمالی خۆی لە ساتارکردنی پێداویستیە جیاکاندا دەنوێنێ، بۆ نموونە خواردنو نووستنو سێکسوالێتی.

ئەنسیکلۆپێدی: (گ/لا) کۆکراوەی زانستەکان. لە پیوەندیی نێو ئەم کتێبەدا ناوی ئەو گۆڤارەیە، کە دیدەرۆ و دالۆمبێرت دایان مەزراند.

ئۆنتۆلۆژی: (گ) بوونزانی.

ئۆتۆرێتی (لا) دەسەڵاتدارییەکی وەرگیراو بەرێی (سومعەیەوە)، هەروەها لێترسراوییەوە. دیکتاتۆرێك دەشێ دەسەڵاتدارێکی ڕەها بێ، بەڵام گەر ئەو دەسەڵاتدارییەی لە لایەن گەلەوە وەرنەگیرا، ئەوا ئۆتۆرێتیی نییە.

ئینتەلیگێنس: (ل) زیرەکی، خاوەنبوونی زیرەکانەی زانین و زانست.

ئیندوستری: (ل) کۆی ژمارەیەك فاربیکە، کە لە کایەیەکی تایبەتیدا بە مەکینە بەرهەم دەهێنێ.

ئیندیڤید: (ل) تاك، كە دەشێ كەسی تاكی مرۆڤ، یان تاكی ڕووەك و ئاژەڵ بێ. ئیندیڤیدوالیزم برێتییە لە فەلسەفەی یان جیهاندیدیی تاكگەرایی، كە تاك وەك یەكەم بنەما وەردەگرێ.

ئێكسپێریمێنت: (ل) (تەجروبەی) زانستی.

ئێلێگانت: (ل) پڕچێژ

بەربەر: ١- لە گریكی ئەنتیكە ناوی گەلە ناگریكەكان بوو، واتا بێگانە. ٢- مرۆڤی بەربەر یان سەردەمی بەربەری لە لای ڕوسۆ لە قۆناغێكی تایبەتیی مرۆڤایەتیدا، دوای دۆخی سروشتی سەرەتایی، هەبووە. ئەم تێگەشتەی ڕوسۆ لەتەك ئەوەی ماركسیزمدا یەك دەگرێتەوە. ٣- مرۆڤی شێتگیر، دواكەوتوو، بە زەبر، یان ڕژێمی داپڵۆسەر.

بڕیار: تێگەیشتێكی بناغەیی فەلسەفەیە. بڕیار دەربڕینێكە لەسەر شتەكانی جیهانی دەرەوەی بێژەر، كە دەشێ بەپوختی، یان كەم و زۆر، ڕاست بێ، یان هەڵە بێ.

بۆچوون: نزمترین پلەی زانینە. مرۆڤی بۆچوون ئەقڵی خۆی بەكار ناهێنێ، بەڵكو پتر لە هەستەوە بە دەربڕین هەڵدەستێ، یان تێڕوانینە ترادیسۆنییەكان دەڵێتەوە. هەروەها بۆچوون بڕوای ئایینییە، چونكە لەژێر ئاستی هزرینی ئاقڵانەدایە.

بۆتانیك: (گ) لكێكی بیۆلۆژییە، كە لە جیهانی ڕووەك دەكۆڵێتەوە.

بیبلیۆتێك: كتێبخانەی كۆكردنەوەی بابەتە چاپكراوەكان یان دەنگییەكان.

پارانۆیا: (ل) دەردی ڕاونان؛ پارانۆئید ئەو كەسەیە، كە لەژێر دەردی ڕاوناندا دەژی. پارانۆیا بۆ نموونە ئەوەیە، كە كەسێك پێكەنینی دوو كەسی دی ئاوها لێك دەداتەوە، كە گوایە ئەوان



بە ئەو پێدەكەنن. یەكێك لە تیژترین فۆرمی پارانۆیا بۆ نموونە ئەوەیە، كە مرۆڤ هەموو یەكێك وەك ڕاونەر، واتا دژبەر، تێدەگات.

پاسیڤ: (ل) ناچالاك، بێلایەن

پەرچاندن: ڕێفلەكتدانەوە، (بە ئەرەبی "انعكاس")، برێتییە لە هەڵگێڕانەوەی هۆشەكییانەی ئۆبژێكتەكان یان وێنا ناخییەكان لە لایەن مرۆڤەوە. ئەم كردارە هەمیشە دوورخستنەوەی ئۆبژێكتەكەیە لە سەرچاوەكەی.

پراكسیس: (ل) بە ئەرەبی (عملی)، بۆ نموونە سیاسەت سەر بە كایەی پراكسیسە، بەڵام فێربوونی فەلسەفە سەر بە كایەی تیۆریە.

پریمیتیڤ: (ل) (بە ئەرەبی بدائی).

پریڤیلێگ: (ل) (ئیمتیاز).

پسیكۆزان: پسیكۆ واژەیەكی گریكییە و واتای ژیانی ناخەكی دەگەیەنێ. پسیكۆزان ئەو زانایەیە، كە "بەتایبەتی" لەتەك پسیكۆی مرۆڤدا، بە ژیانی ناخی و ڕەفتارەوە، زانایانە خەریكە.

پوبەرتێ: (ل) بە ئەرەبی "المراهقە".

پۆلیتاییزم: (گ) ئایینی فرەخوایی.

پۆلیس: (گ) ١- ناوی شارەدەوڵەتەكانی گریكی ئەنتیكە بوو. ٢- لە واتایەكی فراوانتردا، لە ڕوانگەی گریكییەوە، مرۆڤیش دەگرێتەوە، چونكە ئەو خۆیشی پۆلیس بوو.

پلێبیە: (ل) پلێبیە لە ڕۆمی ئەنتیكە ئەندامی گەلی سادە بوو.

پێرسەپتكردن: (یان بە خودی لاتینی: پێرسەپسیۆن، بە ئەرەبی: دەرككردن)، واتا تۆماری زێنزی. لەم ڕوودانەدا ئۆرگانێكی زێنزی وێنەی

ئۆبژێکتێك بە مەودای هۆش دەگەیەنێ و تێیدا جێگەیەك یان پایەگایەك وەردەگرێ، کە پاشان زەین دەتوانێ کاری تێدا بکات.

پێش-بڕیار: ئەم تێگەیشتە هەموو شێوازێکی دەربڕینی مرۆڤ لەسەر شتەکانی دەرەوەی دەگرێتەوە، کە هیچ دەربارەیان "نازانێ". لێرەدا مرۆڤ ئەقڵی بەکارناهێنێ، واتا بکەوێتە خەریکبوونی هۆشی لەتەك ئۆبژێکتەکەیدا و هەوڵ بدات کەم یان زۆر لێی تێبگات، پاشان بڕیاری بەسەردا بدات.

ترادیسیۆن: (ل) (بە ئەرەبی "تقلید")، ئەوەیە کە لە ڕابووردووەوە گەیەنراوە و سەروەری هەیە. ترادیسیۆنی ئەو کەسەیە، کە هەوڵ بۆ پاراستنی یان چەسپاندنەوەی ئەو ترادیسیۆنە دەدات.

توانست: بە لاتینی "پۆتێنس"، بە ئەرەبی "القدرە"، دراوێکی سروشتیە لە مرۆڤدا، بۆ نموونە ڕەمەکە جیاکانی.

تۆتال: (ل) بە ئەرەبی "کللی".

تیرانی: (گ) دەسەڵاتداریی تاکڕەوی بەزەبر.

تیۆکراتی: (گ) دەسەڵاتدارییەك، کە لەسەر بناغەی ئایین دامەزرابێ (بۆ نمونە "کۆماری ئیسلامی ئێران".

تیۆلۆژی: (گ) خوازانی، کە لە هەبوون و مۆرکەکانی خوا دەکۆڵێتەوە.

تێگەیشت: "چەمك"، کە لە چمکی کراسی ژنانەوە وەرگیراوە، نەك هیچ واتایەکی نییە و یەکجار بەربەڕیانەیە، بەڵکو هەڵەبەرە، بەڵام خوێنەر یان هزرڤان خۆی ڕاستەخۆ لە واتای تێگەیشت تێدەگات. تێگەیشت ئەبستراکتاندنی تاکەکانە بۆ گشتێتی لە لایەن زەینەوە، کە دەشێ لە وشەیەك یان چەند وشەیەکدا یەکیان بخات، یان بە پێچەوانەوە دانراوی خودی زەینە.



تێگەیشت برێتییە لە بنەمایەکی سەرەکی هزرینی ئاقڵانە، واتا گەر هزر زانستی بێ، ئەوسا دەبێ لە کاتی هەڵگێرانەوەی تێگەیشت و وشەدا گونجاویان دەربکەوێ.

تێماتیزەکردن: کێشەیەك وەك بابەت دابنرێ و بخرێتە ژێر دانوستاندن یان لێکۆڵینەوە.

خۆژیاننامە: (ئۆتۆبیۆگرافی) ژیاننامەیەك کە خاوەنەکەی دەربارەی خۆی بینووسێ.

دات: کاتی مێژوویی، بەکوردی "بەروار".

داییزم (ل) ڕێبازێکی فەلسەفیە، کە خوا وەك کردگاری جیهان، بە تایبەتی ئەقڵ، وەردەگرێ، بەڵام هاوکات ئەم خوایە لە دەرەوەی جیهان و ڕووداوەکانی دادەنێ، بەبێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەك بنوێنێ یان پەیام بۆ مرۆڤایەتی بنێرێ.

دەبوون: تێگەیشتێکی کرۆکیی فەلسەفەیە، واتای (دروست) بوونێکی پرۆسەیی دەگەیەنێ، بۆ نموونە کەسێك بە شتێك دەبێ. بە ئەڵمانی: (das Werden).

دەردوێنا: وێنای نادروست یان نەخۆش کە لەنێو پسیکۆی کەسێکدا بێتە ئاراوە.

دەروێنە: ڕووی یان وێنەی دەرەوەی هەبوویەك، کە سەروێنەیە. دەروێنە هەمیشە ئاماژەیەك ڕووەو سەروێنە دەدات، هەروەها لە ئەو دەچێ بەبێ ئەوەی هاوشێوەی بێ.

دژبێژی: دەبێ لە نەسازی جیا بکرێتەوە. دژبێژی لە لۆجیکدا تێگەیشتێکی کرۆکییە. مرۆڤ بۆ نموونە تێزێکی هەیە، پاشان لە ڕەوتی داڕشتندا بە دەربڕینی دیکە هەڵ دەستێ، کە

دژبێژیی تێزەکەی خۆی دەکەن. ڕوسۆ یەکێکە لەم نووسەرانە، نموونەیەکی دی برێتییە لە سارتەر، کە لەو بڕوایەدا بوو، نووسەر پێویستە بتوانێ دژبێژیی خۆی بکات.

دوالیزم: (ل) فەلسەفەی دووانەتی یان دوو تەوەرەیی.

دێسپۆتی: (گ) دەسەڵاتدارییەکی تاکڕەوی بەزەبر.

دێکادێنس: بەدجۆربوون بەڕێی گەیینی کولتوورییەوە، کە نیشانەی داوەشانە؛ دەبێ لە بۆگەنبوونی کۆمەڵایەتی لە واتای دازناندا جیا بکرێتەوە، چونکە مەرج نییە لەگەییویدا بۆگەنی کردبێ. بۆ نموونە ئەمڕۆ کوردەکانی ئێراق بۆگەنیان کردووە، بەڵام ئەمە واتای دێکادێنس ناگەیەنێ.

ڕەوا: بە لاتینی لێگیتیم

ڕەوانبێژی: بە گریکی ڕێتۆریك

ڕوودانگە: ڕوودانگە دەشێ شوێنەواری ژیان و کردارەکانی مرۆڤ بێ، یان ئەو دەڤەرە فیزیکییە بێ کە مرۆڤ کاری تێدەکات و ئەویش کار لە مرۆڤ دەکات. بە ئەڵمانی "Wirklichkeit"

ڕۆکۆکۆ: ستیلی هونەری سەدەی هەژدەیەمە لە ئەوروپا، کە بەدوای هونەری بارۆك دا دێ. ئەم ستیلە زۆر گرنگیی بە ناسکیی هونەری دەدا.

ڕێپوبلیك: (لا) بە کوردی دەوترێ "کۆمار". ئەم وشەیە بەپێی دیاریکردنی هەژاری موکریانی (لە فەرهەنگەکەیدا) لە"خێڵ" یان "ئەشیرەت"ەوە هاتووە. چۆن ئەم وشەیە بووە بە تێگەیشتی ڕێپوبلیك، من نای زانم. بەڵام دەبێ ئەو پرسیارە بکرێ، کە هەتا چەند لەتەك ناوەڕۆکی تێگەیشتە سەرچاوەییەکەدا



دەگونجێ. وشەی نزیك لە ڕیپۆبلیك برێتییە لە "جەماوەری". ئەم کێشەیە هەموو شێوازەکانی دەسەڵات دەگرێتەوە، کە لە ڕوودانگەدا هەبوون و ناویان لێ نراوە.

زێنز: (ل) هەست، "بۆ نموونە شەش هەستەکە"، هەڵەیە. هەست دیاردەیەکی پسیکۆییە، بەڵام زێنز ئۆرگانییە و برێتییە لە تۆمارگریی فیزیۆلۆژیانە لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵە پێشکەوتووەکاندا.

زێنزایەتی: سەروەربوونی زێنزەکان لە نواندنی ڕەفتاردا.

زێنزاوی: سۆزمەند

ژێنی: (ل، فەڕەنسی) بلیمەت لە شێوەی داهێنەریدا.

سەبژێکت: (ل) بکەر (ی ئاگامەندی زانست)

سەبژێکتیڤی کارێکی هزری کە تەواو لە خۆیەکی بکەرییانەوە ئەنجام بدرێ.

سەنتڕیفوگال: (ل) پاڵهێزی ناوەندی، تێگەیشتێکی فیزیکە.

سپۆنتان: (ل) بە ئەرەبی "عفوی"، واتا کرداری زێنزیانەی مرۆڤ وەك مرۆڤ، کە لە خۆیەوە بەبێ کاریگەریی دەرەکی دەردەچێ.

ستاند: ستاند لە بنەڕەتدا لە "چین"ـەوە نزیکە، بەڵام چین کە لە (تەبەقەی) ئەرەبییەوە وەرگیراوە و بۆ (Classe) دادەنرێ، چەسپیوە. چین و ستاند جیاوازن لە یەك. لە کۆمەڵگا چینایەتییەکاندا دەرفەتی پەڕینەوە لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە هەیە: کرێکارێك دەشێ ببێ بە بۆرژوا، هەروەها بە پێچەوانەوە. بەڵام کۆمەڵگا ستاندییەکان "سنووقئاسا" جیا کراونەتەوە و پایەگاکان چەسپێنراون، بۆ نموونە کۆمەڵگای هیندی، یان یەزیدییەکان.

ستيل: (ل) شێوازێکی بوونیادنراو، بۆ نموونە لە ئەدەب یان هەروەها ڕەفتاری خۆییدا.

سۆڤەرێن: (ل) دەسەڵاتدار، سەروەر

سۆڤەرێنێتی: سەروەری

سفێر: (گ) تەبەقی ئاسمان.

سیتات: (ل) بە ئەرەبی (اقتباس)

سیتۆیا: (فەرەنسی) لای ڕوسۆ واتای هاووڵاتییەکی سۆسیال و ئازاد و هەڵوێستنوێن دەگەیەنێ. بەڵام بە گشتی واتای "هاووڵاتی" دەگەیەنێ.

سیتۆیایی: هاووڵاتییانە، مەدەنی

سیڤیلیزاسیۆن: (لا، فەرەنسی) سیڤیلیزاسیۆن لەلای روسۆ بەدوای سەردەمی زێڕینی سروشتدا دێ، کە بناغەکەی بۆ خاوەنداریی تایبەتی دەگەڕێتەوە و سیماکەی بریتییە لە پێشکەوتنی زانست و هونەر.

سێکسوالێتی: (ل) سەرجەم ئەو لایەنە دەرکەوتووانەی بە سێکسەوە (جنسەوە) پەیوەستن.

شتاندن: بەشتکردن ی هۆش، کە خۆیشی پرۆسەیەکی هۆشەکییە، یان بەشتکردنی مرۆڤ، واتا وشکهەڵهێنانی، لەمرۆڤێتیخستنی. بە ئەڵمانی: (Verdinglichung).

شۆڕش: لە واتای ڕێڤۆلوسیۆندا بەکارهاتووە، بە واتای هەڵگێڕانەوەی ڕیشەیی شێوازێکی ژیان یان ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی، کە دەشێ لە ژێرەوە، بۆ نموونە ڕاپەڕینی جەماوەری، یان لە سەرەوە، بۆ نموونە ئیجرای سیاسی، ئەنجام بدرێ. شۆڕش دەبی



لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی جیا بکرێتەوە، چونکە مەرج نییە لە شێوەی شۆڕشدا بۆ ئامانجی تێبکۆشێ.

ویست: تەقەلای ناخی مرۆڤە، کە هەمیشە ڕووەو ئامانجێك ئاڕاستەی دەرەوە دەکرێ. واتا ویست هەمیشە بەندە بە کۆسپی ناخی و پاشان دەرەکییەوە، بۆ نموونە کۆمەڵ یان شوێنەوار.

فاکت: (ل) دراوێك لە ڕوودانگەدا.

کانتۆن: ناوچەی ئیداری (یان هەرێم) لە سیستەمی سیاسیی سویسریدا.

کلیما: (گ،لا) (بە ئەرەبی مەناخ).

گلۆبوس: (لا) تۆپی نەخشەی زەمین.

گێنیتال: (لا) لە کوردیدا "کۆئەندامی زاووزێ"ی بۆ بەکار دەهێنرێ، کە لە ئەرەبییەوە وەرگیراوە

و واژەیەکی پاشڤەرۆ و ئایینییە. لێرەدا مرۆڤێتیی کەسی تاك دەخرێتە لاوە و تەنها وەك

فونکسیۆنێکی کۆمەڵایەتی سەیر دەکرێ، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ڕەمەك و پێداویستییە

"زیندووەکانی" بکرێ. گێنیتال لە بنەڕەتدا ئۆرگانی سێکسوالیتێ دەگرێتەوە، کە

سەرچاوەییە.

لینگویستیك: زانستی زمان

مۆنارشی (گ) دەسەڵاتداریی تاکرەو، بۆ نموونە شانشینی.

مۆرال: (لا) سیستەمی بنەما ئاکارییە پابەندەکان بە ترادیسیۆن و ئایین و فۆرمی کۆمەڵایەتییەوە.

مۆتیڤ: (لا / فەرەنسی) پاڵهێز، هۆ.

میلۆدیك: (گ/لا) زانستی میلۆدی

مێتافۆر: (گ/ل) بە ئەرەبی "مەجاز".

نەسازی: دژبەری، بە ئەرەبی "التناقض".

نوێخواز: (بە ئەرەبی "فزولی"). مرۆڤی نوێخواز کەسێکە، کە هەڵپەی شتی نوێ بکات.

نۆرم: (لا) پێوەر

نۆرماتیف: (لا) گۆڕانی نۆرمی. بۆ نموونە لە لای ڕوسۆ ئەو واتایە دەبەخشێ، دەستووری تایبەتی دادەنێ وەك بنەمای گۆڕان ڕووەو ئامانج، واتا ڕووەو ڕێپوبلیك.

فونکسیۆن: (ل) کارکردن، یان ڕاستتر بکەرێتی (ی دەزگایەك، ئامێرێك، یان کەسێك لە دامەزراوێکدا).

فۆند: (ل) پارەی (ئیحتیات)، کە وەك زەخیرە بۆ مەبەستی تایبەتی دادەنرێ.

فیگور: کردارنوێنە دیارەکان لە نووسراوێکی ئەدەبیدا

ڤێهەیە: ئەکزیستێنس، لێرەبوون

هارمۆنی (گ/لا) هاوزرنگەییەکی گونجاو لە تۆنەکاندا (دەنگەکاندا)، تەبا.

هەیەپارێز: کۆنزەرڤاتیف، واتا کەسێك، کە هەبووی ترادیسیۆنی یان بە سەردەم گەیەنراوەکان ڕادەگرێ و هەوڵ دەدات وەك خۆی بییان هێڵێتەوە.

هیپۆتێز: (گ) دەسوێژێکی زانینی زانستییە بۆ سەلماندنی شتە یاسادارەکان یان دراوێکی ڕیال، کە لە



شێوەی گەڕانەوەدا بۆ سەرچاوەی دروستبوونیان خۆی دەنوێنێ.

هیپۆتێز دەبێ لە پرۆگنۆز جیا بکرێتەوە، کە گۆڕانی ئاییندەیی ڕادەگەیەنێ، بۆ نموونە پرۆگنۆزی مارکس سەبارەت بە گەیشتنی مرۆڤایەتی بە کۆمەڵگای کۆمونیستی.

هیچاندن: نێگاسیۆن، نەهێشتن (بە ئەرەبی النفی).

# بڵاوكراوەكانی مەكتەبی بیروهۆشیاری (ی. ن. ك)

| ژ | ناوی بڵاوكراوە | ناوی نوسەر | ساڵی دەرچوون |
| --- | --- | --- | --- |
| ١. | التقرير العام الى المؤتمر الثاني للأتحاد الوطني لكردستاني (الطبعة الأولى) | مام جلال | شباط- ٢٠٠١ |
| ٢. | وتەی هەڤاڵ مام جەلال لە كۆبوونەوەی كادیراندا | | ٢٠٠٢ |
| ٣. | هەڵۆی سوور | فازیل كەریم ئەحمەد | ٢٠٠٢ |
| ٤. | لمحات من تأريخ إذاعة صوت شعب كردستان | ئامانج كاكە سور | ٢٠٠٢ |
| ٥. | ئیسلامی سیاسی | فەرید ئەسەسەرد ، عەباس خۆشناو وهی تر | ٢٠٠٢ |
| ٦. | ئایین‌و تایفە ئاییینییەكان لەكوردستان | ن: میهرداد ئیزەدی<br>و: كامەران فەهمی | ٢٠٠٢ |
| ٧. | سروشتی یاسایی بڕیاری ٦٨٨و چۆنێتیی كاراكردنی | شەماڵ عەبدوڵلا | ٢٠٠٢ |
| ٨. | سەید قوتب و تیۆریی<br>تەكفیر كردنی كۆمەڵ و دەوڵەت | فەرید ئەسەسەرد | ٢٠٠٢ |
| ٩. | سەرەتایەك بۆ تێگەیشتن لەچەمكی هاولاتیبوون | یوسف گۆران | ٢٠٠٢ |
| ١٠. | چەمكی بیرۆكەی دەوڵەت لەجوگرافیای سیاسیدا | فەرید ئەسەسەرد | ٢٠٠٢ |
| ١١. | ناسیونالیزم وكەمینەكان لەسیاسەتی نێودەوڵەتاندا | جەودەت ئیسماعیل لوتفی،<br>سیروان عارف | ٢٠٠٢ |
| ١٢. | بەراورد لەنێوان رژێمە فیدرالەكاندا | سەیوان كاكە ڕەش | ٢٠٠٢ |
| ١٣. | لەپێناوی دیموكراتیزەكردنی حوكم لەعیراقدا | مەحمود رەزا | ٢٠٠٢ |
| ١٤. | فیدرالیزم وئۆتۆنۆمی | دیلمان محەمەد | ٢٠٠٢ |
| ١٥. | شۆڕشی ئۆكتۆبەرو چارەنووسی چەند گەلێكی | محمود ڕەزا ئەمین | ٢٠٠٢ |
| | خۆرهەڵات | | |
| ١٦. | پشتیوانانی ئیسلام لەكوردستاندا | نیاز سەعید | ٢٠٠٢ |
| ١٧. | ئیسلامی سیاسیی لەزەبروزەنگەوە بۆ بەخۆداچوونەوە | ن: سەعد مەولا<br>و: جەمال غەمبار | ٢٠٠٢ |
| ١٨. | ئێزدیەكان لەمێژووی نەتەوەكەیاندا | سەربەست حسێن | ٢٠٠٢ |
| ١٩. | پوكانەوەی دەوڵەتی كەمایەتی | فەرید ئەسەسەرد | ٢٠٠٢ |
| ٢٠. | پۆلێنكردنی تاوانەكانی ئەنفال بەپێی جۆرەكانی جینۆساید | د. مارف عومەرگوڵ | ٢٠٠٢ |
| ٢١. | رێكخستن یەكێكە لەبنەما سەرەكیەكانی چالاكی حزب | محەمەد مەنگوڕی | ٢٠٠٢ |
| ٢٢. | كركوك مدينة الضاحكة بالنار والنور | عوني الداودي | ٢٠٠٢ |
| ٢٣. | الأيزيدية تأريخها وطقوسها | د. خليل جندي<br>هوشنگ بروكا | ٢٠٠٢ |
| ٢٤. | كوردوتوركمان، تێڕوانینێك بۆ میكانزمەكانی پێكەوە ژیانی ئاشتیانەی نێوانیان | یوسف گۆران | ٢٠٠٢ |
| ٢٥. | گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە ١ | | ٢٠٠٢ |
| ٢٦. | گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە ٢ | | ٢٠٠٢ |
| ٢٧. | گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە ٣ | | ٢٠٠٢ |
| ٢٨. | گۆڤاری بیروهۆشیاری ژمارە ٤ و ٥ | | ٢٠٠٢ |
| ٢٩. | جیهانی روناكبیری ژمارە ١ | | ٢٠٠٢ |
| ٣٠. | جیهانی روناكبیری ژمارە ٢ | | ٢٠٠٣ |
| ٣١. | التقرير العام الى المؤتمر الثاني للأتحاد الوطني لكردستاني(الطبعة الثانية) | مام جەلال | ٢٠٠٣ |
| ٣٢. | المناهج والنظام الداخلي للأتحاد الوطني الكردساني | | ٢٠٠٣ |
| ٣٣. | پرۆگرام‌و پێڕەوی ناوخۆی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان | | ٣٠٠٣ |
| ٣٤. | تیۆری فیدرالیزم | ن: فرانتس نیومان<br>و: كاوسێن بابەكر | ٢٠٠٣ |
| ٣٥. | نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەیی | ن: مۆنتسرات گیبرنا<br>و: كەمال رەشید شریف | ٢٠٠٣ |
| ٣٦. | چەمك وپرنسیپەكانی دیموكراسی | بەكر صدیق | ٢٠٠٣ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| .٣٧ | نــەوت و سیاســەتی نێودەولــەتان لەخۆرهــەلاتی ناوەڕاستدا | ن: دانیالٚ یەرگین<br>و: کەمال رەشید شریف | ٢٠٠٣ |
| .٣٨ | سۆسیالیستەکانی پێش مارکس | ن: د.مستەفا رەحیمی<br>و: کەمال رەشید شەریف | ٢٠٠٣ |
| .٣٩ | خوێندنەوەیــەك بــۆ مەســەلەی گــۆڕانی سیاســی لەعیراقدا | ئەنوەر حسێن | ٢٠٠٣ |
| .٤٠ | تیرۆریزمی نێودەولّەتی وەك تاوانێکی نێودەولّەتی | تۆفیق عومەرمحەمەدو هی تر | ٢٠٠٣ |
| .٤١ | ئابوری کوردستان | ن: مهیرداد ئیزدەی<br>و: کامەران فەهمی | ٢٠٠٣ |
| .٤٢ | عیراق ومەسەلەی کورد | کۆمەلّێ نوسەر | ٢٠٠٣ |
| .٤٣ | ئــاینو مەســـەلەکانی دیموکراســـیو ئینتـــەر ناسیونالیزم | فەرید ئەسەسەرد | ٢٠٠٣ |
| .٤٤ | ئاناریشزمو دەولّەت | زاهیر شکور | ٢٠٠٣ |
| .٤٥ | ئوسولّیەت: چەمك، میتۆد ، سەرچاوەو ئاسۆ | عەبدولّلا قەرەداغی | ٢٠٠٣ |
| .٤٦ | شیعەکانی عیراق | ن: د. عەبدولّلا فەهد نفیسی<br>و: عەبدولّلا قەرەداغی | ٢٠٠٣ |
| .٤٧ | دەولّەتی یاسا | سەید تایەر حەمە ئەمین | ٢٠٠٣ |
| .٤٨ | شێوەی ئاسیایی بەرهەمهێنان لەکوردستاندا | فەرید ئەسەسەرد | ٢٠٠٣ |
| .٤٩ | کورتەی مێژووی فەلسەفە | مەحمود مەلا عیززەت | ٢٠٠٣ |
| .٥٠ | ناسیونالیزمی کوردی(١٨٨٠-١٩٣٩) | هیوا عزیز سەعید | ٢٠٠٣ |
| .٥١ | نرکەی قەرەداغ | ئەکرەم حەمە ئەحمەد | ٢٠٠٣ |
| .٥٢ | شــەڕی ئــابوریو ململاتــی جیهــان ل ســەر دەریــا قەزوین | هاشم زێباری | ٢٠٠٣ |
| .٥٣ | سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك | ن: د. نوری تالّەبانی<br>و: مەریوان حوسێن چیمەنی | ٢٠٠٣ |
| .٥٤ | انتهاكات حقوق الأنسان والجرائم | د. منذر الفضل | ٢٠٠٣ |
| .٥٥ | مؤشـرات سياسـة التعريـب والـتجهير في اقلـيم كوردستان العراق | الدكتور خليل إسماعيل محمد | ٢٠٠٣ |
| .٥٦ | المسلمون يحتاجون لأجابات أفضل | توماس فريدمان | ٢٠٠٣ |
| .٥٧ | الكرد الفيليون وحزب البعث | سعد بشير أسكندر | ٢٠٠٣ |
| .٥٨ | فیدرالیزمو سیستەمەکانی یەکێتیی فیدرالی | ن: عەلی ئەلشممەری | ٢٠٠٤ |



| | | | |
|---|---|---|---|
| | | و: حەسەن یاسێن | |
| .٥٩ | ئەرکەکانی رێکخستن لەقۆناغی نوێی خەباتدا | شەمالّ عەبدولّلا | ٢٠٠٤ |
| .٦٠ | لێکۆلّینەوە لەئیسلامی سیاسی | نیاز سەعید علی | ٢٠٠٤ |
| .٦١ | تیرۆریستان لەئاوا بوونن | شەهید خەسرەو عوسمان<br>ئا: ئازاد هەینی | ٢٠٠٤ |
| .٦٢ | بیری ناسیونالیزمی تورکمان | یوسف گۆران | ٢٠٠٤ |
| .٦٣ | جەنگی ئاو | ن: جون بولوك و عادل دەروێش<br>و: شەمالّ عەبدولّلا | ٢٠٠٤ |
| .٦٤ | کورد لەجەنگی روسیا لەگەلّ ئێران وتورکیادا | ن: پ. ی. ئەڤێر یانۆڤ<br>و: د. ئەفراسیاو هەورامی | ٢٠٠٤ |
| .٦٥ | پڕنــسیبی دەســتێوەرنەدان لــە پەیماننامــەی نەتــەوە یەکگرتووەکان دا | خەلیل عبدولّلا | ٢٠٠٤ |
| .٦٦ | شۆڕشی شێخ عوبەیدولّای نەهری لەبەلّگەنامەکانی فەرەنسیدا | نەجات عەبدولّلا | ٢٠٠٤ |
| .٦٧ | ئاو لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا | ئەندەش یاگ سکوك | ٢٠٠٤ |
| .٦٨ | تراژیدیای کوردەکانی سۆڤیەت | د. ئەفراسیاو هەورامی | ٢٠٠٤ |
| .٦٩ | تەعریبو راگواستن لەبەلّگەنامەکانی بەعس دا | لەتیف فاتیح فەرەج | ٢٠٠٤ |
| .٧٠ | کۆمــاری کوردســتان- مــەهاباد ١٩٤٦ لــەرووی یاسای گشتی نێودەولّەتییەوە | نەوزاد مەجید<br>خدر سەرموردی | ٢٠٠٤ |
| .٧١ | شەهیدانی ١ی شوبات | | ٢٠٠٤ |
| .٧٢ | ڕێگــای ئاشــتیانە بــۆ چارەســەرکردنی ناکۆکیــە نێودەولّەتیەکان | شەمالّ عبدالله | ٢٠٠٤ |
| .٧٣ | کاریگەری ئاو | کاروان ئەحمەد | ٢٠٠٤ |
| .٧٤ | کورتە باسێکی پیرۆیسترۆیکاو چەند بابەتێکی تر | د. ئەرسەلان بایز | ٢٠٠٤ |
| .٧٥ | ئــەوروپا لەهــــەردوو ســـەردەمی بوژاندنـــەوەو رۆشنگەریدا | کەیوان ئازاد | ٢٠٠٤ |
| .٧٦ | الأسلام السياسي والأرهاب الدولـي | د. منذر الفضل | ٢٠٠٤ |
| .٧٧ | المجتمع المدني ومستقبل الأثنيات في العراق | الدكتور خليل إسماعيل محمد | ٢٠٠٤ |
| .٧٨ | - مندلي في التأريخ | محمد جميل بندي الروژبياني | ٢٠٠٤ |
| .٧٩ | تحديد حدود إقليم كوردستان العراق | جزا توفيق طالب | ٢٠٠٤ |
| .٨٠ | حق تقرير مصير | سعد بشير | ٢٠٠٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| .٨١ | التهجير والتعريب من وجهة النظر القانونية | د. احمد موسوي | ٢٠٠٤ |
| .٨٢ | کوردەکانی ئێران و هێرشی عوسمانی | ن: گیلان<br>و/ نەجاتی عەبدوڵلا | ٢٠٠٤ |
| .٨٣ | کاریگەری بەجیهانی بوون لەسەر سەرداریەتی دەوڵەتاندا | ئاوات شێخ جەناب<br>بەکر صدیق | ٢٠٠٤ |
| .٨٤ | پاراستنی مافی کەمینەکان | خلیل عبدالله | ٢٠٠٤ |
| .٨٥ | خوێندنەوەی بەعس بۆ فاشیزمی مێژوویی | د. البرت عیسا | ٢٠٠٤ |
| .٨٦ | حاجی قادری کۆیی | فازیل کەریم ئەحمەد | ٢٠٠٤ |
| .٨٧ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ١ | | ٢٠٠٤ |
| .٨٨ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ٢ | | ٢٠٠٤ |
| .٨٩ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ٣ | | ٢٠٠٥ |
| .٩٠ | سیستمی سیاسی چین | خلیل عبدالله | ٢٠٠٥ |
| .٩١ | پێگەو دەسەڵاتی ئەنجومەنی پارێزگاکان | خلیل عبدالله | ٢٠٠٥ |
| .٩٢ | چەمکی ئازادی سیاسی | ن: فرانتس نیومان<br>و: د. کاوسین بابکر | ٢٠٠٥ |
| .٩٣ | سیستمەکانی هەڵبژاردن و پرنسیپەکانی دەنگدان | ڤیان مەجید | ٢٠٠٥ |
| .٩٤ | سیستمی فەرمانڕەوایی لەئیسرائیل | روستم محمود کۆکۆیی | ٢٠٠٥ |
| .٩٥ | پرۆژەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە | مەجید صالح | ٢٠٠٥ |
| .٩٦ | ئەمریکاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست | عەباسی ئەحمەدی | ٢٠٠٥ |
| .٩٧ | مێژووی بیری کوردی | فازیل کەریم ئەحمەد | ٢٠٠٥ |
| .٩٨ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ٤ | | ٢٠٠٥ |
| .٩٩ | ژان ژاك رۆسۆ | کاوە جەلال | ٢٠٠٥ |
| .١٠٠ | یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ـ سەرهەڵدان و نوێبوونەوە | مەکتەبی بیروهۆشیاری | ٢٠٠٥ |
| .١٠١ | عیراقی نوێ | شەماڵ عەبدوڵلا | ٢٠٠٥ |
| .١٠٢ | کوردو عروبە | بابەکر دڕەیی | ٢٠٠٥ |
| .١٠٣ | ئایین و دەسەڵات | هاشم کەریمی | ٢٠٠٥ |
| .١٠٤ | سیستمی فیدراڵی ئەڵمان | ئا: محەمەد مێرگە سۆری | ٢٠٠٥ |
| .١٠٥ | دەربارەی دیموکراسی | ن/ رۆبەرت کابلان<br>و/ عبدالرزاق خەیلانی | ٢٠٠٥ |
| .١٠٦ | عیراق: دیموکراتیزەکردن یان هەڵوەشاندنەوە | رەفیق سابیر | ٢٠٠٥ |
| .١٠٧ | کۆمەڵو سیستەمی دیموکراسی | حەمە دۆستان | ٢٠٠٥ |



| | | | |
|---|---|---|---|
| .١٠٨ | زمانە فەرمیەکان لەدەستوری عیراقدا | تارق جامباز | ٢٠٠٥ |
| .١٠٩ | پێکدادانی شارستانیەکان | ن: سامۆیل پ. هانتینگتۆن<br>و: مامەند رۆژە | ٢٠٠٥ |
| .١١٠ | دیموکراسی دیدێکی فەلسەفی | ن: د. امام عبدالفتاح امام<br>و: حەسەن یاسین | ٢٠٠٥ |
| .١١١ | لە پەراوێزی چاکسازیدا | هەڵکەوت عەبدوڵلا | ٢٠٠٥ |
| .١١٢ | لودڤیگ فۆیەرباخ و کۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی | ن: فردریك ئەنگلس<br>و: سالار ڕەشید | ٢٠٠٥ |
| .١١٣ | فیدرالیزم و ئەزمونە جیاوازەکانی | ئا: و: ئیسماعیل حەمە ئەمین | ٢٠٠٥ |
| .١١٤ | لیبرالیزم، چەمك و مێژوو | ن: جان سالوین شاپیرۆ<br>و/ عوسمان حەسەن شاکر | ٢٠٠٥ |
| .١١٥ | عیراق لە دیکتاتۆریەوە بۆ دیموکراسی | خلیل عبدالله | ٢٠٠٥ |
| .١١٦ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە (٥ ـ ٦) | | ٢٠٠٥ |
| .١١٧ | البحث عن الأسلام السياسي | نیاز سعید | ٢٠٠٥ |
| .١١٨ | الواقع الأقتصادي ـ الأجتماعي لمحافظة السليمانية | د. كمال الخياط | ٢٠٠٥ |
| .١١٩ | الصقر الأحمر | فاضل كريم احمد | ٢٠٠٥ |
| .١٢٠ | الزعيم الوطني الكردستاني جلال الطالباني قائد وفكر وعصر (الطبعة الأولى) | د. خالد يونس خالد | ٢٠٠٥ |
| .١٢١ | مقالات الشهيد غاندى(مجيد كريم احمد) | الشهيد مجيد كريم احمد | ٢٠٠٥ |
| .١٢٢ | خانقين خلال ربع قرن | فاضل كريم احمد | ٢٠٠٥ |
| .١٢٣ | عن الدولة الحديثة والأمة والنزعة القومية في العراق العربي وكردستان | سعد بشير أسكندر | ٢٠٠٥ |
| .١٢٤ | رؤية كوردستانية لشؤون ومواقف عراقية | جرجيس كوليزاده | ٢٠٠٥ |
| .١٢٥ | التسامح الديني العراقي لمجابهة الأرهاب والعنف | جرجيس كوليزاده | ٢٠٠٥ |
| .١٢٦ | الآخر ـ الأمة ـ الأقليات الأخرى | سامى داوود | ٢٠٠٥ |
| .١٢٧ | الفيدرالية ـ دراسة في إطار مفاهيمي والنظري | د. إحسان عبدالهادي سلمان | ٢٠٠٥ |
| .١٢٨ | الدستور العراقي المرتقب ـ حقائق وآراء ومقترحات | المحامي: كريكار عبدالله | ٢٠٠٥ |
| .١٢٩ | نقد ذهنية التغيب والتزييف ـ الأعلام العربي المعاصر نموذجا | د. عبدالباسط سيدا | ٢٠٠٥ |
| .١٣٠ | التركمان في العراق (الطبعة الأولى) | د. عمر ابراهيم توفيق | ٢٠٠٥ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| .١٣١ | الزعيم الوطني الكردستاني جلال الطالباني قائد وفكر وعصر (الطبعة الثانية) | د. خالد يونس خالد | ٢٠٠٥ |
| .١٣٢ | كركوك والتطهير العرقي - من وثائق النظام البعثي | عارف قورباني | ٢٠٠٥ |
| .١٣٣ | کەلار لە لادێوە بۆ شار | جاسم محەمەد | ٢٠٠٥ |
| .١٣٤ | هەڵوێست لە بەرامبەر گەندەڵی | نیاز سەعید عەلی | ٢٠٠٥ |
| .١٣٥ | داڕشتنی دەستوری نوێ هێڵکاری | ن: ماریۆج، ر. ئاوریانی ئامبرۆس، پاول ئالیڤێرز<br>و: ئاوات محەمەد | ٢٠٠٥ |
| .١٣٦ | ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان | ئەمیر نامیق | ٢٠٠٥ |
| .١٣٧ | من بڕوام بە دیموکراسی کوردی نییە! | (فازیل کەریم)<br>مامۆستا جەعفەر | ٢٠٠٥ |
| .١٣٨ | کاری دیپلۆماسی لەنێوان تیۆرو پراکتیکدا | کوردۆ ڕەحمان | ٢٠٠٥ |
| .١٣٩ | بەکارهێنانی دەسەڵات لە جیهانی عەرەبیدا | محەمەد فاتح | ٢٠٠٥ |
| .١٤٠ | عەقڵی سەلیم | ن: توماس پین<br>و: پێشڕەو حسێن | ٢٠٠٥ |
| .١٤١ | تیرۆریزم و مافی مرۆڤ | عەدالەت عەبدوڵڵا | ٢٠٠٥ |
| .١٤٢ | ڕۆڵی کەسایەتی لەمێژوودا | ن: بلیخانوف<br>و: سەلام مارف | ٢٠٠٥ |
| .١٤٣ | کاتالۆگی بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری | | ٢٠٠٥ |
| .١٤٤ | کۆمەڵناسی شەڕ | ن: گاستۆن بوتول، د. حسین بشیریە، ئانتۆنی کدنیز<br>و: عومەر باڵەکی | ٢٠٠٦ |
| .١٤٥ | بژی گەندەڵی | ن: عەلی ڕەبیعی<br>و: ڕەفعەت مورادی | |
| .١٤٦ | مێژووی پەروەردەو فێرکردن | ن: علی اکبر میهرئارا، محمد عباس، علی فرۆرفەر<br>و: قادر وریا | ٢٠٠٦ |
| .١٤٧ | فاشیزم چییە | ن: هێنری میشێل<br>و: سمکۆ ناکام | ٢٠٠٦ |
| .١٤٨ | ئیسلام و مۆدێرنە، ئیسلام لەبەردەم ئەگەری عەلمانیەتدا | و. عوسمان حەسەن شاکر | ٢٠٠٦ |



| | | | |
|---|---|---|---|
| .١٤٩ | خوێندنەوەیەك بۆ فیکری حەسەن بەننا | عادل عەلی | ٢٠٠٦ |
| .١٥٠ | چاوپێکەوتنی ڕادیۆی نەوا لەگەڵ هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسوڵ | ئا: سەرتیپ جەوهەر | ٢٠٠٦ |
| .١٥١ | شۆڕشی پەنجە مۆرەکان | خەلیل عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| .١٥٢ | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ٧ | | ٢٠٠٦ |
| .١٥٣ | ئیسلامی سیاسی - چاپی سێیەم | شوان ئەحمەد | ٢٠٠٦ |
| .١٥٤ | فەرهەنگی قانونی | د. نوری تاڵەبانی | ٢٠٠٦ |
| .١٥٥ | کۆمەڵناسی گەنج | کارزان کاوسین | ٢٠٠٦ |
| .١٥٦ | تاڵەبانی و خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی(چاپی یەکەم) | یەتانا دیوخ نەوشا | ٢٠٠٦ |
| .١٥٧ | یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان<br>ئاسۆیەك بۆ گۆڕان و نوێبوونەوە | شەماڵ عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| .١٥٨ | چەند بابەتێکی فیکری | شوان ئەحمەد | ٢٠٠٦ |
| .١٥٩ | کۆمەڵی مەدەنیو سەرلەنوێ بیناکردنەوەی کۆمەڵگا | ن: جۆرج ف. ماکلین<br>و: شاخەوان منصور | ٢٠٠٦ |
| .١٦٠ | ئایین، فاشیزم ، مەرگ | ن: هاشم صالح<br>و: هەورامان وریا قانع | ٢٠٠٦ |
| .١٦١ | کارل فۆن کلاوزە ڤتز | ن: میکل هۆوارد<br>و: کەمال ڕەشید شەریف | ٢٠٠٦ |
| .١٦٢ | گەشەسەندنی ئابووری چین | پ. د. محەمەد ڕەئوف سەعید | ٢٠٠٦ |
| .١٦٣ | مانیفێستی مەکتەبی بیروهۆشیاری<br>بۆ مۆدێرن کردنەوەی ی. ن. ك | مامۆستا جەعفەر<br>(فازیل کەریم ئەحمەد) | ٢٠٠٦ |
| .١٦٤ | هەواڵی تەلەفزیۆنی | جوان بەهادین | ٢٠٠٦ |
| .١٦٥ | لەتەك فینۆمینە ئەدەبیەکاندا | کاوە جەلال | ٢٠٠٦ |
| .١٦٦ | هەمیشە دڵڕەق و بێدەنگین | نەجات نوری | ٢٠٠٦ |
| .١٦٧ | کۆیە، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، سیاسی، کۆمەڵایەتیە | جەمال فەتحوڵڵا تەیب | ٢٠٠٦ |
| .١٦٨ | فەیلەسوفە مەزنەکان | ن: براین ماگی<br>و/ محەمەد کەریم | ٢٠٠٦ |
| .١٦٩ | جەمهوریەتی کوردستان ـ شاکارێکی مەزن | خوێندنەوەی/ عەبدوڵڵا کەریم مەحموود | ٢٠٠٦ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧٠. | سەرمایە | ن: کارل مارکس<br>و/ سەلام عەبدوڵڵا ـ کەژاڵ ئەحمەد ـ شلێر عزیز | ٢٠٠٦ |
| ١٧١. | پرسی کورد گۆڕاوە، تورکیا هێشتا لەرابردوودایە | ن: کۆمەڵێك رۆژنامەنوس<br>و/ مامەند رۆژە | ٢٠٠٦ |
| ١٧٢. | خۆیبوون ـ هیوا | هیوا عەزیز سەعید | ٢٠٠٦ |
| ١٧٣. | حزب لەبازنەی دەستەگەریدا | شەماڵ عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| ١٧٤. | پرۆفیشینالّی لەرۆژنامەنووسی کوردیدا | مەریوان مەسعود | ٢٠٠٦ |
| ١٧٥. | گەنج ـ سیاسەت ـ مەعریفە | د. بەختیار جەبار شاوەیس | ٢٠٠٦ |
| ١٧٦. | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ـ ٨ـ | | ٢٠٠٦ |
| ١٧٧. | ناسیۆنالیزم (چاپی یەکەم) | ئەکرەمی میهرداد | ٢٠٠٦ |
| ١٧٨. | سایکۆلۆژیای جەماوەر (چاپی یەکەم) | ن: گۆستاف لۆبۆن<br>و: ئارام جەمال سابیر | ٢٠٠٦ |
| ١٧٩. | نوێبوونەوەو هەڵبژاردن | بەکر صدیق | ٢٠٠٦ |
| ١٨٠. | گۆڕان و چاکسازی | د. کاوسێن بابەکر | ٢٠٠٦ |
| ١٨١. | لەپێناوی دیموکراسیدا | د. کاوسێن بابەکر | ٢٠٠٦ |
| ١٨٢. | گۆڤاری نۆڤین ژمارە ـ ٩ ـ | | ٢٠٠٦ |
| ١٨٣. | مێژووی شۆڕشی فەرەنسا | ن: ویلو ئاریل دۆرانت<br>و: دلاوەر عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| ١٨٤. | پاکتاوکردنی رەگەزی کورد لەکوردستانی عیراقدا | فرمان عبدالرحمن | ٢٠٠٦ |
| ١٨٥. | ئاسۆی ئابووری ـ سەرچاوەکانی ئاوو کانزاکانی کوردستان | دارا عومەر | ٢٠٠٦ |
| ١٨٦. | سایکۆلۆژیای جەماوەر (چاپی دووەم) | ن: گۆستاف لۆبۆن<br>و: ئارام جەمال سابیر | ٢٠٠٦ |
| ١٨٧. | ناسیۆنالیزم (چاپی دووەم) | ئەکرەمی میهرداد | ٢٠٠٦ |
| ١٨٨. | یاسای دادگای باڵای تاوانی عیراق | خەلیل عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| ١٨٩. | تاڵەبانی لەلوتکەی دەسەڵاتی عیراق | خەلیل عەبدوڵڵا | ٢٠٠٦ |
| ١٩٠. | بنەما تیۆرییەکانی رای گشتی و راگەیاندن | مەجید صالح | ٢٠٠٦ |
| ١٩١. | پاکتاوکردنی رەگەزی کورد لەکوردستانی عیراقدا (چاپی دووەم) | فرمان عبدالرحمن | ٢٠٠٦ |
| ١٩٢. | ریفۆرم هەنگاوێ بۆ دواوە ! | ئازاد تۆفیق | ٢٠٠٦ |
| ١٩٣. | تاڵەبانی و خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی(چاپی دووەم) | یەتانا دیوخ نەوشا | ٢٠٠٦ |



| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٤. | هیگڵو سیاسەتی مۆدێرن | ن: رامین جیهانبەگلو<br>و: شۆڕش جوانرۆیی<br>چنور فەتحی | ٢٠٠٦ |
| ١٩٥. | جینۆسایدی گەلی کورد ـ لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا | د. مارف عومەر گوڵ | ٢٠٠٦ |
| ١٩٦. | كردستان أو بلاد أكراد | يوسف ملك<br>مراجعة ومقدمة: د. عزالدين مصطفى | ٢٠٠٦ |
| ١٩٧. | مفهوم النخبة | إحسان عبدالهادي نائب | ٢٠٠٦ |
| ١٩٨. | ٣٦ـ المنظمات الأقليمية والجماعات الأقتصادية في القارة الأفريقية | إحسان عبدالهادي نائب | ٢٠٠٦ |
| ١٩٩. | كوردستانية منطقة كركوك (الطبعة الأولى) | د. عمر إبراهيم توفيق | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٠. | ـ الكتابة للتلفزيون | ترجمة: غسان نعسان | ٢٠٠٦ |
| ٢٠١. | دراسات المانية معاصرة عن القضية الكردية | ترجمة: غسان نعسان | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٢. | السيادة في عالم متغير(الطبعة الأولى) | د. حكمت بشير | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٣. | بحوث . . . و . . . شذرات | د. عزالدين مصطفى رسول | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٤. | كردستانية كركوك في المصادر السريانية | د. فرست مرعي | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٥. | الزعيم الوطني الكردستاني جلال الطالباني قائد وفكر وعصر (الطبعة الثالثة) | د. خالد يونس خالد | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٦. | التركمان في العراق (الطبعة الثانية) | د. عمر ابراهيم توفيق | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٧. | الأكراد دراسة أقتصادية سياسية | د. مجيد جعفر | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٨. | السيادة في عالم المتغير (الطبعة الثانية) | د. حكمت بشير | ٢٠٠٦ |
| ٢٠٩. | كوردستانية منطقة كركوك (الطبعة الثانية) | د. عمر إبراهيم توفيق | ٢٠٠٦ |
| ٢١٠. | عیراق، سەردەمی ساغ بوونەوە | بەکر صدیق | ٢٠٠٧ |
| ٢١١. | تیرۆرو سەقامگیری سیاسیو چەند لێکۆڵینەوەیەکە تر | بەکر صدیق | ٢٠٠٧ |
| ٢١٢. | کەرکوک بۆ مێژوو دەدوێت | سەرپەرشتیار/ مامۆستا جەعفەر | ٢٠٠٧ |
| ٢١٣. | دەستورو ژن | و: کامیل محەمەد قەرەداخی | ٢٠٠٧ |